# خاڵ

گۆڤارێکی هزریی
ڕۆشنبیریی وەرزییە
ژمارە (٢٩) ئابی
٢٠٢٠


بە سپۆنسەری
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
**تۆفیق کەریم**



٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
**tofeqkarem@yahoo.com**





**سایتی گۆڤاری خاڵ:** **www.xallkurd.com**

**تیراژ:** ١٥٠٠
**نرخ:** ١٥٠٠ دینار

# لەم ژمارەیەدا

تەوەری ژمارە: [شارسازیی و کەلتوری شار]


کۆمەڵگەی کوردی لە نێوان سروشتیی بوون و مێژوویی بووندا .................. د کامەران محەمەد ٥

مەڵبەندەکانی بەڕێوەبردنی شارەزوور لە سەردەمی عوسمانیدا... ................. و. کامەران کوردەوار ٢٢

شار و شارنشینی لە سەردەمی زێڕینی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ............................................ کامل حەبیب ٣٥

شارنشینی و بەشاریبوون لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی شارەوە ............................................ د. عالیە فەرج ٤٤

پەروەردە لە شار و لە لادێ .................................................................... بوخاری عەبدوڵڵای قەسرێ ٥٥

دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا لەبارەی کەلتوور و بنەمای شارەوە ............................................ گرووپی گوڵنار ٦٣

ونبوونی (شار) لە کەلتووری کوردیدا ........................................................... د.ئاراس محەمەد صالح ٧٥

بونیادی مەقاصدی بۆ شارسازییەکی تەندروست وبەردەوام ........................ د.هاشم عومەر ئەحمەد ٨٢

ئەدگارەکانی شاربوون لە سەردەمی نەوەی دووەمی قوتابخانەی باباندا ............ د. سەلام ناوخۆش ٩٧

شار و لادێی سەردەم ............................................................................ بێستون ئەبوبەکر عەلی ١٠٢

شار لە کۆن و نوێدا ڕیشەی زمانەوانی شار (المدینة) .............................. محەمەد ڕەئوف محەمەد ١٠٨


**بابەتی گشتی**


تایبەتمەندییەکانی فیکری حاجی قادری کۆیی ........................................ عومەر ئیسماعیل ڕەحیم ١١٥

مەستیزادە مەجید بەرقی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا ........................................ د.هێمن عومەر خۆشناو ٢٦

مامۆستا مەلاعەبدوڵڵای ئەحمەدییان ........................................................................ محەمەدی ئەحمەدییان ١٣٢

بیرەوەرییەکانی مەولود باوەمراد (بەشی سێیەم) ........................................................................ ١٤٦

گەشتێک بۆ کوردستانی باشوور ........................................................................ و. ڕەوەند سەباح ئەحمەد ١٥٧

ڕەخنەی زانستی یان شکاندنی شکۆ و کەسێتی ئەکادیمی؟! ................ د.بەهادین ئەحمەد ١٦٦

ڕۆمانی شازادە و شاعیر یان باخێک لە گوڵی ژاکاو؟ ......................... سەڵاح سالار ١٨٣

شێوازی خوێندنی پیشینەی کورد کوردستانی عێراق وەک نموونە ... مەلا لەتیفی بامۆکی ١٩٠

عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی ........................... کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین) ١٩٧




# تەوەری داهاتوو

## لاوازی ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگای کوردیدا هۆکار و دەرئەنجامەکانی

گۆڤاری خاڵ بابەتی (لاوازی ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگای کوریدا، هۆکار و دەرئەنجامەکانی) دەکاتە ناونیشانی تەوەری ژمارەی داهاتووی گۆڤارەکە، لەو چوارچێوەیەشدا دەخوازێت لێکۆڵینەوە لەم بوارانەدا بکرێت:

- ڕۆشنبیر کێیە؟
- پێگە و ڕۆڵی ڕۆشنبیر لەنێو کۆمەڵگە زیندووەکاندا لە چ ئاستێکدایە؟
- ڕۆشنبیران چۆن دەتوانن کاریگەری لەسەر شەقام دروست بکەن؟
- ڕۆشنبیران چۆن دەتوانن کاریگەری لەسەر بڕیارەکانی حکومەت دروست بکەن؟
- خاڵی لاوازی ڕۆشنبیری کورد چییە؟
- بۆچی ڕۆشنبیرانی کورد لە ئاست پێگەکەیاندا نین؟
- بۆچی لێدوان و نوسینەکانیان وەک پێویست کاریگەرییان لەسەر تاکی کورد نییە؟
- بۆچی ڕۆشنبیران ناتوانن لە پرسە گرنگ و هەستیارەکاندا وەک پێویست شەقام بجولێنن؟
- هۆی چییە دەسەڵاتی کوردی وەک پێویست گرنگی بە توێژی ڕۆشنبیران و تێڕوانین و بۆچونەکانیان نادات؟
- مەیلی لایەنداریی و ئینتیمای حیزبی تا چەند زیانی بەناوبانگی ڕۆشنبیران گەیاندووە؟
- کۆمەڵگەی کوردی لە نەبوونی نوخبەیەکی ڕۆشنبیری بێلایەنی کاریگەر چ زیانێکی لێکەوتووە؟
- چۆن بتوانین نوخبەیەکی ڕۆشنبیری کاریگەر لە کۆمەڵگەدا دروست بکەین؟
- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا بەرواری (٢٠٢٠/٩/٣٠) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.




## شارسازیی و کەلتووری شار

کۆمەڵگەی کوردی گرفتی زۆری هەیە، بەشێکیان لای هەمووان ئاشکران، بەشێکی دیکەیان تەنها خەڵکە ڕۆشنبیر و وشیارەکە هەستی پێ دەکەن و ئاگادارییانن. یەکێک لەو گرفتانەش کە کۆمەڵناسان زیاتر لەسەری وەستاون، شارسازیی و کەلتووری شارە، هەر بەڕاست بەپێودانگ و پێناسەی ڕاستەقینەکەی شار ئێمەی کورد لە ڕابردوو تەنانەت ئێستاش خاوەنی شار بووین و هەین؟ ئەگەر نەمان بووە و نیمانە هۆکارەکانی چین؟ خۆ ئەگەر هەشمانە ڕۆڵیان لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا چییە؟ کەلتووری تاکی کورد کەلتوورێکی شارییە یاخود نا؟ شارەکانی ئێمە تا چەند بە پرۆسە مێژووییەکانی خۆیاندا تێپەڕیوون؟

دەمانەوێت لە ڕێگەی ئەم پرسیارانە و کۆمەڵێک پرسیاری هاوشێوەیانەوە پەنجە بخەیە سەر کەموکورتییەکانی کۆمەڵگەکەمان و پەیوەستی ئەو کەموکورتیانە بدۆزینەوە. بەو سەرگەردانییەوە کەتێی کەوتووین بزانین هۆکاری نەتوانینی خۆبەڕێوەبردنمان و هەمیشە بەسەرقافڵە سەیرکردنی گەلانی دیکە، چ پەیوەندییەکی بەم بابەتەوە هەیە؟

جارێکی دیکە و لەم ژمارەیەدا کۆمەڵێک شارەزا و نوسەر و ڕۆشنبیر بە توێژینەوە و نوسین و بابەتەکانیان و هەریەکەیان لە گۆشە نیگایەکەوە تیشکیان خستووەتە سەر ئەم بابەتە و گۆڤاری خاڵیش بەسوپاسەوە پێشکەشی خوێنەرانی دەکات.

# کۆمەڵگەی کوردی

## لە نێوان سروشتیبوون و مێژووییبووندا




**پ.ی.د کامەران محەمەد**



لەدایکبووی ١٩٧٦، سلێمانی، دکتۆرا لە فەلسەفەی مێژوو، مامۆستا لە بەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی، خاوەنی چوار کتێبی چاپکراو و ژمارەیەک توێژینەوەی بڵاوکراوەیە.

وشەی کۆمەڵگە لە وشەی لاتینی (societas) داتاشراوە، کە واتای هاوبەشێتی (الشراکة)ی دەگەیاند، وشەی لاتینی (socius) یش بە واتای هاوبەش، یا هاوڕێ یا جوت یاخود دووانە هاتووە(١). واتە بیرۆکەی کۆمەڵگە بە هزرگەلێکی وەک (کۆمەڵگەی مرۆیی)ەوە بەندە، لە پلەی یەکەمدا پەیوەستە بە هاوڕێیەتی کەسە ئازادەکانەوە (کە بەزۆری پیاوانن-ـ تا سەدەی حەڤدەهەم). ئەو پەیوەندییە واتای هاوڕێیەتی و هاوکات دژەکەشی گەیاندووە، کە دوژمنایەتییە، واتە (کۆمەڵگە) زاراوەیەکە لە بنەڕەتدا بۆ (جێکردنەوە) و (لێدەرکردن)، (هاوپەیمانێتی) و (دژایەتی) بەکارهاتووە(٢). بەڵام ئەو وێنەیەی کۆمەڵگە کە بەزۆری دووبارە دەبێتەوە، ئەو کۆبوونەوەیەیە کە لەمیانەی ڕێکەوتن یا ڕەزامەندبوون یاخود پەیمانەوە پێکدێت(٣). بەڵام کۆمەڵگە لە واتە نوێیەکەیدا ڕێکخستنێکە لە دامەزراوەکان، شێوازگەلێکی پەیوەندییەکان و شێوەگەلێکی ڕێکخراوە و...تاد. کە قەوارەیەکی گشتی پێکدەهێنێت و پەیوەندیگەلێکی ئاڵۆویرکەر لە نێوان پێکهاتەکانیدا هەیە و لە چوارچێوەکەشیدا کۆمەڵە مرۆڤێک دەژین(٤).

سەرەڕای بوونی پێوەرگەلێکی جۆراوجۆر بۆ پۆلێنکردنی کۆمەڵگەکان، ئێمە ئەو پۆلێنەمان هەڵبژاردووە کە لەسەر بنەڕەتی (پێشکەوتن) و (وەستان) لە کۆمەڵگەکان دەکۆڵێتەوە، بەپێی ئەو پێوەرەش کۆمەڵگە بۆ دوو شێوە پۆلێن دەکرێن، ئەوانیش بریتیین لە (کۆمەڵگەی سروشتی) و (کۆمەڵگەی مێژوویی).

### یەکەم: کۆمەڵگەی سروشتی یاخود سەرەتایی

کۆمەڵگە لە پێش دەستپێکردنی ژیارەکاندا لە دۆخێکی سەرەتاییدا دەبێت و (سادەییبوون) و (وەستان) لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی دەبن! ئەم جۆرە بریتییە لەو کۆمەڵگەیەی کە مەشخەڵەکەی بەشێوەیەکی هەستپێکراو دروست نەبووە، کە لە کاتی دروستبوونییەوە کەسێتییەکەی تازە بکاتەوە، واتە نموونەی کۆمەڵگایەکی وەستاو و خاوەن مەشخەڵی نەگۆڕ بەدیدێنێت، وەک کۆمەڵگەکانی مێرووله و هەنگ، یاخود کۆمەڵگەی خێڵە ئەفریقییەکان لە سەردەمی پێش کۆلۆنیالیزم و ئیمریالیزمدا، بە هەمان شێوەش کۆمەڵگەی خێڵەکی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام نموونەی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیەن(٥). جا ئەگەر لەم ڕوانگەوە بڕوانینە لایەنی مرۆیی و هزریی و تەنانەت ئەو کەرەستانەش کە بەکاری دەهێنن هەر سەرەتایین! واتە لە لایەنی (کەسەکان)ەوە لە نێو بازنەی خێڵدا قەتیس ماون و تاکەکانیشی هێشتا قۆناغی سەرەتایی و غەریزەی جێنەهێشتووە! بۆیە (مرۆڤ)ەکان لێرەدا وزەگەلێکی شاراوەی بەکارنەهاتوویان تیادا هەڵگیراوە و دەتوانرێت بقۆزرێتەوە بۆ بەدیهێنانی هەر کارێک! لەسەر ئاستی (فیکر)یش هێشتا نەیتوانیوە بازنەی داخراوی بیرکردنەوەی خێڵ تێپەڕێنێت و دەستەوەسان بووە لەوەدا کە ببێتە بەشێک لە هۆکارەکانی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە! ئەمە لەکاتێکدا دەتوانرا ببێتە هۆکارێکی بنەڕەتی تێپەڕاندن وگەشەکردن، تەنانەت گەشەکردنی (جیهانی ماددی)یش پشت بە هزرەکان دەبەستێت. ئەو کەرەستانەش کە بەکاری دەهێنن کەرەستەی سەرەتایین یاخود هاوردەی دەرەوەن! واتە لە ڕووی داهێنانەوە مرۆڤگەلێکی دەست و پێ سپین! بەلای ئەنثرۆپۆلوجیستەکانیشەوە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە بریتین لە:

١) وابەستەگی بەسروشتەوە: واتە پەیوەستبوونی کۆمەڵگە بەسروشتەوە، بە واتایەکی تر ئەم وابەستەگییە پەیوەندی هەیە بە پێشکەوتنێکی تەکنیکی کەم کە خۆی لە بەکارهێنانی وزەیەکی کەم دەنوێنێت. لە دورترین باریشدا تەنها هێزی بازووی مرۆڤ بوونی هەیە و تەکنەلۆجیاش بوونی خۆی لەگەڵ ئەوەدا گونجاندووە(٦).

٢) بونیادی سادە: ڕێژەی دابەشبوونی کار، ڕێژەیەیەکی پێوانەییە بۆ پێوانەی بونیادی ئاڵۆز. لەم کۆمەڵگانەدا پسپۆری تەواو زۆر کەمن یاخود نین. لە دوورترین باردا کۆمەڵگە تەنها لە نێوان ژن و پیاودا کار دابەش دەکات. لێرەدا بەهۆی نەبوونی پسپۆرییەوە وایکردووە کە کارەکان پێکەوە پەیوەندییان هەبێت. واتە زۆر کاری جیاواز یەکیان گرتووە، بۆ نموونە کاری داد و سیاسەت و ڕێبەری ئایینی لە یەک کەسدا خۆی دەبینێتەوە(٧).

٣) ناوەرۆکی کۆمەڵگەی بچوک: لەم کۆمەڵگایانەدا گروپە بچوکەکان کە لەسەر بنچینەی خزمایەتی یان پێکەوە ژیان دامەزراون ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینن. ئەم گروپانە تەواوی ژیانی تاک لەخۆدەگرن وەک کەلتوور، زمانیان...تاد. لێرەدا بە کۆمەڵ و پێکەوە کاردەکەن، پشوودەدەن، پەرستش دەکەن،...تاد. لەناو سنووری هەمان گروپدا بەو ڕوداوانەی لەناو گروپەکەدا ڕودەدەن، ژیان دیاری دەکرێت. ناوەرۆکی ئەو گروپە بچوکەش بە زاراوەی (کۆمەڵگای بچوک) گوزارشتی لێدەکرێت(٨).

ناوەرۆکی نووسین: واتە لەم کۆمەڵگایانەدا زۆرینەی دانیشتوان نەخوێندەوارن، لە کاتێکدا لە کۆمەڵگە مێژووییەکاندا ئەستەمە بە بێ بوونی نووسین بیربکرێتەوە. نووسین بۆ پێکەوە ژیان و کەلتوور چەندەها ئەنجامی وەک (زانیاری هەڵگرتن و...تاد) هەیە(٩).

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە زەینمانەوە، کە ئایا کۆمەڵگەی کوردی تا چەند ئادگارەکانی ئەم جۆرە لە کۆمەڵگەی تێدا دەبینرێت؟ تا چ ئاستێک توانیومانە سنوورەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە تێبپەڕێنین؟ دیارە وەڵامدانەوەی پرسیارگەلێکی لەوشێوەیە کارێکی ئاسان نیە! چونکە وەسفکردنی نەتەوەیەک بەشێوەیەکی گشتی کارێکی سانا و ئاسان نییە، بەڵکو لای لێکۆڵیاران بە ئاڵۆزترین کار دادەنرێت، لەبەرئەوەی ئەم شرۆڤەکردنە لەسەر بنەڕەتی کۆکردنەوەی زانست و زانیاری زۆر دەوەستێت، ئەم زانیارایانەش پێویستییان بە (شیکردنەوە)و (ئەبستراکت)و (گشتاندن) هەیە.

زۆر لە زانایانی سایکۆلۆجیا و ئەنثرۆپۆلۆجیا کە باس لە کەسایەتی بنەڕەتی نەتەوە دەکەن، بەمشێوەیە پێناسەی دەکەن:» کۆمەڵە سیفەتێکی هاوبەشە-بەشێوەیەکی ڕێژەیی کەوا تاکە گەورەکانی نەتەوەی پێدەناسرێ لەکاتی ئێستادا، واتە لەوکاتەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. ئەو کەسایەتییە بنەڕەتییە واتای کەسایەتی سەرجەم تاکەکان ناگەیەنێت! بەڵکو واتای ئاراستە سایکۆلۆجی و بەهاو پێوەرە بنەڕەتییەکان لە کەسێتی ئەو تاکانەدا دەگەیەنێت(١٠).

## خێڵ و کۆمەڵگە:

لێرەوە ئەگەر لە بونیادی کۆمەڵایەتی کورد ڕابمێنین، ئەوا بێ دودڵی بەو ڕاستییە ئاشنا دەبین کە بونیادی کۆمەڵایەتی باو لە کۆمەڵگەی کوردیدا بونیادی خێڵەکییە، سیستمی خێڵایەتی لە مێژوویەکی دێرینەوە باڵی بەسەر کۆمەڵگەی کوردیدا کێشاوە. بۆیە مێژووی خێڵ بەشی شێری مێژووی کوردی پێکهێناوە و خێڵایەتیش بە ناخی مێژووی کورددا ڕۆچووە! (ویگرام) کوردستان بە (وڵاتی خێڵەکان) لەقەڵەم دەدات(١١). واتە پانتاییەکە بۆ ئەوەی پێی دەوترێت (کۆمەڵگەی بچوک)! بەمشێوەیە کۆمەڵی کوردەواری تەواوی ئەو خەسڵەتانەی تێدایە کە کۆمەڵگەی بچوک پێکدەهێنن. دیارە بونیادی کۆمەڵگەی خێڵەکەیش (بونیادێکی سادە)یە! دابەشبوونی (کار) و (ڕۆڵ) لەگەڵ بچوکی و سنورداریێتی و بەرتەسکێتی ئەو جۆرە کۆمەڵانەدا گونجاوە و بەردەوامبوونی ئەم دۆخەش بونیادەکەی بەسادەیی هێشتووەتەوە و بەرەوپێشچوون و گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر بونیادەکەیدا نەهاتووە. هاوکات پێداویستی ژیان وای لەم کۆمەڵگە بچوکانە کردووە کە زۆر بە بەهێزی وابەستەبن بە سروشتەوە، تەنانەت



سیستمی خێڵایەتی لە مێژوویەکی دێرینەوە باڵی بەسەر کۆمەڵگەی کوردیدا کێشاوە. بۆیە مێژووی خێڵ بەشی شێری مێژووی کوردی پێکهێناوە و خێڵایەتیش بە ناخی مێژووی کورددا ڕۆچووە.

(سروشت و شوێن) نەخشی بەرچاوی بەسەر ئاراستەکردنی خێڵەکانی کوردستانەوە جێهێشتووە! ئەم کاریگەرێتییانەش تا ئێستا بەردەوامی هەیە!(١٢)

هەروەها بەهۆی باری سروشتی کوردستان و ژیانی سەختی زۆرینەی دانیشتوانی و پەرەسەندنی ژیانی کۆچەری لە ناویاندا لەگەڵ چەند دیاردەیەکی تری لەو بابەتە بوونە هۆی ئەوەی نووسین و خوێندن و خوێندەواری لەناو کورددا، درەنگ پەیدا ببن، ئەمە لە کاتێکدا سەرەڕای بوونی چەندەها (ناو) کوردی لە بواری نووسیندا لە دوای هاتنی ئیسلامەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کوردەکان نەخوێندەوار بوون! تەنانەت خوێندەوارەکانیش بە زمانی کوردی نەیان دەنووسی، واتە بە زمانی گەلی زاڵ(١٣). هەرچەندە کوردەکان هەموویان خێڵەکی نین، لە گەلەک جێ ئەوانەی سەر بە هیچ خێڵێک نین، زۆرینەی دانیشتوان پێکدەهێنن. بەڵام وەک (مارتین فان برونەسن) دەڵێت:» نا خێڵەکییەکان نێزیکە لە گشت سەردەمێکدا، (لایەنی کەم تا ئەم سەروەختە) لە ڕووی سیاسیی و ئابوورییەوە پەیوەستە و پێبەندی کوردە خێڵەکییەکان بوون، واتە دیاردەی فیۆدالیزم بەسەر شیرازەی خێڵدا زاڵە»(١٤).

لێرەدا گرنگە ئەو وتەیەی (ویگرام) بیر خۆمان بهێنینەوە و کە دەڵێت:» سروشتی کوردەکان لە هەزار ساڵ پێش لە دایکبوونی مەسیحەوە تا ساڵی ١٩٠٠ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. ئەوان (واتە کوردەکان) گەلێکی بەهێز و بەهرەدارن، مامەڵەی جوان دەکەن، تەنانەت هەندێ لە کارمەندە ئینگلیزەکان توانیان هاورێیەتیان بەدەست بێنن، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی سروشتە چیاییە بنەڕەتییەکەیانەوە یاخود هۆکارێک کە دەگەڕێتەوە بۆ گەشەسەندنی سەرەتاییان ناتەواوییەکیان هەیە، ئەوان نەیانتوانیوە خۆیان لە ناوەند و بیرکردنەوەی خێڵەکی ڕزگار بکەن(١٥).

هەروەها کوردناسێکی گەورەی وەک (نیکیتین) دەربارەی سەرەتایتی خێڵە کوردییەکان دەڵێت:» لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا ناتوانین وێنەیەکی ڕاستی خێڵە دێرینەکان بەدەست بخەین، تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمڕۆ لەو خێڵانەدا دەیبینین کە لە وڵاتانی عەرەبی و وڵاتی نێوان دوو ڕووبار و کوردستاندا بەدیدەکەین». هەروەک خێڵە کوردییەکان هێندە بە سەرەتایی دادەنێت و دەیانگێڕێتەوە بۆ سەردەمی تەورات و لەمبارەیەوە دەڵێت:» ئەگەر چووینە نێو نشینگەکانیان و لە دەوارەکانیان وردبووینەوە و لە سەرکردەکانیان نزیک بووینەوە، ئەوا لە هەموو هەنگاوێکدا کە دەینێین و لە هەموو شتێکدا کە دەیبینین زیندوکردنەوەیەکی ماوەی تەوراتییە، دەتوانین لەو پیاوە ڕیش سپییەدا کە سەرنجی ورد دەدات و لەژێر دەوارەکەیدا دانیشتووە و کوڕەکانی دەوریانداوە، وێنەی (ئیبراهیم) و (یەعقوب) یاخود باوکە دێرینەکانی تێدا دەبینین. ئەو چوار یاخود پێنج ئافرەتەی کە لە گۆشەیەکی دەوارەکەدا دانیشتوون یاخود بە پێوەن، وێنەیەکی زیندوی (ریبیکا) و (سارە) و (راشیل) دەنوێنن، کاتێک کە لە جوانترین قۆناغی ژیانیاندا خۆیان دەردەخست(١٦).

جا ئەگەر بزووتنەوەی مرۆڤ هۆکارێک بێت بۆ بزووتنەوەی (کۆمەڵگە) و (مێژوو)، بە



هێشتا (هزر و ویست و مێژووی داهاتوو) لای کورد لەو ئاستەدا نییە کە لانی کەم هەندێك لە خەسڵەت و مەشخەڵەکانی (کۆمەڵگەی سەرەتایی) تێبپەڕێنێت و بچێتە نێو (کۆمەڵگەی مێژوویی)ەوە!.

پێچەوانەشەوە (وەستان)ی مرۆڤ وەستانی (کۆمەڵگە) و (مێژوو)ی لێبکەوێتەوە! ئەوە جێگەی خۆیەتی کە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین کە ئایا بزووتنەوەی مرۆڤ (تاک)ی کوردی لە چ ئاستێکدا بووە و تا چەند توانیویەتی بزوتنەوەی (کۆمەڵگە) و (مێژوو) بەرەو پێشەوە بەرێت؟

لەبەرئەوەی کەسایەتی مرۆڤ بەرهەمی کارلێکردنی نێوان سروشتی مرۆڤ و ژینگەی کۆمەڵایەتییە، سروشتی مرۆڤیش ڕەگەزێکی تاڕادەیەک نەگۆڕە، بەڵام ژینگەی کۆمەڵایەتی هەمیشە ڕەگەزێکی گۆڕاو و گەشەکردوو بووە(١٧). ژینگەی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی کوردیشدا لە ئاستێکی نزمی گەشەکردندا بووە و بەشێوەیەکی نیمچە وەستاویی ماوەتەوە، بەشێوەیەک ڕێگای نەداوە بە تاکی کوردی بەهرە و توانا سروشتییەکانی بخاتە گەڕ و سوودیان لێ ببینێت. بۆیە کەسایەتی تاک لەناو خێڵدا لە ئاستێکدا ماوەتەوە و گەشەیەکی وای نەکردووە، واتا توانای بەهرەکانی تاک بەهەدەر چوون و لە خزمەتی تایبەتی خێڵدا بوون. جا سیستمە ڕامیاریی و ئابوورییەکان و پەیوەندییەکانی نێوان خەڵک بەبێ گەشەکردن ماونەتەوە.

ئەم پەیوەست بوون و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانە، کەوا بەرژەوەندی تاک و کۆمەڵ لەناو خێڵدا دابین دەکات! بەسەر هەستی تاکەکاندا زاڵ بووە. تاکی خێڵەکی زۆر پشت بە ئازایەتی و هێزی تایبەتی خۆی بەستووە، بەڵام هەندێجار دەبینی ئەوە بە تەنها بەس نەبووە، چونکە کاتێک ڕووبەڕووی هەندێ مەترسی بووەتەوە، بە تەنها نەیتوانیوە لێی دەرباز بێت، خێڵی بەهێز زۆرجار پارێزگاری ڕۆڵەکانی دەکات، بۆ هەرشوێنێک بچن و، هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوە لە هەر کەسێک دەکات کە بیەوێت دەستیان بۆ درێژ بکات. ئەگەر یەکێکیان بەدەستی یەکێک لە خێڵێکی تر بکوژرێت، هەموو خێڵەکە هەڵدەکوتنە سەریان و داوای خوێنەکەی دەکەن، ئەگەر نەتوانن بکوژەکە بکوژنەوە، ئەوا لەبری ئەو هەرکەسێک بێت دەیکوژنەوە، شایەنی باسە ئەوەندەی تاک چاوەڕوانی پارێزگارییە لە خێڵەکەی، هێندەش خێڵەکەی چاوەڕوانی قوربانی و فیداکاریی و گوێڕایەڵی ئەوە. هەورەک چۆن خێڵەکە بەخێرایی پارێزگاری لێ دەکات و تۆڵەی دەسێنێت، هەروا تاکیش بەپەلە بە هانایەوە دەچێت و لە تەنگانەدا قوربانی لەپێناودا دەدات. بەکورتی بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە، ئەم بە خێڵ پشت ئەستوورە و، خێڵیش بەوەوە پشت ئەستوور دەبێت.

بەهەمان شێوە تاک لەناو خێڵی کوردیدا هەستی وەک ئەندامێک لە خێڵەکەیدا لە پێش هەموو هەستێکی ترە، تاک پابەند بووە بە ئیلتزاماتەکانی لەگەڵ خێڵەکەیدا، بەهێزتر لە هەموو پابەندبوونێکی تر، لەبەرئەوەی خێڵی کوردی خۆی بە «خاوەن»و «زاڵ» دادەنێت بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە خێڵدا. بۆیە ئەو پارچە زەوییە جوگرافییە تەسکەی کە خێڵەکە ژیانی تیادا بەسەر دەبات بە «نیشتمانی گەورەی»ی خۆی دەزانێت. ئەوەش هۆکارێکی لاوازبوونی هەستی «نیشتمان پەروەری» بووە، لەهەمان کاتدا هەستێک بووە کە باڵی بەسەر هەستی دروستبوونی قەوارەیەکی سیاسی یەکگرتووی کوردیدا کێشاوە. نەیهێشتووە

تاکی کورد ئەو هەستەی دەربکەوێت و بخەملێت(١٨).

لەبەرئەوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی بەبێ توانایی و «مقدمات»ێک ماوەتەوە، بۆیە نەیتوانیوە یارمەتی تاکی کوردی بدات بۆ گەشەکردنی کەسایەتیی و بەرزکردنەوەی ئاکارەکانی، لەبەرئەوە «خەفە بوون و کپ بوون» بووەتە کۆتی گەردنی مرۆڤی کورد، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە زۆرجار لابدات و بەمەبەستی دەربازبوون لەو کۆتانە هەڵەی گەورە بکات! بەمەش زیان لە کۆمەڵگەی کوردی -بەشێوەیەکی گشتی- بدات. کپ بوونی تاکەکان هەر لەو چاوگەوە سەرهەڵدەدات کە تاکی خێڵەکی لەژێر سایەی خێڵدا پەروەردە دەبێت، هەورەها «بەها»و «خوو نەریت»ەکانی لەوەوە وەردەگرێت(١٩).

بەمشێوەیە تاکی کوردی پەیوەنداریتی «إنتماء»ی بۆ خێڵ دەبێت و لەگەڵیدا کۆک دەبێت، لە ئامانج و بنەما و شێوازەکانی بیرکردنەوە و ژیان تێیدا، لەبەرئەوەی دەوروبەر رێگای جوڵەی پێنادات، ئامرازەکانی پێشکەوتن‌و گەشەکردنی بۆ ئامادە ناکات و گەشەی کەسایەتییەکان سنوردار دەکات! بۆیە تاکی کوردی هەست بە کپی و مەحرومی دەکات، لە دوایشدا خێڵ رۆڵێکی بەرچاوی بینیووە لە مراندنی تواناکانی مرۆڤی کورد و پووکانەوەی عەقڵییەتی داهێنەر و دواخستنی لە بزوتنەوەی مێژوودا، بەمشێوەیە مرۆڤی کورد جگە لە خانەیەکی نێو جەستەی خێڵ، نەیتوانیوە بازنەی خێڵ تێبپەڕێنێت و دواتر دەسەوسان بووە لە جوڵاندنی (کۆمەڵگە) و (مێژوو)دا!

لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دروست دەبێت، کە ئەگەر کورد ئەوەندە سەرەتاییە و کۆمەڵگەکەی کۆمەڵگەیەکی سرووشتییە، ئایا رۆڵی مێژوویی کورد لە کوێدایە؟ ئایا کورد توانیویەتی یاخود هەوڵیداوە سنووری سەرەتایێتی خۆی تێبپەڕێنێت و لەگەڵ گەشەکردنی مێژوودا هەنگاو بنێت؟ بەواتایەکی تر ئایا کورد هەوڵیداوە سنوورەکانی (کۆمەڵگەی سەرەتایی) تێپەڕێنێت و بچێتە نێو (کۆمەڵگەی مێژوویی)ەوە؟ هاوکات ئایا (کۆمەڵگەی مێژوویی) چییە؟ تایبەتمەندییەکانی چین و چۆن دروست دەبێت؟

## دووەم: کۆمەڵگەی مێژوویی

(کۆمەڵگەی مێژوویی) ئەو کۆمەڵگەیەیە کە لە بارودۆخێکی سەرەتایی دیاریکراودا لەدایکبووە، بەڵام دواتر سیفەتە ڕیشەییەکانی، سەرەتای لەو بارە سەرەتاییەوە و بەپێی یاسای پەرەسەندن و بەرەوپیش چوون داڕشتووەتەوە. ئەم جۆرە کۆمەڵگەیەش نموونەیەکی گۆڕاو (متحرك) بەدیدەهێنێت، واتە ئەو کۆمەڵگەیەیە کە ملکەچی یاسای گۆڕانە، لە ڕیشەوە مەشخەڵەکانی خۆی دەگۆڕێت و دادەڕێژێتەوە(٢٠).

لێرەوە دەتوانین بڵێین (گۆڕان) و (گەشەکردن) لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەن، کە (کۆمەڵگەی مێژوویی) لە (کۆمەڵگەی سەرەتایی) جیادەکاتەوە! جا ئەگەر لەم ڕوانگەوە بڕوانین بۆ کۆمەڵگەی کوردی ئەوا سەرەڕای بوونی تێڕوانینێکی خراپ لە کەلتووری کوردیدا بەرانبەر بە چەمک و تەنانەت وشەی (گۆڕان)، ئەوا بەو دۆخە خامۆشییە ئاشنا دەبین کە کۆمەڵگەی کوردی بە وەستاوی هێشتووەتەوە!

بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بەدرێژایی مێژوو تا سەردەمی ئێستامان لەم دۆزە بکۆڵینەوە، پێویست بە جیاکردنەوەیەکی ئەوتۆی قۆناغە مێژووییەکان ناکات، جونکە کۆمەڵگەی کوردی لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان گەسەسەندنێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە، بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ پێکهاتە و پەیوەندییەکان وەک خۆیان ماونەتەوە! ئەم زەمەنەش زەمەنی دووبارەبوونەوەی یەک دیمەنە، کە پێویستی بە ڕەهەندەکانی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو نییە(٢١). (عەبدوڵا ئۆج ئالان) لەمبارەیەوە دەڵێت:» لەڕاستیدا جیاوازی نێوان کوردەکانی سەردەمی

سۆمەرییەکان و کوردانی ڕۆژی ئەمڕۆمان هێندەی جیاوازی نێوان پیتی (ر) لاواز و قەڵەوە! کوردانی خاوەن کەلتووری هەزاران ساڵەی قەبیلە، ئێستاش قورسایی و مۆرکی قەبیلەیان لەناو گەلی کورد لە پێشە«(٢٢). بەواتەیەکی تر گۆڕانێکی ئەوتۆ لە هەناوی کۆمەڵگەی کوردیدا ڕوووینەداوە! بەڵکو ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕوویانداوە زیاتر دیمەنە ڕووکەشەکانی ژیانیانی گرتووەتەوە و بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی کورتخایەن بووە!(٢٣)

(کۆمەڵگەی مێژوویی) یەک شێوە نییە، بەڵکو لە ڕووی ڕێگەی دروستبوون و شێوەی بنیاتنانییەوە جۆراو جۆرە. لەڕاستیدا کۆمەڵگەی مێژوویی دەتوانرێت بە دوو ڕێگە دروست ببێت:

یەکەمیان: لە سەرەتادا لە کەرەستەی نوێ پێکدێت، واتە لە کەرەستەیەک کە ڕووبەڕووی هیچ گۆڕانێکی مێژوویی پێشوو نەبووبێتەوە. جا ئەو کەرەستانە لەو بارودۆخەی کە لە سرووشتدا لەسەری بووە بەکار دەبات، هەر بەو ڕێگەیە کۆمەڵگە مێژووییە سەرەتاکان دروستبوون، وەک ئەوەی شۆڕشی کشتوکاڵی لە چاخی بەردینی نوێدا(٢٤). بەڵام ئەم جۆرە ڕەنگە لە ڕەگەزگەلێکیشەوە دروست بووبێت، کە پێشتر لە کۆمەڵگەیەکی مێژوویی پێشوودا بەکارهاتبێت. کە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی بەهۆی پێشکەوتنی یاخود سادەبوونی پانتاییەکەیەوە گۆڕابێت بۆ ڕەگەز گەلێکی ئامادە بۆ بەکارهێنانی لە کۆمەڵگەیەکی نوێدا. هەروەها ڕەنگە بەهۆی خواستن (الاستعارة) یشەوە بێت لە وێنەی کۆچێکدا کە ئەو ڕەگەزانە لە کۆمەڵگەی دایک دادەڕنێت، وەک ئەو کۆچەی کە کۆمەڵگەی ئەمریکی هەنوکەی پێکهێناوە. ئەوە ئەو کۆمەڵگەیەیە کە لە ڕەگەزگەلێک پێکهاتووە کە کۆمەڵگەیەکی ژیاریی لە دۆخی فراوانبوونیدا پێشکەشی کردووە، ئەو کۆمەڵگە ژیارییەش کۆمەڵگەی ئەورووپی سەدەی شانزەهەم بوو. یاخود ئەو کۆچەی کە کۆمەڵگەی ئەسکیمۆی بەهۆی دابڕینی لە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگە مەگۆلیە چینییەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور پێکهێنا، زۆرجاریش خواستن وێنەیەکی دیکە لەخۆ دەگرێت، کاتێک کە حاڵەتەکە دەبێتە گێڕانەوەی پێکهاتەی پەردوی کۆمەڵگەیەک یاخود ئەو کۆمەڵگەیانەی کە دیار نەماون. لە نموونەی ئەوانیش کۆمەڵگەی ڕۆمانییە کە لە ڕێگەی بنیاتنانیدا زۆر لەو کۆمەڵگەیانەی مژی کە دیار نەمان، وەک کۆمەڵگەی گالی لە پاش جەنگی ئەلیزیا Alesia))و کۆمەڵگەی قەرتاجنی ((Carthaginoise لە پاش جەنگی (زاما)، و کۆمەڵگەی میسری پاش سەرکەوتنی قەیسەر بەسەر (پومی)دا... تاد (٢٥).

بەڵام ئەگەر لەم ڕوانگەوە لە کۆمەڵگەی کوردی ڕابمێنین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت: کوردەکان نەک هەر لە جوگرافیایەکی دیکەوە نەهاتوون! بەڵکو بە دێرینترین نەژادی نیشتمانەکەی خۆیان دادەنرێن و بەردەوام بە خاکەکەی خۆیانەوە بەستراونەتەوە و وەک ئیمپراتۆریێتی ڕۆمانی یاخود وێنەی هەر هێزێکی تر چاویان نەبڕیوەتە خاکی دەرەوەی سنوورەکانی خۆیان!

## مەبەستگەرایی و کۆمەڵگە:

لێرەدا پێویستە جیاکارییەک بکەین، لە نێوان جیهانێکدا کە سنوورەکانی بوونی خۆی فراوان دەکات، لەگەڵ جیهانێکدا کە تەنها سنوورەکانی بوونی خۆی دەپارێزیت، کە دواجار جیاوازییە لە نێوان هۆشارییەکدا کە سنوورەکانی خۆی فراوان دەکات، لە تەک جیهانێکدا کە هۆشیاری خۆی دەپارێزێت..

ئەو جیهانەی بوونی خۆی فراوان دەکات، هۆشیارییەکی ئەکتیف بەرهەم دەهێنێت، هۆشیارییەکی (مەبەستگەرا)، هۆشیارییەک کە بەرەو جیهان ئاراستە وەردەگرێت، لەکاتێکدا جیهانێک کە تەنها لە دۆخی پاراستنی بوونی خۆیدا بمێنێتەوە، هۆشیارییەک بەرهەم دەهێنێت کە لە

پشت دیوارەکانی جیهانەوە خۆی حەشارداوە، لە بەردەم پەلاماری دونیادا دەکشێتەوە، لە پشت ئەو پەلامارەوە هۆشیاری تەنها نوزەی لەشێکە، لە ڕێگەی وێنەکانی خۆیەوە دەیەوێت مانەوەی خۆی بسەلمێنێ، واتە دواجار لادانێکی گەورە لەو (مەبەست)انەدا دێتە پێش، کە پێویستە هۆشیاری لە ڕێگایانەوە جیهان بناسێت(٢٦).

بزووتنەوەی مێژوو لە تێکڕای بزووتنەوەکانی دیکە، بەوەی کە بزووتنەوەیەکی مەبەستی (غائیە)یە نەک هۆکارێتی (سببی) بە تەنها، جیا دەکرێتەوە، چونکە بزووتنەوەی مێژوو بە تەنها چاو نابڕێتە هۆکارەکان یاخود ڕابردوو، بەڵکو بەرەو مەبەستەکان دەڕوانێت، لەبەرئەوەی بزووتنەوەیەکی ئامانجدارە و بۆ مەبەستێک لە داهاتوو ڕادەمێنێت، بۆیە داهاتوو بزووێنەری هەر چالاکییەکە لە چالاکییە مێژووییەکان، داهاتووش لە میانەی ئەو (بوون)ە زەینییەوە کە ئەو داهاتووەی تێدا دروست دەبێت، دەجولێت(٢٧).

لەبەرئەوە بوونی زەینی دەبێتە هاندەر و بزووێنەری بزووتنەوەی مێژوو، چونکە ئەو بوونە زەینییە لەلایەکەوە لایەنێکی هزری بەرجەستە دەکات، کە جیهانبینییەکانی ئامانجەکە دەگرێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە وزە دەنوێنێت، یاخود ئەو ویستە(الارادە)ی کە مرۆڤ بەرەو ئەو ئامانجە هاندەدات و جووڵانی بەرەو ئامانجەکە چالاکتر دەکات. ئەو بوونە زەینییەش کە داهاتووی بزووێنەر بەرجەستە دەکات، لەلایەکەوە گوزارشت لە (هزر)و لەلایەکی دیکەشەوە گوزارشت لە (ویست) دەکات، بە ئاوێتەبوونی نێوان هزر و ویستیش کاریگەرێتی داهاتوو و بزووێنەرێتی بۆ چالاکی مێژوویی لەسەر پانتاییە کۆمەڵایەتییەکان بەدی دێت.

لەڕاستیدا (هزر) و (ویست) ناوەڕۆکی ناوەوەی شعوری مرۆڤن و ئەو مەبەستانە دروست دەکەن و ئەو ئامانجانە لە میانەی ئاوێتەکردنی هزر و ویستدا بەرجەستە دەکەن(٢٨).

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ناوەڕۆکی ناوەوەی مرۆڤ بنەڕەتی بزووتنەوەی مێژووە.

سەرخانی کۆمەڵایەتیش بە هەموو ئەوانەی کە دەیگرێتەوە لە پەیوەندییەکان و سیستم و ئاکارەوە بەو ژێرخانەوە پەیوەستە، واتە بە ناوەڕۆکی ناوەوەی مرۆڤ، بەمشێوەیە گۆڕان و بەرەو پێشچوونی ئەو سەرخانە کۆمەڵایەتییە شوێنێکەوتەی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی ئەو ژێرخانە دەبێت، جا ئەگەر بنەڕەتەکە گۆڕا ئەوا سەرخانەکەش دەگۆڕێت، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بنەڕەتەکە بە قەتیسماوی مایەوە ئەوە سەرخانەش بەقەتیسکراوی دەمێنێتەوە.

بەم شێوەیە گۆڕانی (بنەڕەت) گۆڕانی هەموو ئەوانەیە کە لە دەروونی کۆمەڵدا بوونی هەیە، ئەوەش گۆڕانی بارودۆخ و جۆرێتی و مێژوویی و کۆمەڵایەتیی بەدوای خۆیدا دێنێت، بەڵام گۆڕانی تاکێک یا دوو تاک یاخود سێ تاک (بنەڕەت) ی گۆڕینی کۆمەڵ پێکناهێنن. واتە ناوەڕۆکی دەروونی و ناوەوەی کۆمەڵێک وەک کۆمەڵ نەک وەک ئەو تاک و ئەم تاک بە بنەڕەت و بنکەی گۆڕانکارییەکانی سەرخانی تەواوی بزووتنەوەی مێژوو دادەنرێت.

گۆڕانی ناوەڕۆکی ناوەوە و گۆڕانی کۆمەڵایەتی دوو پرۆسەن دەبێت بەشێوەیەکی تەریبی بە پاڵ یەکەوە بڕۆن، واتە پرۆسەی دروستکردنی ناوەڕۆکی ناوەوە لەلایەن مرۆڤەوە بنیاتنانی خۆی و هزریی و ویست و هەڵپەکان (الطموحات) ی دەگرێتەوە و ئەو بنیاتنانە ناوەکییەش دەبێت هاوڕێک لەگەڵ بنیاتنانی دەرەکیدا بڕوات، واتە لەگەڵ بنیاتنانی سەرخاندا. بەم شێوەیە ناتوانرێت بنیاتنانی دەرەکی لە بنیاتنانی ناوەکی بترازێنرێت، ئەگەر ترازێنراش ئەوە بنیاتنانێکی لەرزۆک و لێکهەڵوەشاوی لێ دەمێنێتەوە. واتە ئەگەر ئەم دوو کردارە لە یەکتری جیاکرانەوە ئەوا (ڕاستی) و

(ناوەڕۆک)ی خۆیان لەدەست دەدەن(٢٩).

هەر لەم ڕوانگەوە ئەوە ئەو (هزر) و (ویست) ـ مەبەست بۆ داهاتوو و ویستی بەدیهێنانی ئەو مەبەستە لە واقیعدا ـ بووە، کە ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵگە جیاوازەکانی بەدیهێناوە! واتە لێرەوە پەی بەوە دەبەین کە هەریەک لە یابانییەکان و چینییەکان و ئەمریکییەکان و....تاد، بە چ شێوەیەک وێنەی داهاتووی خۆیان کێشاوە! واتە ئەو واقیعە هەنوکەییەی کە ئێستا تێیدا دەژین، بەرهەمی ئەو مەبەستە بووە کە پێشتر بۆ داهاتوو هەیان بووە!

ئەی ئایا ئەو (مەبەستە) چی بووە کە کورد ویستوویەتی لە داهاتوودا بەدیبهێنێت؟ بەڕاست کورد مەبەستێکی ستراتیجی بۆ داهاتوو هەبووە؟ ئەگەر مەبەستێکی ڕوونی هەبووبێت، ئەی بۆ تائێستا گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر کەسایەتی و کۆمەڵگەی کوردیدا نەهاتووە؟ یاخود مەبەستی کورد تەنها بریتی بووە لە پارێزگاری کردن لە واقیعی باو و دەقپێوەگرتووەوە!

لە سەرەتای سەدەی بیست و بەدیاریکراوی لە ساڵی ١٩١٣ ڕووناکبیری کورد (عەبدوڵڵا جەودەت) باسی لە گرنگی داهاتوو کردووە و زۆر بەڕاشکاوی و بوێرانە دەڵێت:» ئەو سەدەیەی ئێمە تێیدا دەژین هەروا گاڵتە نییە، ئەوە سەدەی بیستەمە. ئەو میللەت و تاکانەی مێژووی ڕابردوو و دوارۆژی خۆیان نەبێ ئەوا تێیدا دەبنە کۆیلە و دیلی خەڵکی دیکە.

گوتم مێژووی دوارۆژ، لەوانەیە زۆر لە خوێنەران سەریان لەم چەمکە سوڕبمێنێ و لایان سەیربێت، بەڵێ دەبێ میللەتان ببنە خاوەنی مێژووی دوارۆژیان، چونکە ئەمەیان لە مێژووی ڕابردوو گرنگترە، ڕاستریش ئەوەیە کە نەتەوەکان خاوەنی مێژووی ڕابردوو بن و موڵکی مێژووی داهاتوو و دوارۆژیان بن.

مێژووی هەر نەتەوەیەک ئاوات و ئامانجی ئەو میللەتەیە، ئەوە مانای وشەی ئاماژە بۆکراو دەدات، کە لە زووێکەوە بەکاردەبرێ. دەسا وەرن با بەیەکەوە دانی پێدا بنێین کە کورد کتێبێکی ئەوتۆی مێژوویيان نییە کە بەڕاستی شایانی سەردەم بێت. پاشان ئایا کورد بیر (مبدأ)یکیان هەیە، ئەگەر هەیانە با ڕوونی بکەینەوە.

زانا (فەیلەسوف)ێک دەڵێ: لەوە ئاسانتر نییە بزانرێ هەر میللەتێک لە دوارۆژدا دەبێ بە چی و دەگاتە کوێ؟ ئێوە لەسەرتانە کە بزانن لە دوارۆژدا دەتانەوێ ببن بە چی؟ میللەتەکەتان چی دەوێ و دەیەوێ ببێ بە چی؟ لەم بارەدا، بۆ پەردە هەڵدانەوە لەسەر دوارۆژی هەر میللەتێک پێویست ناکات نە ببیە (وەلی) و نە (شێت). دەمەوێ لە لاوانی کورد بگەم و لێیان بپرسم ئەوان دەیانەوێ ببن بە چی و بەچی بگەن؟ ئایا دەیانەوێت ببنە توخم (ئەندام) یکی ئیمپراتۆریای عوسمانی، بەڵام چۆن توخمێک، توخمێکی پووچ و بێ کەڵکی شەپلە لێدراو یان توخمێکی تازە و تازەکەرەوە، زیندوو و زیندووکەرەوە. دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارە ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا بدرێتەوە، ئەو کات ڕێگە دۆزینەوە ئاسان دەبێت»(٣٠).

لێرەوە بەو ڕاستییە تاڵە ئاشنا دەبین کە هێشتا (هزر و ویست و مێژووی داهاتوو) لای کورد لەو ئاستەدا نییە کە لانی کەم هەندێک لە خەسڵەت و مەشخەڵەکانی (کۆمەڵگەی سەرەتایی) تێبپەڕێنێت و بچێتە نێو (کۆمەڵگەی مێژوویی)ەوە!

لێرەدا بە گرنگی دەزانین وردتر هەڵوێستە لەسەر دروستبوونی کۆمەڵگەی مێژوویی بکەین و لەو سەربەنەشەوە لە دروستبوونی کۆمەڵگەی کوردی ڕابمێنین! لەدایکبوونی کۆمەڵگەی مێژوویی لە ڕوانگەی گەشەکردنی بارودۆخە مێژووییەکەیەوە جۆراو جۆر دەبێت، لەم گۆشەیەشەوە دوو جۆر کۆمەڵگە دروست دەبن:

### أ) جوگرافیا و کۆمەڵگە

کۆمەڵگەیەکی مێژوویی لەدایک دەبێت، جا لەدایکبوونەکەی وەڵامدانەوەیەک دەبێت سەبارەت

به‌ هه‌ڵبژاردنێکی به‌سه‌ردا سه‌پێنراو (اختيار مفروض)، که‌ بارودۆخه‌ سروشتییه‌ تایبه‌تییه‌که‌ی ئه‌و ناوه‌نده‌ی که‌ تێیدا له‌دایکبووه‌ به‌سه‌ریدا ده‌یسه‌پێنێت، جا ئه‌گه‌ر ئه‌و ناوه‌نده‌ ڕووبه‌ڕووی جۆراوجۆرییه‌کی کتوپڕ بێت یاخود ڕه‌گه‌زه‌ پێکهێنه‌ره‌کانی کتوپڕ ڕووبه‌ڕووی ناوه‌ندێکی سروشتی نوێ بووه‌وه‌ که‌ ده‌توانین ناوی لێبنێین نمونه‌ی جوگرافی و کۆمه‌ڵگه‌ی ئه‌مریکی بۆ ئه‌م جۆره‌ کۆمه‌ڵگه‌یه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌، که‌ به‌رهه‌مى کۆچی ئه‌وروپی بوو، ناچار بوو که‌ خۆی له‌گه‌ڵ بارودۆخه‌ سروشتییه‌کانی کیشوه‌ری نوێدا بگونجێنێت(٣١).

به‌ڵام کورد به‌درێژایی هه‌زاران ساڵ هه‌ر له‌ جوگرافیاکه‌ی خۆیدا ژیاوه‌، نه‌ له‌ جوگرافیایه‌کی تره‌وه‌ هاتووه‌، نه‌ گۆڕانکارییه‌ جوگرافییه‌کانیش ئه‌وه‌نده‌ خێرا بوون که‌ کاریگه‌رێتییه‌کی نوێ له‌سه‌ری جێبهێڵن! جوگرافیا ئامرازێکی گرنگه‌ بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ و یارمه‌تیدانی ئێمه‌ تا بتوانین وردتر له‌ کۆمه‌ڵگه‌ی کوردی تێبگه‌ین! هه‌ر توێژینه‌وه‌یه‌ک ده‌رباره‌ی کۆمه‌ڵگه‌ی کوردی ئه‌نجام بدرێت و ڕه‌هه‌ندی جوگرافی وه‌ک ڕه‌هه‌ندێکی بنه‌ڕه‌تی دروستبوون و په‌ره‌سه‌ندنی کۆمه‌ڵگه‌که‌ به‌ هه‌ند وه‌رنه‌گرێت، ئه‌وا به‌ دڵنیاییه‌وه‌ توێژینه‌وه‌یه‌کی ناته‌واو ده‌بێت! چونکه‌ له‌لایه‌که‌وه‌ کوردستان وڵاتێکی چیاییه‌ و نزیکه‌ی نیوه‌ی ڕووبه‌ره‌که‌ی له‌ چیا پێکهاتووه‌(٣٢) ، له‌لایه‌کی تریشه‌وه‌ جوگرافیا ده‌چێته‌ ئه‌و چێوه‌یه‌وه‌ که‌ (مێژووی ماوه‌درێژ) کاری تێدا ده‌کات. واته‌ ده‌بێت بۆ تێگه‌یشتن له‌ مێژوو و کۆمه‌ڵگه‌ی کوردی (مێژووی ماوه‌ کورت) که‌ (ڕووداو و کرۆنۆلۆجیا و سیاسه‌ت و مێژووی تاک) له‌ گرنگترین تایبه‌تمه‌ندییه‌کانین، تێپه‌ڕێنین!

لێره‌وه‌ (مێژووی ماوه‌درێژ) مێژووییه‌که‌ زیاتر له‌ وه‌ستاوییه‌وه‌ نزیکتره‌ وه‌ک له‌ بزوتنه‌وه‌وه‌، واته‌ مێژووی مرۆڤ و په‌یوه‌ندی به‌و ده‌وروبه‌ره‌ی که‌ گه‌مارۆی داوه‌. ئه‌وه‌ مێژووییه‌کی زۆر هێواشه‌ له‌ مرۆڤایه‌تیبوون و گۆڕانکارییه‌کانیدا. له‌به‌رئه‌وه‌ به‌رکه‌وتن و په‌یڤینی له‌گه‌ڵ شته‌ مردووه‌کاندایه‌ و به‌شێوه‌یه‌کی دووباره‌بووه‌وه‌ ده‌رده‌که‌وێت، وا خۆی نمایش ده‌کات که‌ له‌ ده‌ره‌وه‌ی کات بێت، دووباره‌ش ده‌بێته‌وه‌ تا به‌رده‌وام بێت، به‌سه‌ر ڕووکاره‌ ده‌ره‌کییه‌که‌یدا نه‌بێت، گۆڕانی به‌سه‌ردا نایه‌ت»(٣٣). لێره‌وه‌ دیارده‌ جوگرافییه‌کان ( چیا، ده‌شت، که‌نار و...تاد) وه‌ک که‌سایه‌تیگه‌لێکی دیار له‌ دیاریکردنی ڕه‌وتی ژیانی مرۆڤایه‌تیدا ده‌خرێنه‌ڕوو.

ناتوانین به‌ قوڵی له‌ (مێژووی ماوه‌درێژ) تێبگه‌ین، ئه‌گه‌ر له‌ چێوه‌ی چه‌مکێکی دیکه‌ی هاوته‌ریبدا نه‌بێت، که‌ ئه‌ویش (بونیاد)ه‌. چونکه‌ (مێژووی ماوه‌درێژ) مێژووی بونیاده‌ جوگرافی، ئابووری، کۆمه‌ڵایه‌تیی و زه‌ینییه‌ ڕیشه‌دار و په‌ره‌سه‌ندنه‌ هێواشه‌کانه‌(٣٤).

سه‌باره‌ت به‌ مێژوونووسان (بونیاد) پێکهاتن و ئه‌ندازه‌یه‌. له‌وه‌ش زیاتر ئه‌و واقعه‌یه‌ که‌ کات به‌شێوه‌یه‌کی خراپ به‌کاریدێنێت و له‌ ماوه‌یه‌کی کاتی دووردرێژدا ده‌یگوازێته‌وه‌. هه‌ندێ له‌و بونیادانه‌، به‌هۆی ئه‌وه‌ی کاتێکی درێژ به‌ زیندوێتی ده‌مێننه‌وه‌، به‌درێژایی چه‌نده‌ها نه‌وه‌ی بێکۆتایی ده‌بنه‌ ڕه‌گه‌زگه‌لێکی نه‌گۆڕ. که‌ ئه‌رکی مێژوو قورس ده‌کات و ئاسته‌نگی بۆ دروست ده‌کات. به‌وه‌ش جڵه‌وی په‌ره‌سه‌ندنه‌که‌ی به‌ده‌سته‌وه‌ ده‌گرێت. ئه‌وانه‌ په‌رده‌گه‌لێکن، سنوورگه‌لێک ده‌کێشن، مرۆڤ به‌ ئه‌زموونه‌کانی خۆی ناتوانێت تێیانبپه‌ڕێنێت. بیر له‌ ئه‌سته‌مى تێکشکاندنی هه‌ندێ چێوه‌ی جوگرافی یا هه‌ندێ واقعی بایلۆجی یاخود هه‌ندێ سنووری به‌رهه‌مهێنان بکه‌نه‌وه‌. ته‌نانه‌ت به‌درێژایی چه‌نده‌ها سه‌ده‌ له‌ چێوه‌ی هاوسه‌نگییه‌کی هێواشی بونیادناندا که‌ تێپه‌ڕاندنیان ئه‌سته‌م بووه‌، مرۆڤ زیندانی که‌شوهه‌وا و ڕووه‌ک و گیانله‌به‌ران و کشتوکاڵ کردن بووه‌(٣٥).

هه‌ر له‌م ڕوانگه‌یه‌وه‌ بوو، که‌ مێژوونووسێکی گه‌وره‌ی وه‌ک (لوسیان فیفه‌ر) به‌ تێبینیکردنی ژیان و بارودۆخی چه‌نده‌ها نه‌ته‌وه‌ی چیایی

دەربارەی مرۆڤی چیایی بڵێت: «ئەو بوونەوەرە دابڕاوە میسالییە جیهانییەیە - مرۆڤێکی ئاسۆ سنووردار- لەبەر بوونی بەربەستگەلی چیایی کە لە هاوسێکانی جیای دەکاتەوە. هەر لەدایکبوونییەوە کۆیلەیەکی ملکەچی نەریتەکانە، پارێزگارە بەوەی کە بە کۆمەڵە بەستەرێکی بەهێز بە ڕابردووییەوە دەبەستێتەوە، هەمیشە پەرۆشی پاسەوانی کردنە لەو کەلتوورە ماددیی و مەعنەوییەی کە پێشینان بۆیان جێهێشتووە، بەشێوەیەک هیچ (نویَ) یەک نیە کە حەزی گۆڕانی تێدا بووروژێنێت، (نەریت ، پۆشاک، زمان و شێوەزار، مەزهەبی ئاینی) کۆن! ئایا ئەمە خەسڵەتی ڕۆمانس دانیشتوانی ئەنجاندین و باسک نەبوون؟ کە بە پۆشاکە نەریتی و ڤودا (Vaudois) و مەزهەبە ئاینییە تایبەتییەکەیان جیادەکرانەوە. ئەندۆرا و دەستکەوتە تایبەتەکانیان و دواتر ئەلبانییەکان بە شێوەزارە تایبەتەکەیان و ئیسلامەکەشیانەوە هاوشێوەن؟(٣٦)»

بەهەمانشێوە لای برۆدێل وەک (لابلاش) ژینگە یاخود شوێن دوو بێژەی هاوواتان(٣٧)، کلیلی نووسین و بنەڕەتی داهاتووی شارستانێتییەکانن، سیستمە هۆکارییەکان ڕەتدەکاتەوە، شوێنیش وەک هۆکارێکی ڕاڤەکاری دیاردە جیاوازەکانی شارستانێتی بەکاردەهێنێت :» لە بنەڕەتدا شارستانێتی (شوێن)ی کارکردنی مرۆڤ و مێژووە»(٣٨). لێرەدا (مێژووی جوگرافی) دەبێتە ئەو چاوگەی واقعی مرۆڤایەتی بە پرشنگەکانی ڕووناک دەکاتەوە.

(مێژووی جوگرافی) بڕیار لەسەر ئەو ئاسۆیانە دەدات، کە ناتوانرێت تێبپەڕێنرێن، دواتر دیارییان دەکات و دایاندەمەزرێنێت. هەروەها ڕێگە نادات، کە لە ئاستێک لە ئاستەکانی واقعی مرۆڤایەتیدا قەتیس بکرێن، لە یەک کاتیشدا ئەو دیاردانەی کە سروشتین و هەڵسوکەوتە کەلتوورییەکانیش لەخۆدەگرێت(٣٩).

لێرەدا مرۆڤ لە چەقی گۆڕانکارییەکان دووردەخرێتەوە و وەک بوونەوەرێکی پەراوێزخراو دەخرێتەڕوو، کە دەسەوسانە لە بەردەم هێزە ئەزەلییەکاندا کە کۆتی دەکەن و بە ئەستەم لە بەردەم خولە ئابوورییەکاندا دەتوانێت هەنگاوبنێت. بۆیە بە پێچەوانەی ( کارل مارکس)ەوە کە دەیگووت: «خەڵکی مێژوو دروست دەکەن»، مێژوونووسی گەورەی فەرەنسی (فێرنان برۆدێل) پێیوابوو پێچەوانەکەی ڕاستە کە مێژوو خەڵکی دروست و ملکەچ دەکات»(٤٠). دواتر مێژووی خۆویستانە لە دیدی ئەودا تەنها وەهمە، ئەگەر واش نەبێت، ئەوا دڵۆپێک ئاوە لەچاو زەریایەکدا. بۆیە لە تێڕوانینی ئەودا نهۆمی زەمینی زەمینەی پتەوی مێژوو دەنوێنێت(٤١).

ئەگەر لەم ڕوانگەوە لە (مێژووی جوگرافی) یاخود (مێژووی ماوەدرێژ)ی کورد ڕابمێنین، ئەوا بەوە ئاشنا دەبین کە ڕەنگە تۆپۆگرافیای کوردستان هۆکارێکی گرنگی هێشتنەوەی خێڵەکان بووبێت بەشێوە سەرەتاییەکەی، لەبەرئەوەی ڕێگای دروستبوونی دامودەزگای خێڵی بەشێوەیەکی سروشتی نەداوە، چونکە زەوی لەبار و دەشت کەم بووە، ئەمیش بووەتە هۆی نیشتەجێ نەبوونێکی هەمیشەیی و بەرفراوان، کە بتوانرێت بناغەی شاری لێوە بنیات بنرێت، بۆیە بەشێوەیەکی سروشتی دامودەزگای خێڵایەتی بەرجەستە نەبووە. بارودۆخ بەوشێوە خێڵەکییە ماوەتەوە و گۆڕانێکی بەرەو باشتر و بۆ ئاستێکی باڵاتری بەسەردا نەهاتووە.

تەنانەت زۆری بەربەستە سروشتییەکان زۆرجار خێڵەکانی لەناو خۆیاندا لە یەکتر جیاکردووەتەوە و پەرتەوازەی کردوون. ئەویش لە ئەنجامی زیادبوون و فراوانبوونی خێڵ ئەمەش بەشێوەیەکی سروشتی هاوسەنگی ناو یەک خێڵ یاخود خێڵە جیاوازەکانی تێکداوە. ئەمە چ لە ڕووی کەمی موڵک و زەوی خێڵەوە بێت یاخود لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و سایکۆلۆژییەتی خێڵەوە بێت.

هەموو بنەماڵە و تیرەیەک لە بنەماڵە و تیرەکانی خێڵ پاش ئەوەی گەشە دەکەن و ژمارەی تاکەکان و ڕووبەری زیاد دەکات، هەوڵی پاراستن و پارێزگاری ئەو ئاستەی کە پێی گەیشتووە دەدات. ئەم دیاردەیە لە دەروونی سەرکردە و ئەندامانی خێزانی فەرمانڕەواکاندا منێتی «أنانیە»یەکی دروست کردووە و، گیانی ڕق و کینەی لە ناخیاندا تۆخ کردووەتەوە.

سەرەڕای ئەوەش جگە لەو سنورە دیاریکراوەی کە پێی گەیشتوون، هیچ ئاسۆیەکی تر لەو دیووی ئەو سنوورەوە نابینن، یاخود بە نامۆ تەماشای دەکەن. ئەمەش بووەتە هۆیەک بۆئەوەی تاکەکانی خێڵ بیر لە بەرژەوەندی گشتی «نەتەوە» نەکەنەوە، بێگومان ئەمەش پاڵنەر دەبێت بۆ کردنی گەورەترین تاوان کە زیان لە خۆیان و کۆمەڵگاکەیان دەدات بەشێوەیەکی گشتی و دەیانخاتە دۆخێکی دۆگما بوونەوە! دۆگمابونیش ئەگەر چووە ناو هەر کۆمەڵگایەکەوە ئەوا بەسیەتی بۆئەوەی بەسەریدا زاڵ بێت(٤٢).

تەنانەت جوگرافیا کاریگەرێتییەکی گەورەی لەسەر (بوون) و (ڕۆڵ) ئایدیۆلۆجیا لە کۆمەڵگەی کوردیدا جێهێشتووە! ئەمە لەکاتێکدا بەشێک لە کۆمەڵگە مێژووییەکان بەهۆی ئایدیۆلۆجیاکانەوە دروستبوون! بەڵام تاکی کوردی بەشێوەیەکی ڕوکەشیانە نەبێت لە ئایدیۆلۆجیا تێنەگەیشتووە و نەیتوانیوە لە پرۆسەی بونیادنانی خۆیدا بەکاری بهێنێت! وەک فێرنان برۆدێل بە ڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات و بەگشتی باس لە پەیوەندی کورد و ژیارەکان (بە هەموو ڕەگەزەکانییەوە) دەکات و دەڵێت:» لەنێو کۆمەڵگاکاندا (شار) و (ناوچە نزمەکان) ژیارەکان دروست دەکەن، چیاکانیش بەشێوەیەکی ڕووکەشیانە نەبێت، ناکەونە ژێرکاریگەری ژیارەکانەوە. چیاکان بەگشتیی جیهانێکن لە پەراوێزی ئەو ژیارانەدا دەمێننەوە کە دروستکراوی شار و ناوچە نزمەکانن... ژیاری ڕۆمانی ڕۆڵەی پێدەشتەکان بوو، چیا سەرکەشەکان بە داخراوی بەڕوویدا مانەوە، تەنانەت کاسۆلیکیش نەیتوانی دەسکەوتەکانی خۆی پێ بگەیەنێت. زمانی لاتینیش دەسەوسان بوو، لەوەدا کە بتوانێت لە زنجیرە چیا دژەکانی باکووری ئەفریقا و ئیسپانیا بڵاوببێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ڕەوتی بە ژیاریبوون بەشێوەیەکی ڕووکەشی نەبێت ناچێتە نێو چیاکانەوە و تێیدا قوڵنابێتەوە. دۆخی ئیسلامیش لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بەربەستانەدا هەمان دۆخی ئاینەکانی ترە. بۆ نموونە بەربەرەکانی باکووری ئەفریقا بەشێوەیەکی ڕووکەشی نەبێت، موسڵمان نین، هەمانشێوەی کوردەکانن لە ئاسیادا»(٤٣).

### ب) ئایدیۆلۆجیا و کۆمەڵگە

دروستبوونی جۆری دووەمی کۆمەڵگەی مێژوویی کاتێک ڕووناکی دەبینێت، کە باوەش بۆ بانگەشەی هزرێک دەکاتەوە، دەتوانین ناوی نمونەی هزریی (ئایدیۆلۆجی) لێبنێین. کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ ئەم شێوەیە دەگەڕێتەوە. هەروەک کۆمەڵگەی ئەوروپی بنەڕەتیشی بۆ دەگەڕێتەوە و ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی بە بەرهەمێکی هزری مەسیحێتی دادەنرێت. هەروەها دەتوانین کۆمەڵگەی سۆڤێتی پێشوو و چینی ئەمڕۆش لەم جۆرە دابنێین(٤٤).

لێرەدا جێی خۆیەتی کە چاوێکی خێرا بە مێژوودا بخشێنین، بۆئەوەی پەی بە حەقیقەتی ئەو پرسە ببەین و ڕۆڵی ئایدیۆلۆجیامان لە یەکخستنی ڕیزەکانی کۆمەڵ و تواناکانی و تەنانەت دروستکردنی دەوڵەت و پاشانیش هێشتنەوەی کۆمەڵ و دەوڵەت بە سەربەخۆیی و گەشەکردوویی.

بەدەوییەکان، لەسەرو هەموویانەوە عەرەبی پێش ئیسلام لە نیمچە دورگەکەیاندا بە کۆمەڵی پەرتەوازە و لێکجودا دەژیان، کە پەیوەندی ڕەچەڵەک تاکەکانی پێکەوە دەبەستەوە و کۆمەڵەکانی لە

یەکتر جیادەکردەوە. مەرجە ماددییەکانی ژیانی ئەو کەسانە لە وشکی زەوی، جێگۆڕین، کەمی لەوەڕگا چەند خەسڵەت و سیفەتێکی دیاریکراوی پێ بەخشیبوون کە نەیان دەتوانی دەسەڵاتێکی گشتی دابمەزرێنن تا خێرا لە خۆیەوە بۆ دەسەڵاتێکی ناوەندی لە شێوەی دەوڵەتدا گەشە بکات. جا بۆئەوەی دەوڵەتیکیان بۆ دروست ببێت، پێویستی بە فاکتەرێکی تر هەبوو کە سیفەتەکانیان هەڵبگێڕێتەوە و ڕیزەکانیان یەکبخات و ئاڕاستەی هێز و چالاکییەکانیان بە ئاڕاستەیەکی تردا بگۆڕێت، بەدەر لە ئاڕاستەی ململانێی خێڵەکی کە بەردەوام قەوارەکەیانی پەرت دەکرد(٤٥).

ئەو فاکتەرە پێویستەش تەنها ئایین بوو، ئایین کە ئیرەیی و ململانێی نێوانیانی نەدەهێشت، ڕەوشتە ناپەسەند و خراپەکانی لادەبرد و خەسڵەتە پۆزەتیڤەکانی تێدا تۆخ دەکردنەوە، وشە و گوتارییانی یەکدەخست(٤٦). ئیسلام توانی کۆمەڵگای سروشتی ئەو کاتەی عەرەب تێبپەڕێنێت و کۆمەڵگایەکی نوێ لە نیمچە دورگەی عەرەبدا بونیاد بنێت! وەک دەمارگیرییەکی باڵا و پەرەسەند و تا ئاستی پرۆژە ڕۆشنبیرییەکەی تا بە نیشانە پەیامییەکەی (رسالی)یەوە بتوانێت دەمارگیرییە خێڵەکییەکان بەشێوەیەکی دروست ئاڕاستە بکات و بۆ کۆمەڵگا بەرەنجامی باشی لێبکەوێتەوە.

بۆیە گوتاری دەمارگیری وەک ناوەرۆکێکی هەمیشەیی بۆ شێوەی دەسەڵات بەردەوام بووە و توانیوێەتی سیمبولە ئایینییەکان وەربگرێت و لە پرۆسەی دەسەڵاتدا بەکاریانبهێنێت، ئەم بەکارهێنانەش شێوە و شێوازی جیاوازی لەخۆگرتووە. ئەمەش هەر لە ئەزموونی خەلافەتی ڕاشدییەوە کە لە پاش کۆچی دوایی پەیامبەر (د. خ) دەستیپێکرد. ڕاستەوخۆ شێوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای لە خۆگرت و دوو ئامانجی سەرەکی هەبوو – کە ئامانجی هەموو دەسەڵاتێکە لە مێژوودا– ئەوانیش: یەکخستنی ڕیزەکانی ناوەوەی دەوڵەت، پاشانیش بەرگری لێکردنی لە مەترسی دەرەکی، ئەگەر بە ڕێگەی فتوحاتیش بێت.

قۆناغی دەسەڵاتی ڕاشدیی توانی گۆڕانێکی کودەتایی لە ناوەڕۆکی گوتاری دەمارگیریدا بکات، دەمارگیری لە دەلالەتە خێڵەکی و نزیکی خوێنەوە بۆ دەلالەتێکی تر کە جۆرێکی نوێی سنووربەزێن (خارق) بوو گواستەوە. ئەویش دەمارگیری پابەندبوون بە گۆڕانی جیهانەوە ئەوەندەی دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت(٤٧).

بەمشێوەیە دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکاندا لە سەربەنی بانگەوازی ئیسلام دامەزرا و پایەکانی چەسپا! واقیعی مێژووییش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بانگەوازی ئیسلامی لە بەشێکی گەورەی جیهاندا لەسەر بنەڕەتی جیهاد (فتوحات) دامەزرا، ئەمەش پشتی بە دەزگایەکی سیاسیی و سەربازیی ساکار دەبەست و بەخێرایی بۆ دەزگایەکی ئاڵۆز کە لە دەوڵەتدا خۆی بینییەوە گەشەی کرد(٤٨).

بەهەمان شێوە ئیسلام بنەڕەتیترین هۆکاری بەهێزبوون و بە دەوڵەت بوونی تورکە عوسمانییەکان بوو، ئەوان ئەرکی گەیاندنی ئاینی ئیسلام و بەرگریکردن لە سنوورەکانی جیهانی ئیسلامییان لە ئەستۆگرت. ئەمەش هۆکارێک بوو تا مسوڵمانان لە ناوچە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامییەوە بە مەبەستی جیهادکردن لەپێناوی سەرخستنی ئیسلامدا ڕووبکەنە ناوچەکە. (میرنشینی عوسمانی!)ش سوودی لە وزە و توانا و بەهرەکانیان وەرگرت و میرنشینەکە بەهۆی فراوانکردنی سنوورەکانی لەسەر حیسابی خاکی ئیمپراتۆریتی بێزەنتینیی بووە دەوڵەت و پاشانیش ئیمپراتۆریتی.

بەڵام ئایا ئیسلام هەمان ڕۆڵی لە کۆمەڵگەی کوردیدا گێڕا؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئایینی ئیسلام نەیتوانی کۆمەڵگای ئەوکاتەی کوردی لەو بارودۆخەی کە تێیدابوو تێبپەڕێنێت و کۆمەڵگایەکی

نوێ بونیاد بنێت، وەک ئەو کۆمەڵگایەی کە لە سەرەتای ئیسلامدا لە نیمچە دوورگەی عەرەب بونیادی نا. یاخود وردتر ئیسلام لە کۆمەڵگەی کوردیدا وەک دەمارگیرییەکی باڵا – بە تێگەیشتنە خەلدوونییەکە–و پەرەسەند و تا ئاستی ئەو پرۆژە ڕۆشنبیرییەی کە بە نیشانە پەیامییەکەیەوە دیارە، نەیتوانی دەمارگیرییە خوێناویی و هاوشێوەکانی لێکهەڵبووەشێنێتەوە، یاخود بە ئاڕاستەیەکی دروست ئاڕاستەی بکات! لەبەرانبەریشەوە کورد نەیتوانی پەی بە ڕۆڵی ئیسلام لە دروستکردنی قەوارەکاندا ببات و لە پرۆسەی بونیادنان و بەرەوپێشچوونی خۆیدا لێی بەهرەمەند بێت، لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و- ڕووکەشییانە - چووە ناو ئیسلامەوە، بەڵام ئەوەندە ئیسلامی وەرگرت کە لەگەڵ دابونەریتە خێڵەکییەکانیدا گونجاوبێت! هەرکاتێک نەریتێکی لەگەڵ بنەما یاخود ڕێنماییە ئیسلامییەکاندا دژ وەستابێت ئەوە بەهەر بیانوییەک بێت- بەشێوەیەکی گشتی نەک ڕەها- نەریتەکەی جێبەجێ کردووە و ڕێنماییە ئیسلامییەکەی فەرامۆشکردووە(٤٩)!

(هاشم تەها عەقراوی) دەربارەی بڵاوبوونەوەی (ئایدیۆلۆجیا) لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەڵێت: «بڵاوبوونەوەی ئایدیۆلۆجیا لە کۆمەڵگەی کوردیدا زیاتر بەشێوازی خوتبە و ئامۆژگاری و (وەعز) بووە، بەدەر لە وتووێژی زانستییانە و بەڵگەهێنانەوە. لەبەرئەوەی کورد زۆر حەز بە گێڕانەوەی سەرگوزشتە و چیرۆکی قارەمانێتی و شەڕ دەکات، ئەم چیرۆکانەش شوێنەوارێکی گەورەی لەسەر دڵی ڕۆڵەکانی خێڵ بەجێهێشتووە. زۆر لە منداڵ و لاوەکان – بەتایبەت- لە گوندەکاندا شەوانە تا درەنگ دەمانەوە و بەتاسەوە گوێیان بۆ ئەو چیرۆکانە دەگرت، کە بەسەرهاتی (پاڵەوان)ە کوردییەکانی سەردەمە مێژووییەکانی دەگێڕایەوە، هاوکات ئەو چیرۆکانە زۆرجار تێکەڵ بە ئەفسانەکان دەکران»(٥٠).

هەربۆیە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی مێژوویی بەشێوەیەکی ڕووکەشی نەبێت لە کۆمەڵگەی کوردیدا بەدیناکەین! کاتێکیش بەشێک لە تاکەکان سنووری ئەم کۆمەڵگە سروشتییە تێدەپەڕێنن و دەچنە نێو سنووری کۆمەڵگەیەکی مێژووییەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە تواناکانی خۆیان لە کۆمەڵگە نوێیەکەدا بەگەڕدەخەن و دەتوانن ئافراندن ئەنجام بدەن و دەبنە ئەستێرەی پرشنگداری نێو کۆمەڵگە مێژووییەکە! ڕەنگە ئەمە وەڵامێکیش بێت بۆ ئەو پرسیارەی کە بۆچی کەسە ناودارەکانی کورد تا سنوری کۆمەڵگەکەیان جێنەهێڵن نابنە کەسانێکی بەناوبانگ و کاریگەر و پرشنگدار؟!

ئەوانە کۆمەڵە نمونەیەک بوون دەربارەی جۆراوجۆرێتی مێژوویی یاخود پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگەیەی کە توێژینەوەی لەسەر دەکەین. جا کۆمەڵگە لە هەر نمونەیەکیان بێت تەنها کۆکردنەوەی ڕەگەزەکان یاخود کەسەکان نییە کە غەریزەی کۆمەڵایەتیبوون بەرەو گلۆتگیرییەک لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا کێشیان دەکات، ئەو غەریزەیە ئامرازێکە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگە، نەک هۆکارێک بێت بۆ دروستبوون، ڕەنگە کۆمەڵگە زیاتر لەوە لە کۆمەڵە تاکێک کە وێنەکەی پێکدەهێنن لەخۆی بگرێت، ژمارەیەک لەو نەگۆڕ(ثوابت)انە لەخۆدەگرێت کە بەردەوام پێی دەبەخشێت و بەدیاریکردنی کەسێتییەکەی لە وێنەیەکی سەربەخۆی نزیک لە ئاکامەکانییەوە، دەتوانین بە دوو ڕێگە کاروبارەکە جیابکەینەوە:

أ) لە هەندێ بارودۆخی مێژووییدا ڕوودەدات کە کۆمەڵگەیەک کەسێتییەکەی لەدەست بدات و لە مێژوودا بسڕێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بێگومان ژمارەی تاکەکانی لەوبارەدا ناگۆڕێن، بەڵکو هەموو تاکێک پارێزگاری لە غەریزە بژێوییەکەی لە کۆمەڵدا دەکات، ئەو غەریزەیە کە مەشخەڵی (معالم) مرۆڤ دیاری دەکات، بەو سیفەتەی کە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، تاکەکان وایان لێ دێت

کە بەتەنها ببنە پاشماوەی کۆمەڵگەیەکی تیاچوو، لەهەمانکاتدا پاشماوەیەکی ئامادە بۆئەوەی بچنە نێو جەستەیەکی کۆمەڵایەتی نوێوە. لە پاش جەنگی ئەلیزیا Alesia کۆمەڵگەی گالی نەما، بەڵام گال وەک تاکەکان مابوون، بەڵکو بۆ کەرەستەیەکی ئامادە و بۆ چوونە نێو بنیاتنانی جەستەیەکی کۆمەڵگەیەکی دیکە گۆڕان، کە ئەویش کۆمەڵگەی رۆمانی بوو(٥١).

ب) جا ئەگەر ئەو تاکانەی کە کۆمەڵگەیەک پێکدەهێنن، لە کۆتایی نەوەیەکی دیاریکراودا لەناوچوون، ئەوا کۆمەڵگە هەردەمێنێت و پارێزگاری لە کەسێتییەکەی دەکات و شتێکی بەرناکەوێت. هەروەکو پارێزگاری لە رۆڵی خۆشی دەکات لە مێژوودا. تەنانەت بلیمەتی و دابوونەریتی خۆشی بەسەرهاتووە نوێیەکاندا دەسەپێنێت – تەنانەت ئەگەر بێگانەش بن- ئەوەشمان بینی کاتێک کە کۆمەڵگەی چینی هۆزەکانی مانشۆ و مەگۆلەکانی قوتدا لەوکاتەدا کە پەلاماری وڵاتانی چینیاندا، یاخود چۆن کۆمەڵگەی ئیسلامی هۆزە مەگۆلەکانی قوتدا، کاتێک مەگۆلەکان بەغدایان داگیرکرد و کۆڵانەکانیان لە خوێندا سوور کرد. جا کۆمەڵگە لەناو خۆیدا ئەو سیفەتە خودییانە هەڵدەگرێت کە بەردەوامی بۆ مسۆگەر دەکەن و کەسێتی و رۆڵی لە مێژوودا دەپارێزن. ئەو رەگەزە نەگۆڕە ناوەڕۆکی جەوهەری قەوارەی کۆمەڵایەتییە، ئەوەیە کە تەمەنی کۆمەڵگە دیاری دەکات و لە تێپەڕبوونی زەمەندا سەقامگیربوونی پێ دەبەخشێت و بارودۆخی رووبەڕووبوونەوەی هەموو مێژووی بۆ دەرەخسێنێت.

هەر ئەویشە کە لە کۆتاییدا لە تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا بەرجەستە دەبێت، کە تاکەکانی کۆمەڵگە لەنێو خۆیاندا پێکەوە دەبەستێتەوە و تێکرای رەنگی چالاکییە جیاوازەکانیان لە ئاراستەی ئەرکێکی (وظیفة) گشتیدا ئاراستە دەکات. کە ئەوەش پەیامی تایبەتی ئەو کۆمەڵگەیەیە. لێرەوەیە ئەو تۆڕە پێکدێنن، هەرچەندە لە قۆناغێکی سەرەتایشدا بێت، ئەوەیە کە گوزارشت لە رووداني (لەدایکبوونی کۆمەڵگە) دەکات لە مێژوودا(٥٢).

ئەگەر لە روانگەی ئەم دوو رێگەیەشەوە لە کۆمەڵگەی کوردی رابمێنین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە کورد لەسەر یەک شێوازی دیاریکراو پارێزگاری لە کەسایەتی خۆی کردووە! واتە نە کەسێتییەکەی لەدەستداوە تا بسڕێتەوە و سەرلەنوێ بچێتە نێو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی نوێوە، نە پارێزگاری لە رۆڵی خۆشی لە مێژوودا کردووە! بەو واتایەی کە بتوانێت (کاریگەرێتییەکانی!) سنوورەکانی خۆی تێبپەڕێنێت، یاخود دابونەریتی خۆی بەسەر هێزە (هاتوو)ەکاندا بسەپێنێت! وەک ئەوەی ئیسلام بەرانبەر بە مەغۆلەکان کردی! واتە کۆمەڵگەی کوردی بە (شێوازێکی دەگمەن) لەنێو کۆمەڵگەکانی تری مرۆڤایەتیدا بەردەوامی بە رەوتە (وەستاو)ەکەی خۆی داوە!

لێرەوە دەتوانین بڵێین کۆمەڵگەی کوردی لە پۆلێنی ئەو کۆمەڵگەیانەدا بەشێوەیەکی گشتی نەک رەها هێشتا مەشخەڵە نەگۆڕەکانی کۆمەڵگەی سەرەتایی تێنەپەڕاندووە و بە رێژەیەکی زۆر کەم و دیاریکراو نەبێت نەچووەتە نێو کۆمەڵگەی مێژووییەوە.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


١ ) طونی بینیت واخرون: مفاتیح اصطلاحیة جدیدة (معجم مصطلحات الثقافة والمجتمع)، ت: سعید الغانمی، المظمة العربیة للترجمة، ط١، بیروت،٢٠١٠، ص ٥٩٤.

٢) طونی بینیت واخرون: مفاتیح اصطلاحیة جدیدة، ص ٥٩٥.

٣ ) طونی بینیت واخرون: مفاتیح اصطلاحیة جدیدة، ص ٥٩٥.

٤ ) أندرو إدجار و بیتر سید جویک: موسوعة النظریة الثقافیة (المفاهیم والمصطلحات الأساسیة)، ت: هناء الجوهری، المرکز القومی للترجمة،الطبعة الاولی، القاهرة، ٢٠٠٩، ص ٥٨٤.

٥ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ت: عبد الصبور شاهین، ج١، دار الفکر، دمشق، ٢٠١٥، ص٩.

٦ ) پەیتەر کلۆس: ئەنترۆپۆلۆژی کلتوری، و: خەلیل محەمەد شلّماشی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٦١.

٧ ) پەیتەر کلۆس: ئەنترۆپۆلۆژی کلتوری، ل ٦٢.

٨ ) پەیتەر کلۆس: ئەنترۆپۆلۆژی کلتوری، ل ٦٣،

٩ ) پەیتەر کلۆس: ئەنترۆپۆلۆژی کلتوری، ل ٦٤.

١٠ ) هاشم طه عقراوی : الاسس النفسیة والاجتماعیة للقبائل الکردیة، کرکوک، ١٩٧١، ص٣٠.

١١ ) دبلیو. ای. ویغرام و ادغار. تی. ای ویغرام: مهد البشریة الحیاة فی شرق کردستان، ت: جرجیس فتح الله، دار اراس للطباعة والنشر، ط١، اربیل، ٢٠١٢، ص١٤٨.

١٢ ) بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە (جوگرافیا و کۆمەڵگە) لەم توێژینەوەیەدا.

١٣ ) کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو (کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو)، دەزگای هێڤی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٨١.

١٤ ) مارتین ڤان برونەسن: ئاغاو شێخو دەوڵەت، (وەرگێڕانی: کوردۆ)، ب١، چ٤، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٧٨.

١٥ ) باسیلی نیکیتین: الکرد دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، ت: نوری طالبانی، مکتب الفکر والتوعیة فی الاتحاد الوطنی الکردستانی، ط٣، السلیمانیة، ٢٠٠٧، ص ١٤٢،١٤٣.

١٦ ) باسیلی نیکیتین: الکرد دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، ص ٢٠٧.

١٧ ) هاشم طه عقراوی : الاسس النفسیة والاجتماعیة للقبائل الکردیة، ص١٠.

١٨ ) عەتا قەرەداغی: ڕۆڵی سروشتی جوگرافی و تۆبۆگرافیا لە شێواندنی مێژوودا، گۆڤاری ڕێبازی نوێ، ژمارە ٨، هەولێر، ١٧.

١٩ ) هاشم طه عقراوی : الاسس النفسیة والاجتماعیة للقبائل الکردیة، ص١١.

٢٠ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص١٠.

٢١ ) حەیدەر لەشکری: دەسەڵاتی میری کورد لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، گۆڤاری شانەدەر، ژمارە٩، هەولێر، ١٩٩٩، ل٢٣.

٢٢ ) عەبدوڵلا ئۆج ئالان: مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک (کێشەی کوردو ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتیک، کتێبی پێنجەم، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵلا، چ١، چاپخانەی ڕەنج، ل٨٣.

٢٣ ) کامەران محەمەد: پەیوەندی کورد و ئیسلام (ڕامان لە موسڵمانبوونی کورد)، گۆڤاری خاڵ، ژ:٣، چاپخانەی سەردەم، شوباتی ٢٠١٦، ل ١٩.

٢٤ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص١٠.

٢٥ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص١٠.

٢٦ ) بەختیار عەلی: قەیرانی ئیرادەگەریتی، گۆڤاری

ئازادی، گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ڕەخنەیی سەربەخۆیە، ژمارە ٣، ١٩٩٣، ل ٨، ٩.

٢٧ ) کامەران محەمەد: لە نێوان مرۆڤ و شوێن و کاتدا دیمانەیەک بۆ تێگەیشتنی مێژوو، چ١، سلێمانی، ٢٠١٥، ل ٥١.

٢٨ ) کامەران محەمەد: لەنێوان مرۆڤ و شوێن و کاتدا...، ل ٥٢.

٢٩ ) کامەران محەمەد: لە نێوان مرۆڤ و شوێن و کاتدا...، ل٥٣ و دواتر.

٣٠ ) عەبدوڵڵا جەودەت: گۆڤاری ڕۆژی کورد (گۆڤاری جڤاتی «هێڤی» ی قوتابیانی کورد، ژ ١، ئەستەنبوڵ، ١٩١٣، ل ٤.

٣١ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص١١.

٣٢ ) عەبدوڵڵا غەفور: جوگرافیای کوردستان، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ٥، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٥.

٣٣) Fernand Braudel: The Mediterranean and the Mediterranean world in the age of FhillipII، Vol ١، p ٢٠.

٣٤ ) کامەران محەمەد: فێرنان برۆدێل و گوتاری مێژوویی، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ٢٠٨.

٣٥ ) Fernand Braudel: On history، T: Sarah Matthews، University of Chicago Press، U.S.A، ١٩٨٢، p٣١.

٣٦ ) لوسیان فیڤر: الأرض و التطور البشری، ت: محمد السید غلاب، المرکز القومی للترجمة، ج٢، القاهرة، ٢٠١٥، ص٣٨.

٣٧ ) فیدال دی لابلاش: اصول الجغرافیه البشریه، ت: شاکر خصباک، منشورات جامعه بغداد، ١٩٨٤، ص١٢١.

٣٨ ) فرنان برودیل: عن التاریخ الجدید، ت: بیت الحکمه، مجله بیت الحکمه (مجله مغربیه للترجمه فی العلوم الانسانیه)، العدد: الخامس، السنه الثانیة، دار البیضاء، ١٩٨٧، ص٧.

٣٩ ) فرانسوا دوس: التاریخ المفتت من الحولیات الی التاریخ الجدید، ت: محمد الطاهر المنصوری، المنظمه العربیه للترجمه، ط١، بیروت، ٢٠٠٩، ص٢٠٣.

٤٠ ) فرنان برودیل: عن التاریخ الجدید، ص ١٤.

٤١ ) نزهة نجاح: بلاد المغارب من خلال کتاب البحر الابیض المتوسط لفیرناند برودیل، بحث لنیل شهادة الماستر فی کلیة الاداب والعلوم الانسانیة – جامعه ابن طفیل، المملکة المغربیة، ٢٠١٠-٢٠١١، ص٥٠- ٥١.

٤٢ ) کامەران محەمەد: ڕامانێک لە سیستەمی خێڵایەتی و سیستەمی خێڵایەتی لە کوردستاندا، گۆڤاری نوێبوون، ژ: ٣، مەڵبەندی یەکی ڕێکخستنی سلێمانی (ی.ن.ک)، سلێمانی ، ٢٠٠٨، ل ٢٥٠.

٤٣ ) Fernand Braudel: The Mediterranean and the Mediterranean world in the age of FhillipII, Vol ١, p ٣٤.

٤٤ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص ١٢.

٤٥ ) محمد عابد الجابری: فکر ابن خلدون (العصبیة والدولة) معالم نظریة خلدونیة فی التاریخ الاسلامی، ط٣، بیروت، ١٩٨٢، ص٣٩٢.

٤٦ ) محمد عابد الجابری: فکر ابن خلدون (العصبیة والدولة)...، ص ٣٩٢.

٤٧ ) مطاع صفدی: استراتیجیة التسمیة فی نظام الانظمة المعرفیة، ط٢، بغداد، ١٩٨٦، ص١٦٢.

٤٨ ) محمد عابد الجابری: فکر ابن خلدون (العصبیة والدولة)...، ص ٣٩١.

٤٩ ) کامەران محەمەد قادر: کورد و ئایدیۆلۆجیا، توێژینەوەی دەرچوون، وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین کراوە، ١٩٩٨-١٩٩٩، ل ٢٧، (بڵاونەکراوە).

٥٠ ) الاسس النفسیة والاجتماعیة للقبائل الکردیة، ص١٧.

٥١ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص ١٣.

٥٢ ) مالک بن نبی: میلاد مجتمع (شبکة العلاقات الاجتماعیة)، ص ١٤.

# مەڵبەندەکانی بەڕێوەبردنی شارەزوور لە سەردەمی عوسمانیدا: قەڵاکانی زەڵم و گوڵعەنبەر






نووسینی: حەسەن کۆچ

وەرگێڕانی لە تورکییەوە: کامەران کوردەوار

لەدایکبووی ١٩٩١، هەولێر، ماستەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ لە زانکۆی ئێرجیس ـ لە شاری قەیسەری/ تورکیا (٢٠٢٠).

## پوختە

شارەزوور وەک یەکەیەکی گرنگی نیشتەجێبوون لە باکووری عێراق، بە هۆی ئەوەی دەرگایەکی کراوە بووە بە ڕووی ئێراندا، لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا گرنگییەکی زۆری هەبووە، لەبەر ئەوەشە کە قەڵاکانی زەڵم و گوڵعەنبەر لەسەر سنووری ئێران وەک پایەختی ئەیالەتەکە هەڵسەنگێنراون. قەڵای زەڵم پێش هاتنی عوسمانییەکان، لەلایەن ئێرانییەکانەوە دروست کراوە. هەر چی قەڵای گوڵعەنبەرە، لەگەڵ فەتحی عوسمانییەکان دروست کراوە یاخود نۆژەن کراوەتەوە. بەگشتی لە ئەنجامی هەڵمەتی نەخچەوانی ١٥٥٤ و بەتایبەتییش دوای شەڕەکانی شارەزوور، ناوچەکە چووەتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی. دواتر لە ڕێگای دروستکردنی خان و مزگەوت و حەمام، ناوچەکە ئاوەدان کراوەتەوە. لەو بزاڤی ئاوەدانکردنەوەیەشدا هەوڵەکانی هۆزی «سارەلو» ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە، کە بەگشتی پێداویستییەکانی لەلایەن بەغداوە لەئەستۆ گیراوە. دوای ئەوەی لە سەرەتای سەدەی ١٧، قەڵای گوڵعەنبەر و دەوروبەری لەلایەن شا عەبباسەوە وێران دەکرێت. لە ساڵی ١٦٣٠دا لە میانەی هەڵمەتەکەی خوسرەو پاشا بۆ سەر ئێران، قوللە و مزگەوتەکانی دووبارە بنیات نراونەتەوە. دوای ڕێککەوتننامەی قەسری شیرین و ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێران، هەر چەندە مەڵبەندی ناوچەکە گوازراوەتەوە بۆ کەرکووک، بەڵام ناوچە سنوورییەکە گرنگیی خۆی پاراستووە.

## دەروازە

عێراق بەگشتی و باکووری عێراق (هەرێمی کوردستان - وەرگێڕ) بەتایبەتی، بە درێژایی مێژوو یەکێک بووە لە ناوچە گرنگەکانی نیشتەجێبوون. بەغدا بە ئەندازەی عێراق پایتەختی تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش بووە، باکووری عێراقیش وەک شوێنێکی ستراتیژی و دەرگایەکی کراوە بە ڕووی بەغدا؛ بووەتە جێگای ئامانجی گەلانی جیاواز.

باکووری عێراق لە دوو ناوچەی سەرەکی پێک هاتووە: یەکێکیان ناوچەی موسڵ و ئەوی دیکەیان شارەزوورە. ناوچەی دووەمیان لە سەرچاوەکاندا بە (شەهریزوور، شەهرەزوور، شەهریزۆڵ، شەهرەزول، شەهریزوڵ) ناوی هاتووە، لە ڕووی ڕێنووسیشەوە (بە زمانی تورکی) بە دوو شێوە دەنووسرێت: «Şehr-i Zor»، «Şehr-i Zur».

بەگوێرەی پێناسەی «یاقووتی حەمەوی»، پیتی «ش» بە فەتحەیە و لە دوایدا سکون هەیە، پیتی «ر»ش فەتحەی لەسەرە، کەواتە بە «شەهرەزوور» دەخوێنرێتەوە و وەک ناوچەیەکی فراوان دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان هەولێر و هەمەدان. دامەزرێنەری شارەکە، «زوور کوڕی زەحاک»ە. هەر چی وشەی «شەهر»ە، لە زمانی فارسیدا بە مانای شار دێت(١). بەم شێوەیە شارەزوور بە مانای «شاری زووری کوڕی زەحاک» دێت. بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی تر، دەشتایی شارەزوور لە کۆندا شارێکی گرنگی لەخۆ گرتووە. ئەم شارە کە کەوتووەتە ناوەڕاستی ڕێگای هەردوو پەرستگای ساسانییەکان لە مەدائین و ئاتەشخانەی ئازەربایجان، لەلایەن «قوبادی کوڕی فەیرۆزی ساسانی» دروست کراوە، لەبەر ئەوە پێیان گوتووە شەهری فیروز یاخود شاری فەیرۆز(٢). لە پێشوودا بە شارەزووریان گوتووە «نیم ڕا»، بە مانای ئەوەی کە کەوتووەتە ناوەڕاستی ڕێگای نێوان مەدائین و ئاتەشخانەی ئازەربایجان. لە عێراقی عەجەمیشدا لە ناوچەی شاخاویدایە و شارێکی بچووکە. دراوسێی «مەراغە«یە و ماوەی شەش ڕۆژ ڕێگا لە نێوانیاندایە. ماوەی هەشت ڕۆژ ڕێگاش لە بەغداوە دوورە. لەنزیک شارەزوور قوببەیەکی وێرانە هەیە. ئەم شارە لە «حەلوان» و «موسڵ»یش نزیکە(٣).

وەک ئەوەی پێناسە کرا، دەتوانین بڵێین: شارەزوور دەکەوێتە دەوروبەری شاری سلێمانی، لەسەر سنووری نێوان عێراق و ئێران. لە سەردەمی عوسمانیدا ناوچەکە فراوان کراوە و وەک ئەیالەتێک هەولێر و کەرکووکیشی لەخۆگرتووە، تەنانەت بووەتە مەڵبەندی بەڕێوەبردنی ئەیالەتەکە بۆ بەڕێوەبردنی کەرکووک و شارەزووریش، بەڵام لەگەڵ فەتحکردنی قەڵای زەڵم و دەوروبەری (١٥٥٢-١٥٥٣)، قەڵای گوڵعەنبەر کە لەنزیک ئەم قەڵایەوە دامەزرا، وەک یەکەیەکی نیشتەجێبوونی مێژوویی شارەزوور؛ گرنگییەکەی زیاتر بووە.

## گوڵعەنبەر (کل عنبر)

قەڵای گوڵعەنبەر وەک مەڵبەندی شارەزوور (شەهریزۆڵ)، دەکەوێتە دەشتی بەرفراوانی شارەزوور کە چیاکان لە سنووری ڕۆژهەڵاتیەوە لە باشوورەوە تا باکوور درێژ دەبنەوە. لەبناری چیاکەدا گردێکی نزم هەیە، لە دامێنیشیەوە کانیاوگەلێک هەن. هەر لە شاخەکەوە، لە شێوەی جۆگەیەک؛ ڕووبارێکی گەورە هەڵدەقوڵێت (مەبەستی سەرچاوەی ئاوی زەڵمە - وەرگێڕ)(٤).

یەکەم دەستبەسەرداگرتنی گوڵعەنبەر، دەگەڕێتەوە بۆ کاتی هەڵمەتی نەخچەوان، قەڵای گوڵعەنبەریش لەو کاتەدا لەپاڵ قەڵای زەڵم کۆنترۆڵ کراوە. ئەو بەڵگەنامانەی لەبەر دەستدان، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە «سێرهای بەگی کەتخودا» بەوپەڕی گرووتینەوە کاری کردووە لە دروستکردنی قەڵاکەدا(٥). قەڵاکە لە ڕێکەوتی ١٠ی ربیع الأخری ٢٢/٩٦٣ی شوباتی ١٥٥٦ دروستکراوە. هەروەها ئەحمەد بەگی میری زەنگابادیش لە نۆژەنکردنەوەی قەڵاکەدا کاری کردووە(٦). ڕێکەوتی ئەو فەرمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوتی ١٥ی ربیع الأخری ١٥/٩٦٤ی شوباتی ١٥٥٧، بەو پێیە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە نۆژەنکارییەکە لە ساڵی پاشتریش ئەنجام دراوە.

لەدوای ئەوە قەڵاکە بووەتە مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوور(٧) و بارودۆخی قەڵاکە بەبەردەوامی چاودێری کراوە.

لە سەروبەندی یاخیبوونی بەسرەدا، سوڵتان حوسێنی وەزیر چووەتە بەگلەربەگی شارەزوور و دەستی کردووە بە تەواوکردن و چاککردنی ئەو کەموکورییانەی کە لە بنیادی قەڵاکەی گوڵعەنبەردا هەبووە (١ی زیلحیجەی ٣٠/٩٧٢ی حوزەیرانی ١٥٦٥)(٨).

بۆ هەڵسەنگاندنی ناوچە چۆڵ و وێرانبووەکانی دەوروبەری قەڵای گوڵعەنبەر، بڕیاردرا خەرجیی زاویە (تەکیە)کەی لە ڕێگای بەروبوومی وەقفەکانەوە دابین بکرێت و شوێنەکانی وەقفیش بە شێوەی سیستمی تیمار بدرێت بە کەسانی دیکە (٢٥ی زیلحیجەی ٢٤/٩٧٢ی تەممووزی ١٥٦٥)(٩).

بە هۆی ئەوەی ئەو شوێنە نوێیانەی لە دەوروبەری قەڵای گوڵعەنبەر دروست کراون؛ بە شێوەی پێویست ژوور و حەمامیان تێدا نەبووە، بڕیار دراوە لەو شوێنە ژوور و حەمام دروست بکرێت. هەروەها بە هۆی زۆریی ژمارەی ئەندامانی یەنیچەری «ئینکشاری» لە ناوچەکە بڕیار دراوە لە دەوروبەری قەڵای زەڵم نیشتەجێ بکرێن و لە کاتی پێویستدا بهێنرێنە قەڵاکە و ئەرکیان پێ بسپێردرێت (٢٤ی زیلحیجەی ٩٧٢ک/٢٣ی تەممووزی ١٥٦٥)(١٠).

بەگلەربەگی شارەزوور فەرمانی پێ کراوە کە بەشداری بکات لە هەڵمەتی سەر جەزائیر (عولیان ئۆغلو). هەر چی شارەزوورە، هێشتا ویلایەتێکی تەواو ڕێکخراو نەبوو، خەڵکەکەشی ناشارستانی بوون، لەبەر ئەوە وا بە باش زانرا کە یەک دوو سەنجەق بەگ و سەرباز بنێردرێتە شارەزوور و بەگلەربەگی ڕووم لە موسڵدا جێگیر ببێت (٢٠ی ڕەبیعی یەکەمی ٩٧٥ک/٢٤ی ئەیلوولی ١٥٦٧) (١١). بەڵام دواتر بەپێی فەرمانێکی نوێ بڕیار درا بەگلەربەگی ڕوم کە بەرپرسی پاراستنی

شارەزوور بوو لە کەرکووک دابنیشێ و دەسەڵاتی تەواوی ناوچەکەی پێ بدرێت، بەتایبەتییش قەڵای گوڵعەنبەر کە بۆ پاراستنی ناوچەکە زۆر گرنگ بوو، لەپاڵ ئەوەدا بەدواداچوون بۆ دۆخی ئێرانیش بکات و زانیارییەکان بگەیەنێت (٧ی ڕەبیعی دووەمی ٩٧٥ک/١١ی تشرینی یەکەمی ١٥٦٧)(١٢).

لە ساڵی ١٥٦٨ نۆژەنکردنەوەی شارەزوور تەواو بووە، وەک لە سەرەوە باس کرا، لە ساڵی ١٥٦٥ فەرمان کرابوو بە دروستکردنی مزگەوت و سەرا و حەمام، دوای تەواوبوونیشیان بەگلەربەگی شارەزوور کە لە کەرکووک نیشتەجێ بوو، گواستیەوە بۆ شارەزوور. هەروەک بڕیاردرا کە سەربازانی یەنیچەری ناوچەکە هیچ کامیان پەرتەوازە نەبن و لە چواردەوری بەگلەربەگی شارەزوور بمێننەوە، ئەگەر کەسێکیش گوێڕایەڵ نەبوو، جیاوکەکانی لێ وەربگیرێتەوە و بدرێت بە کەسانی لێهاتوو و گونجاو، خۆ ئەگەر کەسانی گونجاو نەدۆزرانەوە، ئەوا زانیاری دەربارەی بارودۆخەکە بگەیەنرێتە سەرووتر(١٣).

بە هۆی ئەو ئاوەی کە بەتەنیشت قەڵای گوڵعەنبەردا تێپەڕ دەبوو، لە ساڵی ١٥٧٠دا دیوارەکانی قەڵا زیانی بەر کەوتبوو، بۆیە وا پێویستی کردبوو بە چواردەوریدا خەندەق لێ بدرێت(١٤).

پێداویستییە سەربازییەکانی قەڵاکە بە پلەی یەکەم لەلایەن قەڵای زەڵمەوە لەئەستۆ دەگیرا، کە دوور بوو لە ئادگارە شارستانییەکان(١٥). هەر چی سەربازە، بە پلەی یەکەم لەلایەن بەغدا و پاشان حەلەب و دیاربەکرەوە بۆی دابین دەکرا. نزیکەی لە هەموو شارە عوسمانییەکانەوە سەرباز چوونەتە ئەو ناوچەیە و ئەرکی سەربازییان جێبەجێ کردووە، لەوانەش خەڵکی ئەسکەندەریە، فیلیبە، ئەرناوت، ئەڤلۆنیا، دەلڤینە، ئۆهری، یەنی شەهیر، سیرۆز، پریزرەن، ئیلباسان، سیلیڤری، میدیل... زۆری تریش(١٦). زۆربەی بەرپرسی حەسارەکانیش کە لە قەڵای گوڵعەنبەر دامەزرابوون، لەوانە پێک دەهات. گومانی تێدا نییە کە ئەمانە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە لە داهاتوودا پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی شارەزوور پێک دەهێنن. تێبینیی ئەوەش دەکرێت کە بەشێک لە قولی (جۆرێک بووە لە فەرمانبەری سەربازیی دەوڵەت – وەرگێڕ) و یەنیچەرییەکانی شارەزوور خەڵکیان چەوساندووەتەوە، بۆیە دەبینین لە ساڵی ١٥٧٣ بە هۆی چوونەدەرەوە و دەستدرێژیکردنە سەر خەڵک، ڕێوشوێنی پێویست گیراوەتە بەر بۆ مانەوەی خۆبەخش و یەنیچەری و قولییەکان لە شوێنی خۆیان و نەچوونەدەرەوەیان(١٧). بۆ نموونە؛ لە ساڵی پێشووتردا خان قولی کە لە گوڵعەنبەر بووە، چووەتە دەرەوە و خەڵکی ئازار داوە، لە بەرامبەردا ڕێوشوێنی لە دژ گیراوەتە بەر(١٨)، بڕیار دراوە کە چینی قولی لە شوێنەکانی خۆیان بمێننەوە و پەرتەوازە نەبن، یەنیچەری و ئازاپ (جۆرێک بووە لە سەرباز – وەرگێڕ) و خۆبەخشەکانیش بەنۆرە ئێشک بگرن (٢٧ی زیلحیجەی ٩٧٩ک/١١ی نیسانی ١٥٧٢)(١٩).

لە ساڵانی دواتریشدا چەند ڕووداوێک لە گوڵعەنبەر ڕوویان داوە، لەوانە: لە ڕەمەزانی ٩٨٦ک/١٥٧٨ز فەرمانێک بۆ بەگلەربەگی شارەزوور دەرچووە کە باسی هەبوونی شانزە سەنجەق بەگ لەسەر سنووری شارەزوور و ناردنی سیخوڕ لە شارەزوورەوە بۆ قەزوین دەکات. هەروەها زانیاری دراوە دەربارەی هاتنی وەرزی زستان و نیشتەجێبوونی سەربازان لەنزیک قەڵای گوڵعەنبەر بۆ بەسەربردنی زستان و فەتحکرانی شێروان و گورجستان، هەروەک فەرمان کراوە بەو سەربازانە کە ئامادە بن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان لە وەرزی بەهاردا(٢٠).

جیا لەوانەش، لە ٢٤ی ڕەبیعی یەکەمی ١٠/٩٨٦ی حوزەیرانی ١٥٧٨، نووسراو کراوە بۆ بەگلەربەگ و دەفتەرداری بەغدا، تێیدا باسی ئەوە کراوە کە بەگلەربەگی شارەزوور نامەی ناردووە



**خوسرەو پاشا بایەخێکی زۆری بە تەواوکردنی قەڵای شارەزوور (قەڵای گوڵعەنبەر) داوە. قوللە و مزگەوت و منارەکانی بە شێوەیەکی ڕێك تەواو کردووە، تۆپ و چەك و تفاق و دانەوێڵەی تێدا داناوە.**

و باسی ئەوەی کردووە کە پێویستە عەرەبانە دروست بکرێت بۆ هەڵمەتی هومایۆنی، بەڵام لە قەڵای گوڵعەنبەردا عەرەبانەچی بوونی نییە. بۆیە محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا وەک وەستای شارەزا بە پانزە ئاکچە (دراوی عوسمانی بووە - وەرگێڕ) و بە سەروەستای عەرەبانەچی، هەریەک لە کانبەر کوڕی عەبدوڵڵا و وەلی کوڕی عەبدوڵڵا بە هەشت ئاکچە، تاجی کوڕی نەزەر بە حەوت ئاکچە، ئەوانەی دیکەیان هەریەکەیان بە پێنج شەش ئاکچە دامەزراون بۆ خزمەتکردن لە بواری عەرەبانەچێتی و عەرەبانەی تۆپ، مووچەکەشیان لەلایەن بەغداوە بۆ دابین کراوە(٢١). لە ٢ی ڕەبیعی دووەمی ٩٨٦/ ١٨ی حوزەیرانی ١٥٧٨دا فەرمانێکی تر نێردراوە بۆ بەگلەربەگی شارەزوور و بە هەمان شێوە باس لەوە کراوە کە عەرەبانەچی لە قەڵای گوڵعەنبەر بوونی نییە لە کاتێکدا پێویستترین شت عەرەبانەچیی تۆپە. بۆیە ئەو کەسانەی لە سەرەوە ناویان هێنرا، وەک کەسانی شارەزا لەو بوارەدا دامەزراون و ئەمری شەریفیش بۆ بەگلەربەگی بەغدا نێردراوە تا مووچەکانیان لەلایەن خەزێنەی بەغداوە بۆ دابین بکرێت(٢٢).

لە ساڵی ٩٩٣ک/١٥٨٥ز لە فەرمانێکی نووسراودا بۆ بەغدا باس لەوە کراوە کە مووچەی کەتخودا و سەربازانی تیماری قەڵای گوڵعەنبەر هەر لە سەرەتاوە لەلایەن کەرتی بەغداوە دابین کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە باجی ئەو ناوچانە دراوە کە وەرگرتنیان بەزەحمەت بووە، تووشی کێشە و گرفت بووە، بە هۆی نامەی بەگلەربەگی شارەزوور (حەسەن)ەوە بڕیار دراوە مووچەکان لەلایەن هەمان ئەو شوێنەوە دابین بکرێت کە پێشتر دابینی کردووە(٢٣).

دوای ئەوەی شا عەبباس ئەو قەڵایە دەڕووخێنێ، تەنها چەند قوللەیەک و چەند سەنگەرێکی دەورەدراو بە ڕووبار و چەند پارچە دیوارێک ماوەتەوە، بەڵام لە کاتی هەڵمەتەکەی خوسرەو پاشا بۆ سەر ئێران (١٠٣٩ک/١٦٣٠ز) دووبارە دروستکراوەتەوە(٢٤). هەر لەکاتی ئەو هەڵمەتەدا (١٦٢٩-١٦٣١)، ڕاوێژکارەکانی خوسرەو پاشا پێداگرییان لەسەر ئەوە کردووە کە لە کۆتایی زستان و سەرەتای بەهاردا ڕووبارە گەورەکان هەڵدەقوڵێن، ئەوەش وا دەکات گەشتنە بەغدا و گەمارۆدانی مومکین نەبێت(٢٥)، بە هۆی ئەوەی ئاویش لە دەوروبەری بەغدا هەستابوو، هیچ سوودێک لەوێ نەدەبینرا، بۆیە سوپاکە ڕەوانەی شارەزوور کراوە بۆ لێدان لە حاکمی شارەبان و ئەردەڵان (ئەحمەد خان)، کە هەڕەشە بوو بۆ سەر سوپاکە. قەڵای گوڵعەنبەریش نۆژەن کرایەوە و سەربازی لێ دانرا. ئەم قەڵایە کرایە مەڵبەندی بەگلەربەگی شارەزوور و مستەفا پاشای ئەرناوتی بە والی لێ دامەزرێنرا(٢٦). «هامەر» دەربارەی ڕووخاندن و دووبارە بنیاتنانەوەی ئەو قەڵایە دەڵێت: نزیکەی بیست ساڵ لەمەوبەر -نزیکەی ساڵی ١٦١٠- لەو قەڵایەی کە شا عەبباس ڕووخاندی، تا ئێستاش چەند قوللە و پارچە دیوارێک بە درێژایی ئەو ڕووبارە ماون کە دیوی دەرەوەی قەڵاکەی بەهێز کردبوو. پاشان ئەنجومەنێک کۆ بوونەوە بۆ



**لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ دا قەڵای گوڵعەنبەر ببووبە وێرانەیەك، سەرباری ئەوەش لە مزگەوتەکەی گوندی گوڵعەنبەردا هێشتا پەرستش و خوێندن هەبووە، بەپێی گێڕانەوەکان مزگەوتەکە لەلایەن سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە دروستکراوە.**

ڕاوێژکردن دەربارەی توندوتۆڵکردنەوەی ناوچەکە. لە ئەنجامی ڕاوێژ، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە: ئەگەر دروستکردنی قەڵاکە لەو شوێنەدا سوودی نەبووایە، سوڵتان سلێمان دروستی نەدەکرد، خۆ ئەگەر مەترسییەکی گەورەش نەبووبێت بۆ سەر دوژمن، شا عەبباس نەیدەڕووخاند، بۆیە بڕیاریان دا دووبارە قەڵاکە دروست بکەنەوە و لە ماوەی حەوت هەفتە کارەکانی تەواو کرا (٢٣ی ڕەمەزانی ١٠٣٩/٦ی مایسی ١٦٣٠)(٢٧). لە مێژووی «پەچەڤی»شدا قەڵاکە بە ناوی «گوڵی ئەحمەر» ناو براوە و بە مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوور ناسێنراوە. هەروەها باسی لەوە کردووە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر قەڵاکە بەتەواوی ڕووخاوە و بووەتە لانەی قەلەڕەش و کوندەپەپوو، بەڵام دوای ماوەیەک دووبارە قەڵاکە دروست کراوەتەوە و لە ماوەیەکی کەمدا کارەکانی تەواو کراوە(٢٨). «ناعیمە« ناوی قەڵاکەی بە «کەلگیری» بردووە، کە لە دروستکردنی ئەو شوێنەدا بەگ و بەگلەربەگ و گەورە و بچووک کاریان کردووە و خۆیان لە قوڕ ناوە. ئەوەی لە ژیانیدا بەردێکی لەسەر بەردێکی تر دانەنابوو، لە ترسی سەرداری ئەکرەم بەناچاری کاری کردووە. بۆیە بنیاتێکی خوار و خێچی هەبووە و دوای بارانبارین؛ دووبارە دەڕووخایەوە، تا تەواوکردنی قەڵاکە لەنێو ئەو ناخۆشی و زەحمەتییەدا بوون(٢٩).

خودی خوسرەو پاشا بایەخێکی زۆری بە تەواوکردنی قەڵای شارەزوور (قەڵای گوڵعەنبەر) داوە. قوللە و مزگەوت و منارەکانی بە شێوەیەکی ڕێک تەواو کردووە، تۆپ و چەک و تفاق و دانەوێڵەی تێدا داناوە، بە ئەندازەی پێویست ئێشکگر و پاسەوانیشی بۆ دابین کردووە(٣٠).

### ئاوەدانکردنەوەی گوڵعەنبەر و زەڵم:

یەکێک لە سیاسەتە گرنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی دوای کۆنترۆڵکردنی هەر ناوچەیەک، بریتی بوو لە «ئیستیمالەت» بەرامبەر خەڵکی ناوچەکە، کە بریتی بوو لە چاودێریکردنی خەڵک و بەباشی ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکی ناوچە کۆنترۆڵکراوەکە و پەیڕەوکردنی سیاسەتی لێبوردەیی لە بوارەکانی وەک ئاییني و ئابووری بەرامبەریان(٣١). لەکاتی کۆنترۆڵکردنی شارەزووریش، ئەو سیاسەتە لەبەرچاو گیراوە.

لەدوای کۆنترۆڵکردنی، هیچ کەسێک لە خەڵکی ناوچەکە لەو شوێنە نەمابوون، بەشێکیان چووبوونە «سێرهای» و بەشێکی تریان ڕوویان کردبوویە ناوچەی سنووریی «کزڵباش»(٣٢). بەڵام بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارەزوور، خێرا کاری پێویست ئەنجام درا. ئەو کاتە قەڵای زەڵم و دەوروبەری وەک مەڵبەندی شارەزوور تەماشا کراوە. ئەمیر خانی بەگزادە و خاوەنی هۆزی «سارەڵو» لە دەوروبەری قەڵای زەڵم خانووگەلێکی دروست کردووە، ئەمەش لەلایەن موراد بەگەوە بە ناوەندی دەسەڵات ڕاگەیەنراوە، سەرەنجام فەرمان بە بەگلەربەگی بەغدا کراوە کە لە زەوییە چۆڵ و ناوچە ڕووخاوەکان؛ تیماری پێ بدرێت(٣٣)، بەوەش «شاسوار سارەڵو»، «بێرک»

و «عەلی» و کەسانی تر لە بەگزادەکانی سارەڵو بە هۆی کارکردنیان لە بواری ئاوەدانکردنەوە و کشتوکاڵ، دەوروبەری قەڵای زەڵمیان بە تیمار پێ دراوە (٢٣ی سەفەری ٩٦٢ک/١٧ی کانوونی دووەمی ١٥٥٥ز)(٣٤). بە هەمان شێوە میرعەت بەگ لە نۆکەرانی بەگی تەکیە، کە لەگەڵ هۆزەکەی لەو ناوچەیەدا خەریکی ئاوەدانکردنەوە بوون، ١٠ هەزار تیماری ئاکچەی پێ دراوە. «بۆبان»ی کەتخودای بەگی تەکیەش کە لە کۆنترۆڵکردنی دەوروبەری قەڵای زەڵم رۆڵێکی گرنگی هەبووە و لە کەرکووکیش موتەسەڕیفی ٢٠ هەزار ئاکچەی تیمار بوو، ١٠ هەزار ئاکچەی پێ دراوە. بە هەمان شێوە «ئەڵڵا کوڵو»ی کەتخودای بەگی تەکیە کە چووبوویە دەوروبەری زەڵم و رۆڵی هەبوو لە ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە، ٢٠ هەزار ئاکچەی پێ دراوە (٢٣ی سەفەر ٩٦٢ک/١٧ی کانوونی دووەمی ١٥٥٥ز)(٣٥). ئەو کەسانەشی کە لە ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەدا رۆڵیان هەبووە، وەک خەڵاتێک لە باجی کشتوکاڵی بەخشراون (٢٣ی سەفەر ٩٦٢ک/١٧ی کانوونی دووەمی ١٥٥٥ز)(٣٦).

لەگەڵ ئەوەی کە کاروبارە گرنگەکان لەلایەن بەگە دامەزراوەکانی شارەزوورەوە ئەنجام دەدرا، لەلایەن بەگلەربەگی بەغداشەوە یارمەتی دابین دەکرا بۆ ناوچەی شارەزوور کە تازە کۆنترۆڵ کرابوو. بۆ جێگیرکردنی پاسەوان لە قەڵاکانی شارەزوور و نۆژەنکردنەوەی ئەوانەی کە پێویست بوون، بەغدا هەڵدەستا بە ئەرک سپاردن بە کەسانی تایبەت (٩ی رەبیعی یەکەمی ٩٦٧ک/٩ی کانوونی یەکەمی ١٥٥٩ز)(٣٧). بەڵام بەگی شارەزوور بە شاهیدیی «زاهید بەگ» سەنجەق بەگی زەنگاباد، نامەی بۆ وەلی بەگ ناردووە و باسی لەوە کردووە کە: بە هۆی نەهاتنی مووچەوە، سەربازانی قەڵای گوڵعەنبەر پەرتەوازە بوون و ژمارەیان لە ١٦١ سەربازەوە کەم بووەتەوە بۆ ٩٩ سەرباز. هەر چی قەڵای ناوەوەیە کە ١٠٠ سەربازی تێدا بوو، تەنها ٦٧ سەربازیان ماونەتەوە و لە قەڵاکەدا یەک دڵۆپە ئاو نەماوە. بە هەمان شێوە قەڵای زەڵمیش هەمان کێشەی هەبووە. بۆیە لە ئەگەری هەر هێرشێکدا، ناتوانرێت بە ئەندازەی پێویست بەرگری بکرێت و دانەوێڵەش تیایاندا نەماوە. لەبەر ئەوە بەگی شارەزوور دۆخەکەی بە مەترسیدار داناوە و داوای لە وەلی بەگ کردووە خێرا گەنمەشامی کۆ بکرێتەوە و کێشەی سەربازان چارەسەر بکرێت. بۆ ئەمەش داوا لە بەگلەربەگی بەغدا کراوە فەرمانی پێویست دەربکات(٣٨). ئەوەش وای کردووە بە فەرمانێکی توند داوا لە بەگلەربگی بەغدا بکرێت کە دووبارە و بەخێرایی قەڵاکانی شارەزوور -مەبەست لێی قەڵای زەڵم بووە- و گوڵعەنبەر نۆژەن بکرێنەوە و ئەوەندەی لە دەست دێت دانەوێڵەی بۆ دابین بکرێت، بەپێچەوانەوە هیچ پاساوێک قبووڵ ناکرێت و بەتوندییش سزا دەدرێت. پرسیاریش لە «زاهید بەی» سەنجەق بەگی زەنگاباد کراوە دەربارەی راستی و دروستیی وێرانبوونی ئەو قەڵایانە و دۆخی سەرباز و دانەوێڵە تێیدا و داوای لێ کراوە زانیاریی زیاتریان پێ بدات (١٤ی رەبیعی یەکەمی ٩٦٧ک/ ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٥٥٩ز) (٣٩). سەرباری بەگلەربەگی بەغدا، بەگلەربەگی دیاربەکر و حەلەبیش بە پارە و سەرباز یارمەتیی شارەزووریان داوە (٦ی موحەڕەمی ٩٧٢ک/١٤ی ئابی ١٥٦٤ز)(٤٠).

## قەڵای زەڵم (ظالم قلعه):

قەڵای زەڵم وەک مەڵبەندی شارەزوور بووە و زۆر جاریش بە ناوی قەڵای شارەزوور (شەهریزۆل) ناوی هاتووە(٤١).

شارەزوور لە هەموو سەردەمەکاندا یەک دانە پایتەختی نەبووە، بەڵام لە کاتی شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا لەپاڵ ئەمیرەکانی لیواکە، قەڵای زوڵم هەبوو کە تورکەکان بە قەڵای «زاڵم» ناویان بردووە و لە شەڕ و گەمارۆکاندا ئەو ناوەیان

بەکار هێناوە، بەڵام وەک ناوی لیوا بوونی نەبووە. هەندێ جاریش بە شێوەی زوڵم (ظلم) نووسراوە. ئەو ناوەش ناوێکی کۆنە، کە وەک ناوی چیاکە بە شێوەی «جبل زلم» بەکار هاتووە. شارەکەش هەر بە ناوی ئەمەوە دەناسرێت. لە ئێستادا لەو ناوچەیە هیچ شارێک بوونی نییە بەو ناوەوە، لەنزیک ئەو شوێنە؛ «ئەحمەد ئاوا» و «خورماڵ» هەن(٤٢).

ئەو قەڵایە کە لەسەر تاشەبەردێکی ڕێک لەبەردەم ئەشکەوتی «ئەزرەق جادو» بنیات نرابوو، لە سەردەمی سوڵتان سلێمان زۆر بەزەحمەت کۆنترۆڵ کراوە(٤٣). هەر لە سەرەتای ساڵانی چوونە ژێر دەستی عوسمانی، نۆژەنکاریی پێویستی بۆ کراوە. بەڵام دواتر بەپێی فەرمانێکی نێردراو لە (٢٥ی حوزەیرانی ١٥٧١ز)، بە هۆی هەبوونی سەربازانی خۆبەخش و یەنیچەری و ئازاپ لە قەڵای گوڵعەنبەر و نەبوونی تۆپخانە لەو شوێنە و دووربوونی قەڵای زەڵم لە ئاوەدانی و نەچوونی هیچ کەسێک بۆ ئەوێ، تۆپخانەکەی زەڵم گوازراوەتەوە بۆ قەڵای گوڵعەنبەر(٤٤). بۆیە بە تێپەڕبوونی کات، قەڵای زەڵم چۆڵ بووە و لە شوێنی ئەودا قەڵای گوڵعەنبەر بووەتە مەڵبەند. لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی وەسفی «ئەولیا چەلەبی»، لە دەوروبەری ساڵی ١٠٦٥ک/١٦٥٥ز، «قەڵای زەڵمی بەرز»: خاوەن مزگەوت و خان و حەمام و بازاڕە، چواردەورەکەی شاخاوییە، باخ و باخچە و ئاوی ڕۆشنی هەیە و قەڵایەکی قوڕینە(٤٥).

لە نووسراوێکدا کە مێژووەکەی بۆ ٢٩ی جەمادی یەکەمی ٩٨٦ک/٣ی ئابی ١٥٧٨ز دەگەڕێتەوە، باس لەوە کراوە کە قەڵای زەڵم و پشتەوەی؛ تەنها چل سەربازی پیادەی سادەی هەیە، بۆیە بڕیار دراوە ١٨ سەربازی تیمار کە دوای ڕووخانی قەڵای «نەهران» ماونەتەوە، بنێردرێنە دەوروبەری قەڵای زەڵم(٤٦).

قەڵای زەڵم لە کاتی هەڵمەتەکەی خوسرەو پاشادا بۆ سەر ئێران (١٠٣٩ک/١٦٣٠ز)، دووبارە کۆنترۆڵ کراوەتەوە، بەڵام دواتر کەوتووەتەوە ژێر دەسەڵاتی ئێرانییەکان(٤٧).

قەڵای زەڵم بە «قەڵای زوڵم»یش ناوی براوە، قەڵاکە لەنێو دۆڵێکی زۆر سەخت و تەسکدا بنیات نراوە. لەناوەڕاستی سەدەی ١٩دا لە شێوەی وێرانەیەک شوێنەوارەکەی بینراوە. لە دۆڵی قەڵای زەڵمەوە، ئاوێکی ڕوون و سارد هەڵدەقوڵێت، لە گوندی گوڵعەنبەر و دەشتی شارەزوور ناوی تاجرود (مەبەستی تانجەرۆیە – وەرگێڕ) هەڵدەگرێت و لە کۆتایی ناوچەی شەمێراندا دەڕژێتە ڕووباری سیروانەوە(٤٨).

لە کۆتایی ئەو دۆڵەی کە لە قەڵای گوڵعەنبەردا باسمان کرد، لەنێوان شاخەکاندا گەروویەک هەیە کە بە «ئێزراکجاز» و خانووبەرە و ئەشکەوتی «خاڵتی کەلام» بە واتای دەنگی تێکەڵ ناسراوە کە لە بەردەمیدا و لەسەر ئاوێک لەنێوان شاخ و چیای بەرزدا قەڵایەک هەیە کە لەسەر تاشەبەردێکی بەرز بنیات نراوە، بەو شوێنە دەڵێن «قەڵای زەڵمی بەرز». لەنێوان قەڵای زەڵم و گوڵعەنبەر، لەنێو دۆڵەکەدا لە شوێنێکدا کە پێی دەڵێن «قەڵای چەرخی زەڵم»، لەناو قەدی شوێنێکی سەخت و بەرز ئەشکەوتێکی ڕاست هەیە کە لە خوارەوە بەردیان تاشیوە و بڕیویانە و پلیکانەیان بۆ دروست کردووە، لە چەند شوێنێکیش پەنجەرەیان بۆ کردووەتەوە و ڕووناکیی لێ نابینرێ. شاخەکەش ئەوەندە تیژە کە لوتکەکەی لە ئاسماندا ون بووە. لەبەرامبەر ئەو ئەشکەوتەش، چیایەکی تر هەیە کە لەوێدا قەڵای وێرانبووی یەزدەگورد هەیە. لەسەروو ئەم دوو شاخەوە، ئاوێک دێتە دەر و بە ناوچەی شارەزووردا تێپەڕ دەبێت، ڕووباری شارەزوور لە دەمی ئەم دۆڵەوە سەرچاوە دەگرێت(٤٩).

جگە لەوانەی لە سەرەوە باس کران، لە هەردوو بەری دۆڵی قەڵای زەڵمدا ژمارەیەکی زۆر وێرانە دەبینرێت کە کیسراکانی ئێران بنیاتیان ناوە، لەنێو

ئەو شوێنەوارانەدا ئەشکەوتێکی سروشتی هەیە کە چەند پەنجەرەیەکی بۆ کراوەتەوە، هەروەک لە چیای شەمێرانیشدا شوێنەواری قەڵایەکی کۆنی قایم هەیە(٥٠).

قەڵای زەڵم لە سەردەمی یاڤوز سوڵتان سەلیم خان لە ساڵی ٩٢١ک/١٥١٥ز لەلایەن خانێکی شا ئیسماعیل بە ناوی «زاڵم عالی» دروست کراوە، لەسەر تەختاییەکی فراوان کە هەردوو لای بە دار داپۆشرابوو لە شێوەی سەرایەکی قایمدا دروست کراوە، بەڵام کاتێک سوڵتان سەلیم و سوڵتان سلێمانی قانوونی بەچڕوپڕی هێرشیان کردووەتە سەر سەفەوییەکان، ئەم قەڵای زاڵم عالیە؛ سەراکەی، دیوارەکانی قەڵا، قووللەکان و خەندەقەکانی بە شێوەیەکی قایمتر بنیات نراوە. کاتێک سوڵتان سلێمان لە ساڵی ٩٤١ک/١٥٣٤ز لە کۆنترۆڵکردنی بەغدا دەگەڕێتەوە، عوسمان پاشا بە ٥٠ هەزار سەربازەوە دەنێرێتە سەر ئەو قەڵایە، بەڵام عوسمان پاشا لەو شوێنە شەهید دەکرێت(٥١).

لە کاتی هێرشی سەر نەخچەوان(٥٢) لە ساڵی ٩٦٠ک/١٥٥٢-١٥٥٣ز، دوای ئەوەی بەڵتەجی محەمەد پاشا دەگاتە قەڵای زەڵم، سەرۆکهۆزەکانی ناوچەکە کلیلی قەڵاکەی ڕادەست دەکەن و وابەستەیی خۆیان بە دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕادەگەیەنن. بەم شێوەیە بەڵتەجی محەمەد پاشا ژمارەیەک پاسەوان لە ناوچەکە دادەنێت و وەلی بەگ بۆ بەڕێوەبردنی دادەمەزرێنێت. دوای گەڕانەوەی سوپای هومایۆنی لە هەڵمەتی نەخچەوان، موراد پاشا لە شارەزوور دادەمەزرێت(٥٣)، بەو شێوەیە قەڵای زەڵم لەلایەن سوپای عوسمانییەوە لە کاتی ئەو هەڵمەتەدا کۆنترۆڵ کراوە.

کاتێ سوڵتان سلێمانی قانوونی بۆ هێرشی نەخچەوان ڕۆیشت، بۆ دەستبەسەرداگرتنی قەڵای شەهریزۆڵ یان شارەزوور کە لەژێر دەستی میرە کوردەکانی پاشکۆی ئێراندا بوو لەگەڵ ناوچەی کەرکووک، عوسمان پاشای والیی بەغدای ڕاسپاردووە. لەسەر فەرمانی سوڵتان سلێمان، عوسمان پاشا بە درێژایی ڕووباری کەرکووک-دیالە ڕۆیشتووە تا گەشتووەتە شارەزوور. فەرمانڕەوای ناوچەکەش؛ سورخاب بەگی میری ئەردەڵان، کە دوای مردنی بێگە بەگ دەسەڵاتی ناوچەکەی وەرگرتبوو، خۆی لە قەڵای زەڵم قایم کردووە و نوێنەری ناردووەتە لای شا بۆ داواکردنی یارمەتی. شا تەهماسپیش قۆڵێکی سوپای بە سەرۆکایەتیی (ئیبراهیم میرزا، بەدر خان، ئەمیر غەیب بەگ) ناردووەتە ناوچەکە و عوسمان پاشایان ناچار بە پاشەکشە کردووە(٥٤). لەدوای مردنی عوسمان پاشاش، ناوچەی کەرکووک و قەڵای زەڵم لەلایەن بەڵتەجی محەمەد پاشای والیی بەغدا گەمارۆ دراوە، لە ئەنجامدا فەرماندەی سەفەوی-کزڵباش، «سورخاب بەگ» لە شەوێکدا هەڵدێت و قەڵاکە و قەڵاکانی دەوروبەریشی دەکەونە دەست والیی بەغدا (بەڵتەجی محەمەد پاشا)، هەواڵەکەش لە ڕێکەوتی ٢٢ی ئاب ١٥٥٤ز بە سوڵتان سلێمانی قانوونی کە لەو کاتەدا لە ڕێگای ئەرزەڕۆم دەبێت، دەگەیەنرێت(٥٥).

هەرچی «ئەولیا چەلەبی»یە، مێژووی کۆنترۆڵکردنی وڵاتی شارەزوور و قەڵای زەڵم بە ساڵی ٩٦٢ک/١٥٥٥ز دیاری دەکات(٥٦). ئەو قەڵایانەی تر کە لەگەڵ قەڵای زەڵم کۆنترۆڵ کراون، ئەمانەن: قەڵای حاز، قەڵای نوقود، قەڵای پاسکە (پاسکی)، قەڵای شەمێران، قەڵای کارنجە(٥٧). لە مێژووی «پەچەڤی»دا ئەو ناوانە بەم جۆرەیە: هاوارا (گوندی هاواری کاکەیی نشینی نزیک هەڵەبجە - وەرگێڕ)، ناکۆت، پاسەکە، شەمیهان (شەمێران - وەرگێڕ)، فەرەنجە ناویان هاتووە(٥٨). ئینجا میری بانە (پیر محەمەد شا)، میری سەبیارە (میر یوسف)، میری قەڵای بروجە (بوداک بەگ)، میری ئۆرمان (جیهان شا بەگ)، بەپێی ڕێککەوتننامە کلیلی قەڵاکانیان ڕادەست

کردووه. بەو شێوەیە ولاتی شارەزوور بەتەواوی کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی و داوای کاربەدەستیان کردووه، بۆیە دەسەڵاتەکەی دراوە بە موراد بەگ(٥٩).

ئەگەرچی «بەیاتلی» دەڵێت: ئەو ناوچەیە بەبێ خوێن ڕژان کەوتووەتە دەست ئیدارەی عوسمانی(٦٠)، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە پێکدادانی بچووک ڕووی داوە، ئەو پێکدادانانەش لە سەروبەندی سەنجەق بەگێتیی بێگە بەگدا ڕووی داوە، بەزۆرییش لەنێوان بێگە بەگ و سوهراب بەگ بووه، دواتر لەگەڵ بەدەستهێنانی قەلای زەڵم؛ لەگەڵ سوهراب بەگ و وابەستەکانی ئێران ڕووی داوە. بەڵام ئەو ڕاستییەش هەیە کە پێش ڕوودانی ئەو پێکدادانانە، شارەزوور لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە وەک سەنجەقێک ڕاگەیەنرابوو(٦١). لەگەڵ ئەو شەڕانەشدا، فەرمانڕەوایەتیی عوسمانی لە ناوچەکەدا بەتەواوی جێگیر بووه. بە مانایەکی گشتگیر: هێرشی نەخچەوان(٦٢) یاخود بە مانایەکی وردتر: لە ئەنجامی شەڕی شارەزوور(٦٣)، ئەم ناوچەیە بەتەواوی کەوتووەتە دەست دەوڵەتی عوسمانی، وەک سەنجەقێک بە بەگلەربەگی بەغدا بەستراوەتەوە. بەگوێرەی تۆمارێک (٢٨ی شەوالی ٩٦١ک/٢٦ی ئەیلوولی ١٥٥٤ز)، بۆمان دەردەکەوێت کە موراد بەگ -وەک لە سەرەوە باس کرا- وەک میری شارەزوور نامەی ناردووه(٦٤)، لە ٢٥ی شەوالدا سەنجەقی شارەزوور دراوەتە موراد بەگ، بەگی مەنتەشە و هەواڵەکەش بە بەگلەربەگی بەغدا ڕاگەیەنراوە (ڕێکەوتی تۆمار ٢٩ی شەوالی ٩٦١ک/٢٧ی ئەیلوولی ١٥٥٤ز)(٦٥). قەلای شارەزوور و قەلاکانی تری ناوچەی شارەزووریش کۆنترۆڵ کراون. تەنانەت بەیازەدینی ئەفسەری دەرگاهی عالی کە بۆ کارێکی گرنگ چووەتە بەغدا، لە کاتی گەڕانەوەیدا هەواڵی کۆنترۆڵکردنی قەلای زەڵم و چەند قەلایەکی تری هێناوەتەوە، بە هۆیەوە تیمارەکەی بەرز کراوەتەوە بۆ پێنج هەزار ئاکچە (٣ی زیلقیعدەی ٩٦١ک/٣٠ی ئەیلوولی ١٥٥٤ز)(٦٦).

لە ڕۆژی (٢٦ی شەوالی ٩٦١ک/٤ی تشرینی یەکەمی ١٥٥٤ز)دا، میری «باجڤانلی» بەشداریی کۆنترۆڵکردنی قەلای زەڵمی نەکردووه و لە شوێنی ئەودا بەگی پێشوو؛ دلاوەر بەگ هێنراوەتە سەنجەق بەگەکە(٦٧). جگە لەوە چەند مەڵبەندێکی تری گرنگ کراونەتە سەنجەق و دراوەتە موتەسەڕیفەکانی پێشوو. بۆ نموونە میر جیهان شای موتەسەڕیفی قەلای ئوربان، ناوچەکەی خۆی پێ دەدرێتەوە دوای ئەوەی دەکرێتە سەنجەق(٦٨)، هەروەها پێگەی شەهری بازاڕیش (شارباژێڕ - وەرگێڕ) بەرز دەکرێتەوە بۆ سەنجەق و دوای مردنی ئیبراهیم بەگی باوکی، سەنجەقەکە دەدرێتەوە موتەسەڕیفی شەهر بازاڕ (هەمزە بەگ) (٦ی زیلقیعدەی ٩٦١ ک/٢ی تشرینی یەکەمی ١٥٥٤ز) (٦٩). حەسەن چاوش کە لە قەلای زەڵم خزمەتی کردووه، تیمارەکەی زیاد کراوە (٦ی زیلقیعدەی ٩٦١ک/٢ تشرینی یەکەمی ١٥٥٤ز)(٧٠). لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا قەلای زەڵم مەڵبەندی میرنشین بووه، بۆیە ڕێکەوتی کۆنترۆڵکردنی ئەو قەلایە وەک ڕێکەوتی دەستبەسەرداگرتنی شارەزوور لەلایەن عوسمانییەکانەوە قبووڵ کراوە.

ئەولیا چەلەبی گەڕیدەی تورکیش کە لە ساڵی (١٠٦٥ک/١٦٥٥ز)دا بە ناوچەکەدا تێپەڕیوە، باسی قەلای زەڵمی کردووه(٧١)، هەر چی دەشتی قەلای زەڵمی عالیە، ئەوا یەک ڕۆژ ڕێگا لە چیای «ئەڵوەند»ەوە دووره(٧٢).

## قەزای گوڵعەنبەر:

لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩دا قەلای گوڵعەنبەر ببوو بە وێرانەیەک، سەرباری ئەوەش لە مزگەوتەکەی گوندی گوڵعەنبەردا هێشتا پەرستش و خوێندن هەبووه، بەپێی گێڕانەوەکان مزگەوتەکە لەلایەن سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە دروستکراوه(٧٣).

ئەو ساڵانەی کە محەمەد خورشید پاشا وەک نوێنەری عوسمانی لەگەڵ لیژنەی دیاریکردنی سنووری عوسمانی-ئێرانی بە ناوچەکەدا گەڕاوە (١٨٤٨-١٨٥٢)، ئەیالەتی شارەزوور بریتی بووە لە شاری کەرکووک، کە کەوتبووە نێوان ئێران، بەغدا، هەکاری، ڕووباری دیجلە و موسڵ. لە قەزاکانی کەرکووک و هەولێر و سەنجەقەکانی کۆیە و سلێمانی و ڕەواندز و هەریر پێک هاتبوو. هەر چەندە لەژێر چاودێریی والییەکانی بەغداشدا بووبێت، بەڵام ئەیالەتێکی سەربەخۆ بووە. ئەو ناوچەیەش کە لەنێو ویلایەتەکەدا بە شارەزوور ناسراوە و ناوی ئەیالەتەکەش لەوەوە هاتووە، بریتی بووە لەو شوێنەی کە قەزاکانی گوڵعەنبەر و ئەڵەبجەی لەخۆگرتووە(٧٤). کاتێکیش دەگەینە سەردەمی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی، «عەلی جەواد» ناوی گوڵعەنبەر وەک قەزایەک دەهێنێت(٧٥).

لە کۆتایی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، عێراق لە سێ ویلایەتی (بەغدا، موسڵ، بەسرە) پێکهاتبوو، شارەزووریش بە موسڵ (ویلایەتی موسڵ ١٨٧٩ دروست کرا - وەرگێڕ) بەسترابووەیەوە. شارەزوور کە ماوە ماوە گۆڕانکاری بەسەر سنوورەکەیدا دەهات، لە کەرکووک و سلێمانی پێک هاتبوو. لەو سەردەمەدا شاری کەرکووک بە ناوی لیوای شارەزوور (ساڵی ١٨٩٣ ناوی لیوای شارەزوور گۆڕا بە لیوای کەرکووک - وەرگێڕ) نێوبراوە، پاشان بە ناوی لیوای کەرکووک بە شێوەیەکی سەربەخۆ جیا کراوەتەوە، واتە لە یەک کاتدا لیوای کەرکووک و لیوای سلێمانی بە شێوەی سەربەخۆ بوونیان هەبووە. قەزاکانی کەرکووکیش بریتی بوون لە: ڕەواندز، هەولێر، سەڵاحیە (کفری)، کۆیسەنجەق، ڕانیە. کارگێڕییەکەشی بە ڕێژەیەکی زۆر وابەستەی بەغدا بووە. هەر چی قەزاکانی لیوای سلێمانییە، ئەمانە بوون: گوڵعەنبەر، بازیان، شەهر بازاڕ، قەرەداغ، مەرگە، جاف. ئەو قەزایانە زۆر گۆڕاون. لیوا یەکەیەکی کارگێڕیی نوێ بووە و وابەستەی بەغدا بووە. جێی خۆیەتی کە بڵێین سلێمانی لە ساڵی ١٢٦٧ک/١٨٥٠-١٨٥١ز بووەتە لیوا(٧٦).

لە ساڵانی ١٣٣٣-١٣٣٤ک/١٩١٥-١٩١٦ز شاری سلێمانی، جگە لە قەزای ناوەند، پێک هاتبوو لە قەزاکانی: گوڵعەنبەر، مەعمورەتولحەمید، بازیان، شەهر بازاڕ. موتەسەڕیفەکەشی مەنسوور عەبدولسەمەد بەگ بووە. لە شارەکەدا قازی، موحاسیبچی، بەڕێوەبەری تەحریرات (نامەنووسی فەرمی)، موفتی، سەرۆکی سزای سەرەتایی، داواکاری گشتی، چوار نوێنەر، دوو مولازمی ئەندام، لێپرسەرەوە (محقق)، فەرماندەی فەوجی جەندرمە، فەرمانبەری دەفتەری خاقانی، فەرمانبەری ئەوقاف، بەڕێوەبەری پۆستە و تەلەگراف هەبووە(٧٧).

## دەرئەنجام

ئەو ناوچەیەی کە قەڵاکانی گوڵعەنبەر و زەڵمی لەخۆ گرتووە، دوای ئەوەی کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، شوێنێکی گرنگیان لە ئەیالەتی شارەزوور داگیر کردووە، بەتایبەتییش تا سەدەیەک دوای کۆنترۆڵکردن، قەڵاکانی گوڵعەنبەر و زەڵم مەڵبەندی بەڕێوەبردنی ئەیالەتی شارەزوور بوون. هەر چەندە دواتر کەرکووک وەک مەڵبەندی ئەیالەتەکە دێتە پێشەوە و دوو قەڵاکە سیفەتی مەڵبەندێتیی شارەزوور لەدەست دەدەن، بەڵام وەک دوو ناوچەی ئاوەدان و سەرسنوور شوێنێکی ستراتیژییان هەبووە و بەو هۆیەوە لە پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێراندا، هەموو کات بە گرنگی و بایەخەوە ماونەتەوە. ئەو دوو قەڵایە ناوبەناو نۆژەن کراونەتەوە و بە تێپەڕبوونی کاتیش نەماون. لە سەردەمی ئێستادا ئەو دوو قەڵایە هیچ ناوچەیەکی بەڕێوەبردن پێک ناهێنن (وێرانبوون)، بەڵام ئەوەی دەزانرێ ئەوەیە، کە شوێنەکەیان دەکەوێتە نزیک هەڵەبجە و خورماڵ و ئەحمەدئاوا.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


(1) el-Hamevî, 1957, C. 3, s. 375.

(2 )Kâtip Çelebi, 2009, s. 445, Mehmet Hurşit Paşa, s. 179, Şerafeddin Han, 2009, C. 1, s. 123, Ali Cevad, C. 2 s. 487,488.

(3) Kâtip Çelebi, s. 445.

(4) Kâtip Çelebi, s. 445.

(5) BOA, MHM 2, h.224.

(6) BOA, MHM 2, h.2024.

(7) Mehmet Hurşit Paşa, s. 169.

(8) BOA, MHM 6, h.1321.

(9) BOA, MHM 6, h.1460.

(10) BOA, MHM 6, h.1242.

(11) BOA, MHM 7, h.268.

(12) BOA, MHM 7, h.319.

(13) BOA, MHM 7, h.2333.

(14) BOA, MHM 14, h.675.

(15) BOA, MHM 14, h.69.

(16) BOA, MHM 6, h.129.

(17) BOA, MHM 22, h.666.

(18) BOA, MHM 23, h.557.

(19) BOA, MHM 16, h.415.

(20) BOA, MHM 32, h.469.

(21) BOA, MHM 34, h.600.

(22) BOA, MHM 34, h.611.

(23) BOA, MHM 53, h.574.

(24) Hammer, 1335, C.9, s. 113.

(25) Naîmâ 2007, C. 2, s. 652.

(26) Uzunçarşılı, C. III, s. 168-169.

(27) Hammer, 1335 C. 9, s. 113.

(28) Peçevi, C. II, s. 386.

(29) Naîmâ 2007, C. 2, s. 656.

(30) Naîmâ, 2007, C. 2, s. 661.

(31) Mücteba İlgürel, C. 23, s. 362.

(32) BOA, MHM 1, h.1121.

(33) BOA, MHM 1, h.1117.

(34) BOA, MHM 1, h.1121,1126,1128.

(35) BOA, MHM 1 , h.1119,1120,1122.

(36) BOA, MHM 1, h.1123.

(37) BOA, MHM 3, h.605.

(38) BOA, MHM 3, h.617.

(39) BOA, MHM 3, h.618,619.

(40) BOA, MHM 6, h.12,13.

(41) BOA, MHM 6, h.12, 13.

(42) Abbas el-Azzâvî, Şehrizor es-Süleymaniye (el-Livâ’ ve’l-Medîne), s. 162.

(43) Hammer, 1335 C.9, s. 113.

(44) BOA, MHM 10, h.102, 14/69.

(45) Eyliyâ Çelebi, 2001, C. 4, s. 302.

(46) BOA, MHM 35, h.277.

(47) Eyliyâ Çelebi, 2001, C. 4, s. 348.

(48) Mehmet Hurşit Paşa, s. 179-180.

(49) Kâtip Çelebi, s. 446; Naîmâ, 2007, C. 2, s. 655; Hammer, 1335 C. 9, s.11; Şerafeddin Han, 2009, C. 1, s. 123-124.

(50) Mehmet Hurşit Paşa, s. 180.

(51) Eyliyâ Çelebi, 2001, C. 4, s. 302.

(52) Parmaksızoğlu, 1973, s. 225.

(53) Bayatlı, s. 44; Parmaksızoğlu, 1973, s. 195.

(54) Kılıç, 2006, s. 320.

(55) Kılıç, 2006, s. 342, Solakzade s. 530-531, Peçevi, C. I, s. 231.

(56) Eyliyâ Çelebi, C. 1, 2006, s. 95.

(57) Solakzade, h. 1298, s. 530.

(58) Peçevi, C. I, s. 231.

(59) Solakzade, h. 1298, s. 531.

(60) Bayatlı, s. 44.

(61) Parmaksızoğlu, s. 220.

(62) Parmaksızoğlu, s. 225.

(63) BOA, MHM 1, h.1385, MHM 2, h.1643.

(64) BOA, MHM 1, h.267.

(65) BOA, MHM 1 , h.298.

(66) BOA, MHM 1, h.358.

(67) BOA, MHM 1, h.396.

(68) BOA, MHM 1 , h.397.

(69) BOA, MHM 1 , h.398.

(70) BOA, MHM 1 , h.364,380.

(71) Eyliyâ Çelebi, C. 4, s. 169.

(72) Eyliyâ Çelebi, C. 4, s. 211.

(73) Mehmet Hurşit Paşa, s. 179.

(74) Mehmet Hurşit Paşa, s. 178.

(75) Ali Cevad, C. 2, s. 487, 488.

(76) Abbas el-Azzâvî, 1955, C. 7, s. 168-169.

(77) Salnâme-i Devlet, 1334, s. 701-702.

# لیستی سەرچاوەکان

## ١- بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی عوسمانی:


Mühimme Defteri 1, Hüküm 267, 298, 358, 364, 380, 396, 397, 398, 1117, 1119,
1120, 1121, 1122, 1123, 1126, 1128, 1385
Mühimme Defteri 2, Hüküm 224, 1643, 2024
Mühimme Defteri 3, Hüküm 605, 617, 618, 619
Mühimme Defteri 6, Hüküm 12, 13, 129, 1 242, 1321, 1460
Mühimme Defteri 7, Hüküm 268, 319, 2333
Mühimme Defteri 10, Hüküm 102
Mühimme Defteri 14, Hüküm 69, 675
Mühimme Defteri 16, Hüküm 415
Mühimme Defteri 22, Hüküm 666
Mühimme Defteri 23, Hüküm 557
Mühimme Defteri 32, Hüküm 469
Mühimme Defteri 34, Hüküm 600, 611
Mühimme Defteri 35, Hüküm 277
Mühimme Defteri 53, Hüküm 574


## ٢- کتێب و توێژینەوەکان:


Abbas el-Azzâvî, Târîhu'l-Irâk Beyne'l-İhtilâleyn, Bağdat, 1955, C. 7, s. 168-169
Abbas el-Azzâvî, Şehrizor es-Süleymaniye (el-Livâ' ve'l-Medîne), Bağdat, 1420
(2000m.)
Ali Cevad, Memâlik-i Osmâniye'nin Tarih ve Coğrafya Lügatı, C. 2
Eyliyâ Çelebi, Evliyâ Çelebi Seyahatnamesi, Haz. Yücel Dağlı, Seyit Ali
Kahraman, C. 4, YKY, İstanbul, 2001
Hammer, Devlet-i Osmâniye Tarihi, Mütercimi Muhammed Ata, İstanbul, 1335, C. 9
İsmail Hakkı Uzunçarşılı, Osmanlı Tarihi, TTK yayınları, Ankara, C. 3
İsmet Parmaksızoğlu; "Kuzey Irak'ta Osmanlı Hakimiyetinin Kuruluşu ve Memun
Bey'in Hatıraları"; Belleten, C.37. s. 200-201, Ankara, 1973
Kâtip Çelebi, Kitâb-ı Cihannümâ, TTK, Tıpkıbasım, Ankara, 2009
Mehmet Hurşit Paşa, Seyahatname-i Hudut, Çev. Alâattin Eser, Simurg Yayınevi,
İstanbul, 1997
Şerafeddin Han, Şerefname, Çev. Celâl Kabadayı, Yaba Yayınları, İstanbul, 2009, C. 1
Müctebâ İlgürel, İstimâlet; TDV. İslam Ansiklopedisi, C. 23, İstanbul, 2001
Naîmâ Mustafa Efendi, Târih-i Na'îmâ (Ravzatü'l-Hüseyn fî Hulâsati Ahbâri'lHâfikayn), Çev. Mehmet İPŞİRLİ, Türk Tarih Kurumu, C. 2, Ankara, 2007
Nilüfer Bayatlı; "Kuzey Irak'ta Şehrizor (Süleymaniye) ve Osmanlı Hakimiyeti";
Türk Dünyası Tarih Dergisi, Sayı 205
Peçevî İbrahim Efendi, Peçevî Tarihi, Haz. Prof. Dr. Bekir Sıtkı Baykal, Kültür
Bakanlığı, C. I, Ankara, 1992
Peçevi İbrahim Efendi, Peçevi Tarihi, Haz. Bekir Sıtkı Baykal, Kültür ve Turizm
Bakanlığı Yayınları, C. II, İstanbul, 1981,
Remzi Kılıç; Kanuni Devri Osmanlı-İran Münasebetleri (1520-1566), IQ Kültür
Sanat Yayıncılık, İstanbul, 2006
Salnâme-i Devlet-i Aliyye-i Osmâniye 1333-1334, 68. Sene, Dersaâdet, 1334
Solakzade Mehmed Hemdemi Çelebi, Solakzade Tarihi, Mahmut Bey Matbaası,
İstanbul, h. 1298 (1880 m.)
Yâkut el-Hamevî, Mu'cemu'l-Buldân, Dâru Sâdır ve Dâru Beyrut, Beyrut, 1957, C. 3

# شار و شارنشینی

## لە سەردەمی زێڕینی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا






**کامیل حەبیب**

لەدایکبووی ١٩٨٣، بازیان، ماستەر لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست(شار و شارستانییەت)/ زانکۆی سلێمانی.

لێرەدا مەبەستمانە شێوازی شار و شارنشینی لە مێژووی چەندان سەدە لەمەوپێشدا ڕوون بکەینەوە، چونکە کەم نین ئەو کەسانەی وابیردەکەنەوە کە یەکەی شار لە کۆندا نەبووە و گوندەکان ئەو جێگەیەیان پڕکردۆتەوە، ئەگەرچی کەسانێکی زۆر هەن، پێیانوایە شارەکان لە مێژوویەکی زۆر دێرینەوە بوونیان هەبووە، ئەمە هەڵبەت ئەگەر لە ڕووی زانستییەوە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین، بەباشی بۆمان دەردەکەوێت شارەکان لە ڕابردوودا بوونیان هەبووە، بەڵام ئەوەی کە شێوازیان چۆن بووە؟ پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە.

لە سەرچاوە مێژووییەکاندا زانیاری زۆر بەردەستن سەبارەت بە شارەکان و تاڕادەیەکیش ژیانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و زانستی شارنشینان، بەتایبەتی سەردەمی ئیسلامی، لەم قۆناغەدا چەندان گەڕیدە و جوگرافیناسی بەتوانا هەڵکەوتوون، هەروەها چەندین شاری گەورە دروستکراون، سەرەڕای ئەو شوێنەوارانەی لەو شارانە ماونەتەوە، کە لە ئێستادا دەتوانین شایەتحاڵی پێشکەوتن و تەلارسازییەکانیان بین.

## شێوازی شار

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا شارەکان لەژێر کاریگەری ئەو ئەرکەی هەیانبووە شێوەیان گۆڕاوە، واتا پێکهاتەی ئەندازەیی و کەرەستەکانی دروستکردنیان و شێوازی شەقام و کۆڵانەکانیان و پێکهاتە ناوەکییەکانیان بەپێی جۆری هەڵکەوتە جوگرافیی و سەربازییەکانی شارەکە گۆڕاوە.

پێش ئەوەی باسی شێوەی شارەکان بکەین، پێویستە بە کورتی ئاماژە بە پێکهاتە گشتییەکانی شار لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بکەین، لەڕاستیدا ئەگەر لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا پێکهاتە گشتییەکانی شارێک بریتی بێت لە کۆمەڵێک دامەزراوەی وەک شەقامە سەرەکییەکان و باڵەخانەی بەڕێوەبردنی شار ...هتد، ئەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا جیاوازە و چەندین بنەمای تر هەبوون بۆ شار، کە لە ئێستادا پێویست نین، گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:

قەڵا و شورەی شارەکان: قەڵا و شورە بەشێکی گرنگی شارەکان بوون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لە کۆندا شارەکان هەمیشە لە بەردەم مەترسییەکانی دوژمنە دەرەکییەکاندا بوون، ئەوانیش یان هێرشی نەتەوەکانی تر بوون یاخوود پەلاماردانی ئاژەڵە کێوییەکان.

ئەم پێکهاتە گرنگە بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافی شارەکە گۆڕاوە، ئەو شارانەی لە قەدپاڵی شاخەکان و لە شوێنە سەختەکاندا بوون زیاتر قەڵایان هەبووە، زۆربەی شارە کوردییەکانی ئەو سەردەمە لەم شێوازە بوون وەک شارەکانی ئامەد و ماردین و ئامێدی١، هەرچی شارەکانی نێو پێدەشت و تەختاییەکان بووە شورەی پتەو و بەرز و قایمیان هەبووە، وەک شارەکانی بەغداد و نیشابور و بەڵخ و بوخارا٢، سەبارەت بەو شارانەی لە کەنار دەریا و ڕووبارەکان بوون زیاتر پشتیان بە هەردوو شێوازەکە بەستووە، وەکو زۆربەی شارەکانی ئەوروپا بەتایبەتی قوستەنتینییە (ئەستەنبوڵی ئێستا)٣.

قەڵاکان زیاتر لە ماددەی خاوی ئەو ناوچەیە دروستکراون کە تێیدا هەڵکەوتوون، بەنمونە شاری ئامەدی باکووری کوردستان لە بەردی گەورە گەورەی داتاشراو دروستکراوە، ئەمە جگەلەوەی زۆربەی شارەکانی کوردستان لە بەرد دروستکراون٤، یاخود شاری نیشابوری هەرێمی خوراسان کە لە خشتی قوڕ دروستکراوە، هەروەها شاری هرات لە وڵاتی ئەفغانستانی ئێستا کە لە خشتی پان و گەورە و دواتر بە قوڕ سواخدراو دروستکراوە. ٥

شوێنە ئاینییەکان: لە زۆربەی شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا پەرستگاکان بوونیان هەبووە، ئەمەش بەپێی ئاینیی هەر شارێک گۆڕاوە،

لە شارەکانی جیهانی ئیسلامیدا زیاتر مزگەوت پێکهاتەیەکی سەرەکی شار بووە، لە شارە ئەوروپییەکان کڵێسەکان هەبوون. هەرچی لە مێژووی شارەکان دەڕوانین زیاتر پێگەی ئایین و پەرستگاکانمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە شارەکان لە کۆندا بەو ڕێژەیەی ئێستا گەورە نەبوون، هەربۆیە دانیشتوانی شارێک پەیڕەوی ئاینێکی دیاریکراو بوون و هەندێکجار پەیڕەوکارانی ئاینە جیاوازەکانیش جێگەیان بووەتەوە، بەنمونە شاری کوردی هەبووە لە تەنیشتی مزگەوتەوە کڵێسەیەکیش هەبووە وەک شاری دەبیل لە هەرێمی ئەرمینیای سەردەمی ئیسلامی کە دەکاتە باکووری کوردستانی ئێستا ٦.

لە شارەکانی جیهانی ئیسلامیدا مزگەوت پێگەیەکی باڵای هەبووە، بەجۆرێک وەک دڵی شار وابووە، کە بەدەوری ئەودا بازاڕەکان هەبوون و پڕ جموجۆڵترین جێگای شار بووە، ئەمەش بەهۆی نەریتە ئاینییەکانی مسوڵمانانەوە بووە، زۆرترین کات وابەستەی مزگەوت بوون، هەروەها ئایینی ئیسلامیش هانی مسوڵمانانی داوە تاوەکو دڵیان وابەستەی مزگەوت بێت٥. لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا کڵێساکان و بورجەکانیان سیما و پێکهاتەیەکی گرنگی شار بوون، کە جێگەی کۆبوونەوەی هەفتانەی مەسیحییەکان بووە٧.

بازاڕ: مامەڵەکردنی مرۆڤەکان و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیان دیاردەیەکی نێو شارەکان بووە، هەربۆیە بازاڕەکان شوێنێکی گرنگیان لەنێو شارەکاندا هەبووە، لە زۆربەی شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بازاڕی سەرەکی و هەمیشەیی لە ناوەندی شاردا بووە، چونکە بازاڕە وەرزییەکان و هەفتانەییەکان لە دەرەوەی شارەکاندا هەبوون، بازاڕ شوێنی چەندین چالاکی ئابووریی و سیاسی بووە، لە بازاڕدا کڕین و فرۆشتن کراوە، لەهەمانکاتدا جاڕی کاروبارەکانی شار و هەواڵە نوێیەکان هەر لە بازاڕدا بووە، دەتوانین بڵێین لە جێگەی دەزگا ڕاگەیاندنەکانی ئێستا بووە، تەنانەت زۆرکات مەرجی ناونانی ئاواییەک بە شار، بوونی بازاڕێکی گەورە و جاڕچی بووە٨.

لەنێو بازاڕدا سەرەڕای دوکانەکان، کاروانسەراکان و خانەکان هەبوون، کە پێکهاتەیەکی گرنگی شاری سەردەمی ئیسلامی بوون، چونکە هۆکاری گواستنەوەی کۆن کە ئاژەڵەکان بووە، پێویستی بە شوێنی ڕاگرتن و هێشتنەوەیان هەبووە بۆماوەی مانەوە، ئێمە باسی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی بەدواوە دەکەین، هەر لە بازاڕدا ئوتێل هەبووە، کە شوێنی مانەوەی ڕێبوارانی شارەکان بووە، بەتایبەتی شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی٩.

گەرماوەکان: لەنێو زۆربەی شارەکانی سەردەمی ئیسلامیدا گەرماوەکان هەبوون، ڕۆڵێکی گرنگیان لە پاراستنی پاکوخاوێنی شارنشینانیاندا هەبووە، چونکە هەموو خێزانێک لە ماڵی خۆیاندا گەرماویان نەبووە، بەپێی ئەو زانیارییانەی ماونەتەوە هەندێکجار کەسانێکی خاوەن پێگەی باڵا گەرماوی تایبەتی خۆیان هەبووە، چینی گشتی بەشێوەیەکی دیاریکراوی مانگانە یاخود ساڵانە ڕوویانکردۆتە گەرماوەکان بۆ خۆشۆردن، ئەمەش بەپێی شارەکان گۆڕاوە.

دامەزراوەی میرایەتی و بەڕێوەبردنی شار و بەندیخانە، چەند پێکهاتەیەکی کارگێریی و سیاسی شارەکان بوون، سەرجەم لایەنە سیاسیی و سەربازیی و کارگێڕییەکان لە تەلاری میرایەتی دا فەرمانداری کراون، چونکە شارەکانی سەردەمی ئیسلامی بنکەیەکی گرنگی دەسەڵاتی خیلافەت بوون. ئەمانە و چەندین پێکهاتەی دیکە لەنێو شارەکاندا هەبوون، بە هەمووان ڕۆڵی شاریان زیاتر کردووە و وەک ناوەندێکی شارستانی گرنگ گەشاندوویانەتەوە.

**شێوازی شارەکان**

ئەوەی لە سەرەوە باسکرا کورتەیەکی پێکهاتە دیارەکانی شاری سەردەمی ئیسلامی بوو، با هەندێک لە باسی وشکی زانیارییەکان دەرچین و ڕاڤەیەکی دەقە مێژووییەکان بکەین و لەو سۆنگەیەوە شێوازی شارمان بۆ دەرکەوێت، شارەکان لە سەدەکانی دوو و سێی کۆچی/ هەشت و نۆی زاینی لە گرنگی سەردەمی ئیسلامییەوە تاوەکو سەرەتای سەدەی سیانزەی کۆچی/ نۆزدەی زاینی، بەشێوەیەکی ئەوتۆ گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە، هەندێ نەشونمای دانیشتوان و گەشەی تەلارسازیی و پیشەسازی نەبێت، بەنمونە هۆکارەکانی گواستنەوە و تەلارسازی خانوبەرە و بازاڕەکان و تەلارسازی مزگەوتەکان، ئەمەش بەهۆی دواکەوتوویی جیهانی ئیسلامیی و شارستانییەتەکەی لە بارگۆڕانی پیشەسازی (١٧٧٠-١٨٧٠ز) هەڵگیرساو لە ئەوروپا، ئەگەرچی شارستانییەتی ئیسلامی خۆی خاوەنی چەندان داهێنان و پێشکەوتن بوو، بەڵام ئەو هەڵپەیەی سەرمایەداری ئەورووپی بۆ کۆکردنەوەی سامان کردیان گۆڕانکاری زۆری بەسەر شارەکانی جیهاندا هێنا.

لە سەردەمی ئیسلامیدا ڕێگا بازرگانییەکان زیندوێتییەکی شارستانیانەیان بە شارەکان بەخشیووە، ژمارەیەکی زۆری ئەو شارانەی کە دیار و بەرچاو بوون لەسەر ڕێگەی بازرگانی بوون، وەک شارەکانی نیشابور و بەڵخ و هورات و موسڵ و هەولێر تاوەکو بەغداد، لەبەرئەوە ڕێگا بازرگانییەکان بۆ شارەکان زۆر گرنگ بوون، لەهەمانکاتدا شارەکان لەژێر کاریگەری ڕێکاروانییەکاندا دەروازەکانیان دیاریکراوە و ناویان لێ نراوە، بەنمونە شاری بەغداد کە چەند دەروازەیەکی هەبووە، بەپێی ئاڕاستەی دەرگاکانی کە بەرەو چ هەرێمێک دەرچووە، ناوی ئەو هەرێمەی لێنراوە.

دوای ئەوەی ڕێگاکان چوونەتەوە سەر شارەکان، سنور و حەرەمسەرای شار دەستی پێکردووە، لێرەدا دەمانەوێت وێنەیەکی شێوەی شارمان دەستکەوێت، ئەگەرچی هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی یان جوگرافی ئەو وێنەیەمان بەڕوونی بۆ دەرناخات، بەڵام پێمانوایە کاری مێژوونووس ئەوەیە، بە هەموو بوونیی خۆیەوە هەوڵبدات بۆ دروستکردنەوەی وێنەی ڕابردوو، واتا جگەلە کاری ئاوەز و ڕاڤەی دەقەکان، هەندێک بەشداری خەیاڵ و ئەندێشەی پێویستە، بۆ گەیشتن بە وێنەی زیهنی و دواتر داڕشتنەوەی لەسەر کاغەز، ئەمەش بەوەدەبێت مێژوونووس سەردانی مەیدانی هەبێت بۆ بینینی شوێنەوارەکانی ئەو مێژووەی دەیەوێت بینوسێتەوە. لەگەڵ خوێندنەوەی تەواوی سەرچاوە بەردەستەکان بۆ چەند جارێک.

زۆرێک لە شارەکانی سەردەمی ئیسلامی شێوە بازنەیی بوون و خاوەنی چەندین شورە و دواتر قەڵا و قوللە بوون، بەنمونە شاری بەغداد کە شێوەکەی بازنەیی بووە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی شێوازی چوارگۆشە بەلاواز دانراوە، چونکە لەم شێوازەدا کاتێک خەلیفە و دەسەڵاتدار لە ناوەڕاستی شاردا نیشتەجێ بووە، بەشێکی شورەکە لە بنکەی خیلافەتەوە نزیکتر بووە، هەربۆیە شاری بەغداد کە خاوەنی دوو شورە بووە، شورەی دەرەوە و ناوەوە، شورەی ناوەوە بەرزتر بووە لە شورەی دەرەوە١٠. زۆر شاری جیهانی ئیسلامی جگەلە شورەی سەرەکی، شورەیەکی فراوان کە تاڕادەیەک بۆ دیاریکردنی سنوری شارەکە بووە، بە دەوری هەموو شارەکە و ئەو گوندانەی هەیبووە دروستکراوە، یاخود هەندێک شار ڕووبارێک یان زنجیرە شاخێک سنورەکەی بووە.

لە دوای ئەوەی سنوری شار دیاریکراوە، بەشی نیشتەجێبوونی شار دەستپێکردووە، بەگشتی زۆرینەی شارەکانی جیهانی ئیسلامی لە سێ بەش پێکهاتوون، بەشی دەرەکی شار کە پێیوتراوە (الربض) ئەم بەشە زیاتر لە سەردەمی ئیسلامیدا پەیدا بووە، ئەویش بەهۆی فراوانبوونی

شارەکانەوە بووە لە سەردەمی ئیسلامیدا، دوای بەشی دەرەکی شار، بەشی شارستان هەبووە، دوای ئەویش بەشی قەڵا یاخود کۆهندژ، بۆ هەریەکێک لەو بەشانە قەڵا و شورەی تایبەت هەبووە، بەڵام زۆربەی کات قەڵا پتەوەکە بەدەوری شارستاندا بووە و دواتر بەشی قەڵا، چونکە کەسە گرنگەکانی شار لەناو قەڵا و شارستاندا نیشتەجێ بوون، ئەوانەی لە بەشی دەرەکی شاردا نیشتەجێ بوون کەسانی گرنگ بوون بۆ شار، بەڵام دەسەڵاتدار و بازرگانەکان نەبوون و جێی نیازی دوژمن نەبوون، هەروەها دروستکردن و نۆژەنکردنەوەی قەڵا و شورەی شار تێچوویەکی زۆری هەبووە، بەشی شارستان بچوکتر بووە لە بەشی دەرەکی شار، ئاسانتر توانراوە شورەی بەهێزی بۆ بکرێت١١.

ئەگەر بتوانین بیهێنینە بەرچاوی خۆمان شارەکان کە ڕێگا بازرگانییەکان دەچوونەوە سەریان، ڕێگایەکی خۆڵ و بێ هیچ بەردرێژکردنێک، تاکە ڕێگەی کاروانییەکان بووە، دواتر شورەیەکی هێندەی باڵای کەسێک بەدەوری بەشی دەرەکی شاردا کە چەند دەروازەیەکی هەبووە، پاشان زەوی و زاری داچێنراو بە دانەوێڵە و باخ و باخاتی شار و پاشان شورەی سەرەکی شارستان کە ڕیزێک کۆڵانی تەسک و تەنگەبەر دەیگەیاندە ناوەڕاستی شار، لەوێدا بازاڕەکان و مزگەوت و خانەی میرایەتی و بەندیخانە و دامەزراوەکانی تری کارگێڕی شار هەبووە و پاشان ئەگەر هەبووبێت قەڵای شار بووە، ئەمە بۆ زۆرێک لە شێوەی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دروستە، کە لەو نێوەندەدا شارەکانی کوردستان دەگرێتەوە١٢.

سەبارەت بەسەرچاوەی ئاو و شێوەی دابەشکردنی، زیاتر لە شێوەی کارێز و جۆگەی ئاودێریدا بووە، هەندێک جار بەشێوەی تەئسیساتی بۆری بووە، کە بۆرییەکان لە قوڕ یان تەختە دروستکراون، هەندێجاریش بەشێوەی کارێز بۆ بەردەمی ماڵەکان گوازراوەتەوە، وەک نمونەی ئاوی شاری نیشابور لە هەرێمی خوراسان کە بەشێوەی کارێز و لەژێر زەوییەوە ئاوی شاخێکی سەرووی شارەکە گوازراوەتەوە بۆ ناو شارەکە و دابەشکراوە، یان ئاوی شاری مەرو لە هەمان هەرێم کە بە پشتبەستن بە لەوحی تەختە ئاوەکە دابەشکراوە.

سەبارەت بە ئاوەڕۆی شارەکان، تائێستا بەتەواوی نازانرێت چۆن بووە، چونکە بەدەگمەن زانیارییەک لەوبارەیەوە بەردەستی توێژەرانی دەکەوێت، جوگرافیناسان و مێژوونووسان بە کەمی باسیان لەو بابەتە کردووە، بەبۆچوونی کەسی ئێمە لە زۆربەی شارەکانی ئیسلامیدا و لە تەلارسازی خانووەکانیاندا زۆر بە کەمی جێگای تایبەت بە کاروباری خۆپاککردنەوە دروستکراوە، بەڵکو ئەوەی هەبووە لە ماڵەکاندا زیاتر پشت بە ژووری ئاسایی بەستراوە بۆ ئەو کارە، کەمتر گەرماوی تایبەتی ماڵان هەبووە، هەروەها پیناچێت ڕێکارەکانی پاکژی وەک سەدەکانی هەژدە و نۆزدە و تائێستا بووبێت، ئەگەرچی صابوون هەبووە و لە شارەکانی بەڵخ و نیشابوردا دروستکراوە، بەڵام هیچ زانیارییەک نییە لە بارەی بەکارهێنانی لەلایەن چینی گشتی خەڵکییەوە بۆ خۆشۆردن و دەستشۆردنی ڕۆژانە.

هەندێک زانیاری کە هەبێت دەربارەی گەرماوە گشتییەکان، زیاتر ئەوەی شارەکانە، لە شاری بەغداد خەلیفەی عەبباسی (المقتدی باالله ، ٤٦٧- ٤٨٧ک/ ١٠٧٤-١٠٩٤ز) فەرمان دەردەکان کە ئاوەڕۆی گەرماوەکان نەکرێنە ناو ڕووباری دیجلەوە، بەڵکو چاڵی گەورەیان بۆ هەڵکەنن و ئاوەڕۆ و پاشماوەی گەرماوەکان بکرێنە نێو ئەو چاڵانەوە١٣، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت لە پایتەختی خیلافەی ئیسلامیدا ڕێکارەکان بۆ ڕێکخستنی کاروباری ئاوەڕۆکان گیراوەتە بەر، کە پێدەچێت ئەم کارە لە شارەکانی تری سەردەمی ئیسلامیدا گیرابێتەبەر.

لەنێو شارەکاندا و بەتایبەتی لە بەشی دەرەکی



**لە سەردەمی ئیسلامیدا ڕێگا بازرگانییەکان زیندوێتییەکی شارستانیانەیان بە شارەکان بەخشیووە، ژمارەیەکی زۆری ئەو شارانەی کە دیار و بەرچاو بوون لەسەر ڕێگەی بازرگانی بوون.**

شاردا باخ و باخات هەبووە، شارێکی وەک بەڵخ لە هەرێمی خوراسان چواردەوری بە باخ و باخاتەکان دەورەدراوە، یان هەر شارێکی کوردی خۆمان بەنمونە شاری حولوان (سەرپێڵی زەهاو)ی ئێستا لە پارێزگای کرماشان، خاوەن باخ و باخاتێکی زۆر بووە، بە کورتی زۆربەی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی خاوەن باخات و کێڵگەی خۆیان بوون، شارێکی وەک نیشابور جار هەبووە توانیویەتی بۆماوەی چەند ساڵ پشت بە دانەوێڵە و بەرهەمی باخەکانی خۆی ببەستێت، بەهۆی ئەو ئابڵوقەیەی لە سەردەمی غەزنەوییەکاندا کراوەتە سەر شارەکە١٤.

سەبارەت بەو جیاوازییانەی لە نێوان شارەکان و گوندەکاندا هەبووە، دەتوانین بڵێین شارەکانی سەردەمی پێش بارگۆڕانی پیشەسازی لە سەرجەم جیهانی ئەوکاتەدا، شاری کلاسیکی و هاوشێوە بوون و کەرەستەکانی ژیان تێیاندا سادە و ساکار بووە، وەک هۆیەکانی گواستنەوە و ڕێوشوێنی تەندروستی و دۆخی بژێوی. ئەوەی لە گوندێک جیای دەکردنەوە گەورەییان و ژمارەی دانیشتوان و بوونی کۆمەڵێک دامەزراوەی کارگێڕیی و سیاسیی و سەربازی بووە کە لە گوندەکاندا نەبوون.

شارەکانی سەردەمی ئیسلامی خاوەنی کۆمەڵێک تایبەتمەندی بوون، لەوانە مینبەر کە شوێنی وتارە ئاینییەکان بووە لە بۆنەکاندا، هەروەها شوێنی ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی خەلیفە و دەسەڵاتداران بووە و شوێنی وتاری دەسەڵاتدارەکان بووە، هەربۆیە شارناسانی سەردەمی ئیسلامی مینبەریان بە مەرجی شاربوونی ئاواییەک داناوە، واتا شوێنێک مینبەری نەبووبێت پێیان نەوتووە شار، هەرچەندە لە سەدەکانی پێنج و شەشی کۆچی بەدواوە ئەمە گۆڕانی بەسەردا هات، زۆرێک لە گوندەکان خاوەنی مینبەر بوون و پێشیان نەوتراوە شار.

شارەکان لە کۆنەوە کۆکەرەوەی بەرهەمەکانی گوندەکان بوون و دابینکاری کەرەستە پیشەسازییەکان بوون، هەمیشە گوندەکان وابەستەی شار بوون، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە بووە، یەکێکیان ئەوەیە گوندەکان بەرهەمی زیادەی خۆیان لە شارەکان ساغکردووەتەوە، پێویستییەکانی تریان لە شارەوە دابینکردووە، کاروبارە ئایینی و سیاسیی و کارگێڕییەکانیان لە شارەکاندا مەیسەر بووە.

ئەوەی گرنگە ئەو پەیوەندییە ئابوورییەیە کە لە نێوان شارەکان و گوندەکاندا هەبووە، بەتایبەتی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی کە هەرێمەکانی عێراق و شارەزوور و هەرێمی چیاکان و هەرێمەکانی فارس و خوراسان و خوارەزم و ئەودیو ڕووبارە، بەنمونە لە هەرێمی چیادا کە زۆرینەی شارەکانی شاری کوردی بوون، شارەکان وەکو گوندێکی گەورە بوون، بەڵام ئەو پەیوەندییە ئابوورییەی لە نێوان گوندەکان و شارەکانیدا هەبووە، لە ڕووی بەرهەمی کشتوکاڵی و ساغکردنەوەی و هەناردەکردنی بۆ شار و هەرێمەکانی دیکە، وایکردووە شارەکانی ئەو هەرێمە ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕن لە ناوەندبوونیان بۆ گوندەکانی دەوروبەریان١٥.

شێوازی شارنشینی: هەموومان لەبارەی مێژووی شار و شارنشینییەوە لەخۆمان دەپرسین، ئایا ژیانی شاری وەکو ژیانی لادێیەک وابووە یان جیاواز بووە؟ چونکە ئەم پرسیارە خودی خۆی وەڵامی زۆر شت دەبارێنێ، شارنشینی



هیچ ژیارێك بەبێ بوونی شارستانیەتێكی پێشكەوتوو گەشە ناكات، ئەو شارستانیەتەش پشت بە بوونی شاری پێشكەوتوو دەبەستێت، كە تێیدا شارنشینان دەست و پەنجە لەگەڵ پێشكەوتنە جیهانییەكاندا نەرم دەكەن.

لە سەدەكانی ناوەڕاستدا و لە جیهانی ئیسلامی تاڕادەیەک جیاواز بووە لە گوندنشینی، ئەم جیاوازییەش لە چەند خاڵێكدا بووە:

١. شارنشینی ئازادی کەمتری هەبووە لە گوندنشینی، بەڵام تاڕادەیەک پارێزراوتر بووە لە کەسێکی گوندنشین، ئەمەش لەبەر ئەو پێکهاتە تەلارسازیەی شار هەیبووە، ئەو سوپایەی بۆ پاراستنی شار بەردەوام لە ئامادەباشیدا بووە، پاشان شار لەخۆگر و مۆڵگەی سەروەت و سامانی دەوڵەت و بازرگانان بووە و زیاتر پارێزگاری لێکراوە بە بەراورد بە گوندەکان، ئەمەش وایکردووە شارەکان ڕەهەندێکی سیاسیی و ئابووریی گرنگ بەخۆوە بگرن، زۆربەی کاتەکان ململانێیەکان بۆ داگیرکردنی شارەکان بووە، کاتێک شارێک داگیرکراوە ناوچەیەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا دابڕیوە.

٢. شارنشینی ژیانێکی تەواو جیاواز بووە لە ڕووی پیشە و دابینکردنی بژێویەوە، زۆربەی پیشەوەرەکان لەنێو شارەکاندا بوون، زانیاری هەیە کە لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا پیشە جۆراوجۆرەکانی وەکو نانەوایی، ئاسنگەری، خومچێتی، گۆزەگەری، مسگەری، زێڕەنگەریی و، چەندین پیشەی تری جیاواز هەبووە، ئەمە کاری ڕۆژانەی خەڵکی شار بووە، گوندنشینان زیاتر کاری کشتوکاڵ و باخداریی و ڕاوکردن و ئاژەڵداریان کردووە.

٣. ڕێژەی دانیشتوان لە شاردا و زۆرییەکەی بە بەراورد بە گوندەکان جیاوازییەکی تری نێوان ئەو دوو یەکەی نیشتەجێبوون بووە، شارەکانی جیهانی ئیسلامی و بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی خاوەن چڕییەکی باش بوون بە بەراورد بە ڕێژەی مەزەندەکراوی ئەو کاتەی مرۆڤایەتی، لە شارەکانی هەرێمی خوراساندا ڕێژەیەکی بەرچاوی دانیشتوان هەبووە، هەرچەندە داتای کەم لەبەردەستدایە، بەڵام دەتوانین وەک قیاسێک بەکاری بهێنین بۆ بەراوردکردنی شارەکانی تر، شاری بەنجهیر، کە بەقەد یەک لەسەر چواری شاری هورات بووە، خاوەنی دەهەزار پیاوی پێگەیشتوو بووە، کەواتە شاری هورات دەبێ خاوەنی چل هەزار پیاو بووبێت، کە شاری هورات هاوشانی شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی بووە، وەک موسڵ و بەغداد و بەسرە و ئامەد و دیمەشق...هتد، ئەگەر ئەم چل هەزار پیاوە پێگەیشتووە، هەریەکێکیان خاوەنی خێزانێکی چوارکەسی بووبێت، ئەوە ژمارەی دانیشتوانی شارێکی وەک هرات بە گریمانەیی نزیکەی سەدوشەست هەزار کەس بووە١٦.

٤. شارەکان ناوەندێکی گەورەی زانستەکان بوون: پرۆسەی فێربوون و خوێندنی زانستەکان لە زۆربەی ئاوەدانییە بچووک و گەورەکان لە گوندەوە تاوەکو شارەکان بەردەوامی هەبووە، بەڵام جیاوازی شارەکان ئەوەبووە ناوەندێکی گەورە بوون بۆ سەرجەم زانستەکان و لە هەرچوارلاوە زانایان تێیدا کۆبوونەتەوە، شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ناوەندی زۆر گرنگ بوون بۆ گەشەکردنی زانستەکان، بەڕادەیەک زۆربەی خوێندنگە زانستییەکانی ئەو کاتە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بوون، لە سەرەتای کردنەوەی نیزامییەکانەوە لەلایەن وەزیری سەلجوقییەکان (نظام الملک طوسی)ەوە چەند نیزامییەیەک

لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کرانەوە، خوێندنگەیەک لە بەغداد، خوێندنگەیەک لە بەڵخ و بە هەمان شێوە لە نیشابور و هورات و ئەسفەهان و بەصرە و مەرو و آمل و موسڵ، واتا لە کۆی نۆ خوێندنگەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، پێنجیان لە شارەکانی خوراسان بوون، دوانیان کە موسڵ و ئەسفەهانە لە هەرێمە کوردییەکاندا بوون و ئەوانی دیکەش هەر لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بوون، ئەمە جگەلەوەی کە دەگوترێت لە هەر شارێکی عێراق و خوراسان خوێندنگەیکی کردۆتەوە١٧.

لێرەدا کە دەڵێین خوێندنگە ڕاستەوخۆ هاوبەرابەری زانکۆکانی ئێستایە، چونکە ئەم نۆ خوێندنگەیەی نیزامی لە شارەکاندا کرانەوە خوێندنگەی ئاست بەرز بوون، هەموو کەسایەتییەکی زانستی نەیتوانیوە بەشداری وانە وتنەوەکانی بکات، بەنمونە زانای گەورە و بەناوبانگ (ئەبو حامدی غەزالی) دوای ئەوەی چەندین قۆناغی خوێندن و فێربوون لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەبڕێت جا دەگاتە ئەو ئاستەی ببێتە مامۆستا لە نیزامییەی بەغداد، ئەمەش واتای ئەوەیە لەو سەردەمەدا خوێندنگە نیزامییەکان لە بەرزترین ئاستی فێرکردندا بوون، کە دەکاتە ڕۆڵی ئێستای زانکۆکان.

بەخۆشحاڵییەوە دووان لەو خوێندنگانە لە هەرێمە کوردییەکاندا بوون، ئەوانیش شاری موسڵە کە لە جیهانی ئەو کاتەدا شارێکی زۆرینە کورد بووە و سەر بە هەرێمی شارەزوور بووە، شاری ئەسفەهانیش سەر بە هەرێمی چیا بووە، کە هەرێمێکی زۆرینە کوردنشین بوون، واتا لە نۆ شاری گرنگی ئەو کاتە دووانیان لە هەرێمە کوردییەکاندا بوون.

ئەوەی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا کورتەیەکی شێوازی شار و شارنشینی بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، کە شارە کوردییەکان بەشێکی گرنگ بوون تێیدا، چ لە ڕووی ئابووریی و بەرهەمەوە، چ لە ڕووی زانستی و شارستانییەوە، چ لە ڕووی سەربازییەوە، بەتایبەت شارەکانی موسڵ و ئامەد و سەرپێڵی زەهاو و دینەوەر و نەهاوەند و چەندین شاری دیکەی تر.

بەکورتی دەتوانین بڵێین، شێوازی شار و شارنشینی لە ڕابردوودا بەهۆی بارودۆخە جیهانییەکانەوە و پێشکەوتنە مێژووییەکانەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، شارەکانی ئەو کاتە شوێنێکی گەورە و دڵنیا و پڕکەرەوەی پێداویستی بوون بۆ هەرکەسێک ڕووی تێ کردبێت، کە بەدڵنیاییەوە بەشێک لە دانیشتوانی شارەکانی ئەوکاتە ژیانێکی ئاسانتر و خۆشگوزەرانتر و ڕەفاهیتریان بۆ فەراهەم بووە، کە ئەمە بە دەگمەن بۆ دانیشتوویەکی گوندی ڕەنجکێش بەدیهاتووە، شارەکان شوێنی جموجوڵە شارستانییەکان بوون و ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی ژیاری مرۆڤایەتی بوون.

بەبۆچوونی کەسی ئێمە هیچ ژیارێک بەبێ بوونی شارستانیەتێکی پێشکەوتوو گەشە ناکات، ئەو شارستانیەتەش پشت بە بوونی شاری پێشکەوتوو دەبەستێت، کە تێیدا شارنشینان دەست و پەنجە لەگەڵ پێشکەوتنە جیهانییەکاندا نەرم دەکەن، لە ئەنجامدا کەسایەتی شارستانی پەیدا دەبێت و بەرهەمی شارستانیانە بەدیدێت و ژیاری ئەو نەتەوەیەی پێ گەشە دەکات، هەر ئەم هاوکێشەیە بوو، ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست و سەدە تاریکەکانی کرد بە ئەورووپایەکی خاوەن دەسەڵاتێکی جیهانی و دواتر ئەمریکای زلهێزی سەردەم.

ئێمەی کورد لەم بوارەدا ئەگەرچی لە ڕابردوودا خاوەنی شاری گەورە و گرنگ بووین، بەڵام بەهۆی ئەوەی خاوەن کیانی سەربەخۆی خۆمان نەبووین بۆ پاراستن و پێشخستنییان، نەمانتوانیوە سود لەو شارانە ببینین و بیانکەین بە داینەمۆی پێشکەوتنی ژیاری کوردی، زانای گەورە ئیبن خەلدون دەڵێت: ‹‹هەر شارێک پێویستی بە دەسەڵاتێکی خەمخۆرە بۆئەوەی بیپارێزێت و نۆژەنی بکاتەوە›› ١٨، بەڵام بەداخەوە ئێمە ئەو دەسەڵاتە بەردەوامە هوشیارەمان نەبووە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١ فەرهاد حاجی عبوش: المدینة الکردیة من قرن (٤_٧هـ/١٠_١٣م)، ط١، دار سپیریز، دهوک_ کردستان العراق_ ٢٠٠٤م، ص٤٤-٤٦.

٢ کامل حبیب رشید: شار وەک ناوەندی گەشەکردنی شارستانیەت، شارەکانی هەرێمی خوراسان بەنمونە سەدەی (٤ و ٥ک/ ١٠ و١١ز)، نامەی ماستەر بڵاونەکراوە، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٢٠، ص٧٦-٧٩.

٣ جیمز موریس: تاریخ شکل شهر، تر/ راضیه رضازاده، چ١٤، انشرارت دانشگاه علم صنعت ایران، تهران، د.س، ص ص٩٣-٩٥، ١٠٦-١٠٧.

٤ حکیم أحمد خوشناو: الکرد و بلادهم عند البلدانیون و الرحالة المسلمین، ط١، دار الزمان، دمشق-٢٠٠٩، ص ص٢٠٣-٢١١.

٥ کامل حبیب: س.پ، ل٧٦-٧٩.

٦ حکیم أحمد خوشناو: ن.م، ص ٢١٢-٢١٤.

٧ جیمز موریس: م.پ، ص ١٠٩-١١٠.

٨ کامل حبیب: س.پ، ل٨٢.

٩ هـس، ل ٨٦-٨٧.

١٠ خطیب البغدادي: تاریخ بغداد، تح/ مصطفی عبدالقادر عطا، ط١، دار الکتب العلمیة، بیروت، ١٤١٧هـ، ج١/ ص ٩٣-٩٤.

١١ سۆران بەها ئەحمەد: کشتوکاڵ وخۆراک لە هەرێمی چیا لە سەدەی (چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی)، چ١، ناوەندی کوردستان بۆ دۆکیۆمێنت و لێکۆڵینەوەی زانستی، زانکۆی سلێمانی، هەرێمی کوردستانی-عێراق، ٢٠١٩، ل٣٨.

١٢ فرهاد حاجی عبوش: م.س، ص ٥٥-٦٥.

١٣ محمد یوسف کیانی: معماری ایران دوره اسلامی، چ١٢، سازمان مطالعه وتدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها (سمت)، تهران، ١٣٩٣ش، ص٢٥٠.

١٤ کامل حبیب: س.پ، ل ١١٥.

١٥ سۆران بەها ئەحمەد: س.پ، ل ٤٤-٤٨.

١٦ السمعاني: الأنساب، تح/ عبدالرحمن معلمي، ط١، مطبعة دائرة المعارف العثمانیة، حیدرآباد_ ١٣٨٢هـ ، ج١٢/ ص٣٣٤_٣٣٥.

١٧ السبکی: الطبقات الشافعیة الشافعیة الکبری، تح/ عبدالفتاح محمد الجلو ومحمود محمد الطناحی، ط٢، مطبعة عیسی الحلبی البابی، دار إحیاء الکتب العربی، مصر_ قاهیرة، ١٣٨٣ک/١٩٦٤ز، ج٤، ص٣١٣.

١٨ ابن خلدون: المقدمة، تح/ عبدالله محمد درویش، ط١، دار یعرب، دمشق_٢٠٠٤، ج١/ ص٨-

# شارنشینی و بەشاریبوون

## لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی شارەوە






**پ.ی.د. عالیه فرج مستەفا**

لەدایکبووی هەڵەبجە، پسپۆڕ لە بواری خێزان و جێندەر،
مامۆستا لە بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانی.

**ئەم پەیپەرە بەپشتبەستن بە هەردوو پێڕەوی وەصفی و بەراوردکاری (چوار) تەوەرەی سەرەکی سەبارەت بە هەریەکە لە: کۆمەڵناسی شار، ئاراستە تیۆرییەکانی پەیوەست بە گەشەی شار لە ڕووی مێژوویی و بە خوێندوەیەکی کۆمەڵناسییەوە، هەردوو چەمکی شارنشینی و بەشاریبوون و جیاوازی واتا و تایبەتمەندی و تێگەشتنە جیاوازەکان بۆ هەریەکە لە شارنشینی و بەشاریبوون و گرفتەکانی شار لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی شارەوە و فۆکەسکردنەسەر گەرەکە دواکەوتووەکان(فەرامۆشکراوەکان) وەکو گرفتێك کە حزوری هەیە لە هەردوو وڵاتانی گەشەکردوو و گەشەسەندوودا.**

## یەکەم/ کۆمەڵناسی شار:

کۆمەڵناسی شار بوارێکە لە بوارەکانی کۆمەڵناسی، کە هەریەکە لە: پێڕەو، چەمک و ئامرازەکانی کۆمەڵناسی لە دیراسەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو شاردا بەکاردەهێنێت. بۆیە بە کۆمەڵناسی ژیانی شار ناوزەند دەکرێت و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە گرووپەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە شاردا ئەنجامدەدات.

لە قاموسی کۆمەڵناسی، کۆمەڵناسی شار پێناسە دەکرێت بە کۆمەڵناسی ژیانی شار بەواتای شیکردنەوەی ژیان لە شاردا وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و دیارسەکردنی دانیشتوانی شار لە ڕووی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، دەروونی، کولتووریی و بەرهەمهێنانەوە.

کۆمەڵناسی شار لێکۆڵینەوە لە کاریگەری ژیانی شار دەکات لەسەر فۆرمەکانی ڕەفتار و پەیوەندییەکان و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێی جەختخستنە سەر پێکهاتنی سیستمەکان و شێوازی کارلێککیان لە ژیانی شاردا، لەمەوە کۆمەڵناسی شار دیراسەی ژیانی شار دەکات وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و چۆنیەتی پێکهاتنی و گەشەسەندن وئەرکەکانی کە جێبەجێی دەکات. هەروەها بە تیشکخستنەسەر هۆکارەکانی دروستبوونی شار لە هۆکارە سرووشتی، جوگرافی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایینی، کولتووری، ئابووریی و دانیشتوان.

شار کۆمەڵێک ڕۆڵی چەند جۆرەی لەباری نیشتەجێبوون، پاکوخاوێنی، بەڕێوبەرایەتی، پەروەردە و فێرکردن، کات و ساتی ئازاد،...هتد هەیە.

**بەکورتی شار پێکهاتووە لەم توخمانە:**

١. توخمی ماددی وەک هەوا، خاک، شاخ، ئاو، سوتەمەنی.
٢. ڕەهەندی فەزایی و کاتی.
٣. ڕەهەندی نیشتەجێی.
٤. دامەزراوەکان، کارخانەکان، هێڵی شەمەندەفەر و ناوچە پیشەسازییەکان.
٥. ڕێکخراوە پیشەیی و فەزای بازرگانی.
٦. پێوەندیی نێوان ئێتنیکی.
٧. بەربەرەکانێی توخمە فیزیۆلۆژییەکانی وەک کێبەرکێ، چڕبوونەوە، جیاکردنەوە، سەرکەوتن، دژبەری، دەقاودەقی و هاوشێوەیی.
٨. هەڵکەوتنی دانیشتوان ناسی، گەشەی دانیشتوان، مەرگ و زاوزێ.
٩. توخمە ئامادەییەکانی وەک: مێژوو، کولتوور، توێژینەوەی کۆمەڵایەتی.
١٠. دابەشکردنی کاری ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان.
١١.تۆڕە شارییەکان.
١٢.کاکردە ئایینی و کولتوورییەکان.
١٣.جیاوازی ڕۆڵی هاوڵاتیان بەشێوەی: بەرهەمێنەر

یان بەرخۆر، مامۆستا یان قوتابی، خاوەن ماڵ و کرێچی.
١٤.فەزای کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی.
١٥.پاراستنی ناوچەی سروشتی و تەکنەلۆژیا.

**بابەتەکانی بوارەکانی کۆمەڵناسی شار دیاری دەکرێت بەم بوارانە:**

١. لێکۆڵینەوە لە شار وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی.
٢. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە شار و نێوەندە شارنشینەکان و شوێنەکانی دەوروبەریان.
٣. لێکۆلینەوە سەبارەت بە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی شارنشینی.
٤. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە شار لە ڕووی ڕۆڵی مێژوویی، پێکهاتن، پێشکەوتن، فۆرمەکانی شار و ئەرکەکانی.
٥. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی شار وەک گرفتەکانی تاوان، گەندەڵی، چڕی دانیشتوان، سیستمە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.
٦. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی ژیانی شار و پێشکەوتنی.
٧. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ئیکۆلۆژیای شارنشینی و پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگە و ژینگەی سرووشتی.
٨. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهاتنی چینە کۆمەڵایەتییەکان.
٩. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە شوناسی تاکی و کۆمەڵی.
١٠.لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کارلێکی مرۆیی لە شوێنە شارنشینەکان.
١١.لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کاریگەری شار یان ژیانی شارنشینی لەسەر ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

**دووەم/ ئاڕاستە تیۆرییەکانی لێکۆڵینەوە لە شار:**

لە ئەدەبیاتی تیۆری تایبەت بە کۆمەڵناسی شاردا، زانایانی کۆمەڵناسی وەک فردیناند تۆنیز، ماکس ڤێبەر، جۆرج زیمل و ئەمیل دۆرکایم.

**یەکەم: ماکس ڤێبەر**

ڤێبەر پێناسەی شاری کردووە لەبەر ڕۆشنایی تەرتیباتی کۆمەڵایەتی، کە ڕێدەدات بە بەرەوپێشچوونی تەواو بۆ توانستە تاکییەکان و نوێبوونەوەی کۆمەڵایەتی، ئەم پێناسەیە بە مۆدێلی نموونەیی ڤێبەر دادەنرێت، کە یارمەتیدەرە بۆ بەرەوپێشچوونی ڕاڤە و بەراوردکارییە تیۆرییەکان. لەڕاستییدا داڕشتنی ڤێبەر بۆ پێناسەی شار پشتی بەستووە بەوەی شارەکان نێوەندی شارستانین و خاوەن پێگەی گۆڕانی مێژوویین بەدرێژایی مێژووی ئەوروپا.

ڤێبەر هەوڵی ئەوەی نەداوە پێناسەی بۆ شار ببەستێتەوە بە شار لە سەردەمی خۆیدا، بەڵکو باوەڕی وابوو، کە شارە پیشەسازییەکان لە سەدەی نۆزدەیەمدا فۆرمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیین شیاوی ئەوە نیین یەکەی جێگیر و ڕاستگۆبن بۆ شیکاری سۆسیۆلۆژی.

لە بابەتی بەناوبانگی ڤێبەر بەناونیشانی «شار» کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢١ بڵاوبووەوە لە چوارچێوەیدا پێناسەیەکی بەرەوپێشبرد بەناوی «کۆمەڵگەی شارنشینی تەواو» بە پشتبەستن بە لێکۆڵینەوەی ڕووپێوی بۆ شارە مێژووییەکانی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەراوردکردنی بەو مەعریفە کەسییەی، کە ڤێبەر هەیبوو سەبارەت بە شارە مێژووییەکان لە چین و هیند. لە ڕەگەزەکانی ئەم پێناسەیە: پێویستی زاڵبوونی پەیوەندییە بازرگانییەکان و دابینبوونی کۆمەڵێک مەرجی بنەڕەتی وەک بوونی قەڵا و بازاڕ و دادگا و سەربەخۆیی خودی. ئەم پێناسەیە ناونرا بە مۆدێلی نموونەیی بۆ شار، لەگەڵ ئەوەی ڤێبەر هۆشیار بوو بەوەی کە زۆرینەی شارەکان ئەم ڕەگەزانەی پێناسەکەی بەسەردا جێبەجێ نابێت بۆیە بە

کۆمەڵگەیەکی شارنشینی تەواو ئەژمار ناکرێت.

لە پێناسەکانی تری ڤێبەر بۆ شار» رووبەرێکی جێگیر و چڕ لە دانیشتوانی قەرەباڵغ کە یەکترناسین و ئاڵوگۆڕی نییە لە نێوانیاندا».

## ڕەگەزەکانی پێناسەی ڤێبەر:

١. کۆمەڵگەی شارنشینی تەواو پێویستە لەسەر بنەمای پەیوەندی بازرگانی بنیاتنرابێت، شاریش وەک ژینگەیەکی فیزیکی ڕێکخراوە بە فۆرمێک لە ئاڵوگۆڕی ئابوری، چونکە خەڵکی شار ئەستەمە بتوانن خودکەفایی ئابووری وەکو خەڵکی لادێ ئەنجامبدەن.

٢. گرنگە تایبەتمەندی سەربەخۆیی خودی بۆ کۆمەڵگەی شارنشینی تەواو فەراهەمبێت، کە خۆی دەبینێتەوە لە بوونی دادگا و یاسایەکی تایبەت بە دادگاوە و سەربەخۆیی خودی لە ڕووی سیاسیی و سەربازییەوە لە ڕێی شەقڵی تایبەتەوە بەبوونی سوپای بەرگری و شورای پاراستن ئەگەر خەڵکی شار بیانەوێت یەکگرتوو بن و هەمان وابەستەبوونیان بۆ شارەکەیان ببێت وەک خەڵکی دێهاتەکان.

٣. بەرەوپێشبردنی شێوازی گونجاو بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان دانیشتوانی شاردا بە مەرجێک لە مەرجەکانی دادەنرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ژیانی شار پێویستی بە بەرەوپێشبردنی پەیوەندییەکان و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان هەیە تا لە ڕێیەوە دانیشتوان هەستی بەشداریکردنی ئامانجدار و بە واتایان بۆ بێتەدی لە ژیانی شارەکەیاندا.

لەگەڵ بوونی باوەڕ لای ڤێبەر بەوەی شار خاوەنی هێزی ئازادکار و ئەرێنییە بۆ ژیانی مرۆیی، ئومێدێکی بە شاری سەدەی بیستەم نەبوو، بەڵکو ڤێبەر جەختیکردووەتەوە لەسەر ئەوەی شارەکانی سەدەی ناوەڕاست پارێزراو و خودکیفایەتییان بووە و دەکرێت ناوبنرێن بە کۆمەڵگەی شارنشینی تەواو.

ڤێبەر جیاوازی لە نێوان دوو جۆر لە شوێنی شارنشینی و جیهانی شارنشینی دەکات: یەکەمیان شوێنە شارنشینییەکانە، کە خاوەنی کاریگەری زانستی سنووردارە بەهۆی بوونی پرۆسەی کارلێک لە چوارچێوەی هۆکارەکانی کۆمەنیکەیشنی ناوشار بە تەنها. جیهانی شارنیشانی کە پابەندبوونی بە شوێنەوە نییە و کاریگەری بێ سنووری هەیە، کە سنوری ناوچەیی و هەرێمی دەبەزێنێت و دەگاتە ئاستی کاریگەری جیهانی، ئەم فۆرمە گەشەی خێرا بەخۆیەوە دەبینێت لە ئەنجامی بەرەوپێشچوونی هۆکارەکانی کۆمەنیکەیشن و هۆکارەکانی گواستنەوە.

هۆکاری شکستهێنانی شارە نوێکان لای ڤێبەر بریتییە لە لەخۆگرتنی عەقڵیەتی پەرگیریی و پشتبەستنی بە سەرمایەداریی و پایەی قازانجکردن و سوود وەک پاڵنەر بۆ ژیان.

لای ڤێبەر تەنها مێژوو هۆکار نییە بۆ بەرەوپێشچوونی شارەکان وەکو تۆنیز و زیمل، بەڵکو لای ڤێبەر پرۆسەی گەورەتر لە خودی شار هەیە بۆ فەراهەمهێنانی پێشکەوتن وەک پرۆسەی ئابووریی و سیاسی دیاریکراو.

## دووەم: جۆرج زیمل

جۆرج زیمل گرنگیداوە بە قەبارە و دەوڵەمەندی ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوانەی، کە ڕووبەڕووی تاکەکان بوونەتەوە، کە ژیاون لەناو شوێنە میترۆبۆلیتییەکان لەکاتی ئەودا و بە ڕوانینی زیمل ئەو ئەزموونانە ڕێگەیەکن بۆ زیادکردنی وروژاندنی دەروونی.

بیرۆکەی زاڵ بەسەر ناوەڕۆکی ئەو بابەتەدا بریتیبوو لەوەی کەسایەتی فێر دەبێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ شاردا و زیمل تایبەتمەندییەکانی ژیانی شاری بە وەڵامدانەوەی ئەرێنی لەلایەن دانیشتوانی شارەوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەوەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لە ئاڵۆزییەکان. بۆیە بەڕای زیمل هەریەکە لە:(بەرەوپێشبردنی پەیوەندی ناکەسی و دابەشبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ چەند جیهان و بوارێکی جیا وەک خێزان، جیهانی کار،

جیهانی هاوڕێ و بوونی توانست بۆ چوونە ناو پەیوەندی بەرژەوەندیخوازی کاتی) بە ڕێگا و هۆکاری خۆگونجاندن لەگەڵ باری شاردا دادەنرێت. زیمل لە هەموو ئەو هۆکارانەدا ئومێدێکی دەبینی بۆ بەرجەستەبوونی هۆشمەندی تاکی خودی زیاتر لە شێوازەکانی تری شارنشینی لە کۆمەڵگەدا.

تیۆری زیمل لە دوو بیرۆکەدا کورت دەکرێتەوە:

یەکەمیان تایبەتمەندییەکانی شار و دووەمیان وەڵامدانەوەی دانیشتوانی شار، گرنگترین تایبەتمەندییەکانی شار لای زیمل بریتییە لە چڕبونەوەی وروژاندنی دەروونی و دەماری، کە پێویستە شارنشین زاڵ ببێت بەسەریدا. بە ڕای زیمل هێرشی شار بەردەوامە بۆ سەر تاکەکان بە شێوازی جیاواز و دەنگی جۆراوجۆر بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی تاکەکان، بۆیە تاکەکان پێویستیان بە لەخۆگرتنی توانای جیاکاریکردنە لە نێوان شتە گرنگەکان و شتە ناگرنگەکان تا بتوانن دیاری بکەن لەگەڵ کام شتانە دەگونجێن، لەمەوە دانیشتوانی شار دەبنە خاوەنی ئاستێکی جیاواز لە دانیشتوانی گوندەکان لە ڕووی بیرکردنەوە و عەقڵانیبوون و واقیعیبوون. بە بڕوای زیمل دانیشتوانی شار بە تێپەڕبوونی کات فێردەبن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ژیانی شاردا بە بەرەوپێشبردنی ئاڕاستەکانی خەمساردیی و گۆشەگیریی ...هتد. خەمساردی کە بریتییە لە گرنگینەدان بە نارەحەتییەکانی کەسانی دەوروبەر بە تێپەربوونی کات دەگۆڕێت بۆ ڕقلێبوونەوە و قەبوڵنەکردنی بەرامبەر بەدوایدا ڕووبەڕووبوونەوە بە یەکتر لەکاتی بوونی بەریەکەوتندا.

دابەشبوونی کاری ئابووری پێشکەوتوو کە خۆی دەبینێتەوە لە ڕێکخستنی عەقڵانی بۆ کات و چالاکی بە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی شار دادەنرێت.

ئابوری نەخت یان نەختینە تایبەتمەندییەکی تری عەقڵانییەتی شارە، بەرای زیمل دابەشبوونی پێشکەوتوو و ئاڵۆزی کار پێویستی بە بەرەوپێشبردنی هۆکارە گشتییەکانی ئاڵوگۆڕکردن هەیە کە خۆی لە نەخت یان پارە دەبینێتەوە کە گشتی و هاوبەشە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا.

### سێیەم: ئیرنست بیرجس

بیرجس جیاوازی لە نێوان دوو چەمکی کۆمەڵگەی لۆکاڵی و کۆمەڵگە کردووە، بەوەی کۆمەڵگەی لۆکاڵی لایەنی شوێنی(مکانی) گرووپە مرۆییەکان دەبێتە نێوەندی گرنگیپێدان لە هەموو لێکۆڵینەوەیەکی ئیکۆلۆژیدا. هەروەها ڕێکخستنی کۆمەڵگەی لۆکاڵی بریتییە لە ئەنجامی پرۆسەی کێبەرکێی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی لۆکاڵی، ئەو پرۆسەیەی کە ناوەڕۆکی ئیکۆلۆژیا دەخاتەڕوو.

بیرجس بۆچوونە ئیکۆلۆژییەکانی ڕۆبەرت پارکی جێبەجێ کردووە لە داڕشتنی بۆچوونەکانی سەبارەت بە شار، بە جەختخستنەسەر یەکەم داڕشتنی زانستی ڕێکخراو بۆ جێبەجێکردنی چەمکە ئیکۆلۆژییەکان لە بواری لێکۆڵینەوە شارنشینییەکان.

بیرجس لە پێناسەی بۆ شار زیاتر جەختیخستووەتەسەر پرۆسەی دینامیکی پەیوەست بەو گەشە خێراییەی، کە بەرهەمهاتووە لە پرۆسە بنەڕەتییەکان کە ژیانی شارنشینی ئاڕاستە دەکات، بەوەش بیرۆکەی گەشەی فیزیکی کە فراوانبوونی شوێنیی دەگرێتەوە بووەتە بیرۆکەی سەرەکی لە ڕاڤەکردنی هەر کۆمەڵگەیەکی شارنشینی بە ڕوانینی بیرجس.

لێکۆڵینەوەی ئیکۆلۆژی بۆ شار لای بیرجس هەریەکە لە لێکۆڵینەوەی ئەنجامەکانی گەشە و کاریگەرییەکانی لە سەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و کەسایەتی دەگرێتەوە.

بۆ پێوانەکردنی گەشەی خێرا لە شارەکاندا بیرجس جوڵە یان گواستنەوە وەکو پێوەر ئەژمار دەکات، لە بەرامبەردا بەهای زەوی بەپێوەر و نیشاندەر بۆ جوڵە یان گواستنەوە دیاری دەکات.




**بەشێوەیەکی گشتی بەشدارییەکانی بیرجس لە بواری تیۆری ئیکۆلۆژی شارنشیندا بریتییە لە:**

١. یەکەمین دارشتنی تیۆری ڕێکخراوی بۆ پێکهاتەی نمونەیی شار دارشتووە، بەوەی کۆمەڵگەیەکی ئیکۆلۆژی سرووشتییە.

٢. بیرجس یەکەمین ڕوونکردنەوەی سەبارەت بە کاریگەرییەکانی ڕێکخستن و دابەشبوونی شوێنیی لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی خستووە تەڕوو، بەتایبەتی ئەو کاریگەرییانەی لە دەرەنجامی دەرکەوتنی شوێنی ڕۆشنبیری جیاواز لەناو شاردا بەرجەستە دەبێت.

٣. شیکاریکردن بۆ گەشەی شارنشینی لە چوارچێوەی فراوانبوونی شوێنیی، بە دوایدا ڕێخۆشکردن بۆ بەکارهێنانی دەروازەی ئیکۆلۆژی لە لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆژییەکان سەبارەت بە شاریبوون.

٤. گرنگیپێدانی بۆ خستنەڕووی ئەنجامی گەشەی خێرا لە بواری دیاریکردنی مۆدێلەکانی کەسایەتی و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی.

٥. گرنگیدانی بە بەهای زەوی وەکو پێوەرێکی بابەتی بۆ پێوانەکردنی گواستنەوە.

سێیەم: چەمکی شارنشینی و بەشاریبوون:

بە شاریبوون بریتییە لە پرۆسەی فراوانبوونی جوگرافیای شار و زیادبوونی چڕی دانیشتووان و گۆڕانی بەردەوام لە تێڕوانین و پلەی ئاڵۆزی پیشە و کار لە چوارچێوەی شاردا، لە بەرامبەردا شارنشینی بریتییە لە زاڵبوون و جێگیربوونی تایبەتمەندییەکانی شار.

لەکاتێکدا شارنشینی چوارچێوەی شوێنی شاری تێپەڕاندووە لە ڕێی دوو هۆکارەوە: یەکەمیان، هۆکارەکانی گەیاندن، کە کاریگەری شوێن و کاتی بە تەواوەتی سنوردارکردووە، دووەمیان ئەو فرەییەی کە بەسەر ژیانی شاردا هاتووە وەکو وەڵامدانەوەیەک بۆ خواستی تاکەکان. چەمکی شارنشینی وەکو (لویس ویرس) ئیشارەتی بۆ دەکات بە واتای چۆنیەتی ژیان گوزەراندن یان بە واتای ڕێگای ژیان دێت، کە تایبەتە بە شار و کۆمەڵێک تایبەتمەندی هەیە، لەوانە:

١. ئامادەیی دابەشبوونی کار وەکو پێداویستییەکی هەلومەرجی شوێنی، ئەم دابەشبوونە پشتدەبەستێت بە بونیادێکی پیشەیی و جیادەکرێتەوە بە بوونی جیاوازیی و فرەیی، کە پێوەرە بۆ بونیادی چینایەتی کۆمەڵایەتی لە شاردا.

٢. دەرکەوتنی ڕووبەرێکی فراوان بۆ بزاوتی

ستونی و ئاسۆیی بزاوتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ بوونی بزاوتی فیزیقی(شوێنی).

٣. بوونی هاوسەنگی بە واتای بوونی پشتبەستن بەیەکتر لە نێوان تاکەکاندا لە ڕووی ئاڵوگۆڕکاریی و وەزیفییەوە.

٤. ئامادەیی سیستمی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ڕووکەشی و ناکەسی(سێ فۆرم لە پەیوەندی: پەیوەندی سەرەتایی و پەیوەندی پیشەیی و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی نەناسراو) لەگەڵ دەرکەوتنی فرەیی و دابەشبوون لە ڕۆڵەکاندا.

٥. لە کۆمەڵگەی شاردا هەریەکە لە یاسا و دەسەڵاتی جێبەجێکردن ڕۆڵی هۆکارەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەگێڕن(دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و ئایینی بەشدارن لە فەراهەمهێنانی ئینتیما و بەرجەستەبوونی ڕۆڵەکان).

بەشاریبوون پێناسە دەکرێت بە بوونی گۆڕانکاریی و پێشکەوتن و گۆڕانکاری لە سەرجەم بوارەکان و بوارەکانی ژیاندا و بواری کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئیکۆلۆژی، دیمۆگرافی، ڕێکخستن و ڕەفتاری (نەریت، داب و بەهاکان) و ئەم دیاردەیە تەنها تایبەت نییە بە شارەکانەوە، بەڵکو دێهاتەکانیش دەگرێتەوە. لە بەرامبەردا بەشاریبوون لە وڵاتانی گەشەسەندوودا بە ئاڕاستەیەکی خێرا گەشە دەکات و زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە خەونی دەستخستنی پێگەیەکی لە شاردا هەیە بەواتای دەستخستنی کار و شوێنێکی نیشتەجێبوونی گونجاو و هەلومەرجێکی ژیانی ڕازیکار تا بتوانێت ژیانێکی شەرەفمەندانە بژی، بۆیە واتای بەشاریبوون ئەم تێگەشتنە تێدەپەڕێنێت و تەنها ناخزرێنێتە چوارچێوەی دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ و ڕەگەزە ماددییە پێکهێنەرەکانی ژیان و بەشاریبوون هەریەکە لە زانست و تەکنەلۆژیا و هونەر و سیاسەت و شیعر و ...هتد دەگرێتەخۆی.

ڕەهەندێکی تری بەشاریبوون بریتییە لە ئامادەیی بزاوتی (الحراك) کۆمەڵایەتی و دابەشبوونی دانیشتوان و ڕەفتار و هەڵوێستی تاکەکانی ناوشار و ئاستی گونجاندنیان لەگەڵ ژیانی دەستەکۆیی شار و ڕێکخستنەکانی و ئەرکەکانی.

بەشاریبوون لە وڵاتانی پیشەسازیدا گرێدراوە بە پێشکەوتنی ئابووریی و پیشەسازیبوون، لە بەرامبەردا لە وڵاتانی گەشەسەندوودا بەشاریبوون گرێدراوە بە زیادبوونی دانیشتووانەوە و دوورە لە پێوەرەکانی گۆڕانکاری ئابووری وەکو پێشکەوتنی پیشەسازی یان زیادبوون لە زیادەی بەرهەمی کشتوکاڵی و کۆچکردنی دانیشتوان لە گوند و دێهاتەکانەوە بۆ ناو شار پێش ئەوەی شار ئامادەیی بۆ کۆچکردنی گوند و دێهاتەکان دەستپێبکات.

گۆڕانی کتوپڕ لە شێوازی ژیانی دێهاتی بۆ شێوازی ژیانی شار هۆکاری خولقاندنی لێکترازانە لە بونیاد و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان، بۆیە کۆمەڵگە عەرەبییەکان گرفتی سەرەکی بۆ خولقاوە لە گونجاندن لەگەڵ گومان و ئەو شێواندنانەی کە لە سیستمی بەهایی نەریتییدا دەرکەوتووە لە ئەنجامی ئەو کۆچکردنە بەردەوامانەوە.

کۆمەڵگە عەرەبییەکان چوونەتە قۆناغێکی نوێوە کە جیاواز بوو لە ڕووی بنەما شارستانییەکانەوە بە بەراورد بە قۆناغەکانی پێش ئەم قۆناغە بۆ کۆمەڵگە عەرەبییەکان کە سوودمەندبوون بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. گەشەکردنی بواری پیشەسازی نوێ کە ناڕاستەوخۆ پشتی بەستووە بە نەوت بەوەش گەشەسەندنی بازرگانی بە هاوشانی گەشەسەندنی پیشەسازی هۆکاری سەرەکی خێرابوونی پرۆسەی بەشاریبوون بووە.

بەراورد لە نێوان گەشەی شارنشینی لە نێوان وڵاتانی ڕۆژئاوا و وڵاتانی ڕۆژهەڵات:

• گەشەی شارنشینی بەهۆکاری گەشەی پیشەسازی، بەهۆکاری دەرکار
• گەشەی شارە گەورەکان بەهۆی داگیرکارانەوە و مانەوەی بە شاری گەورە لەچاو شارەکانی تر(دوو سەدە لە ڕۆژئاوا و دە ساڵ لە ڕۆژهەڵات).
• گەشەی شارنشینی پشتبەستوو بە بەهای پرۆستانتی لە ڕۆژئاواو جیاوازی لە بەهای ئایینی لە ڕۆژهەڵات کە لایەنی ڕۆحی و عاتیفی زاڵە.
• زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان و پەیوەندی بە گەشەسەندنی سەرچاوەکان و بوونی هاوسەنگی لە نێوان ڕێژەی دانیشتوان و گەشەسەندنی سەرچاوەکان.

**شار پێش شۆڕشی پیشەسازی**
• شار وەک یەکەیەکی سیاسی و حکومیی و کارگێڕی بووە و نەبوونی پسپۆڕی تایبەت بە شارەکان.
• هێزی شار لە ڕێی بیناکردنی هێزی سیاسیی و ئابووریی و سەرپەرشتیکردنی لایەنی ئایینی دەبوو.
• سرووشتی بوونی پسپۆڕیی و دابەشبوونی کار بەشێوەی بوونی وەستا دەستەی پیشەوەران بووە و هەریەکە لە هێڵی بەرهەمهێنان و گەشەی هونەری بوونی نەبووە.
• بەرهەمهێنان بە ئاستی بەکاربردنی لۆکاڵی بووە، لەگەڵ سادەیی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان.

## دەروازەکانی لێکۆڵینەوە لە بەشارییوون:

یەکەم: بۆچوونی سۆسیۆلۆژی بۆ بەشارییوون

ئەو پرۆسەیە کە بەهۆیەوە ژمارەی دانیشتوانی شار زیاد دەکات لە ڕێی گۆڕینی ژیان لە ژیانی دێهاتەوە بۆ ژیانی شارنشینی، بەشارییوون پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ڕواڵەتەکانی گۆڕانکارییەوە هەیە بە نموونە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە ڕووی بونیاد یان وەزیفەی کۆمەڵگەوە.

دووەم: بۆچوونی دیمۆگرافی بۆ بەشارییوون

ئەم بۆچوونە پشتدەبەستێت بە ڕەهەندی دیمۆگرافی وەکو گرنگترین پێوەری پرۆسەی بەشارییوون. بوونی دوو ئاڕاستە لە پێناسەکردنی پرۆسەی بەشارییوون: یەکەمیان بە بوونی چەند سەنتەرێکی کۆبوونەوەی دانیشتووان، دووەمیان بە بوونی تەنها یەک سەنتەری کۆبوونەوەی دانیشتووان، بۆیە دەکرێت دێهاتێک بە زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان بەرەو بوون بە شار ئاڕاستە بێت و بە پێچەوانەشەوە.

سێیەم: بۆچوونی ئابووری بۆ بەشارییوون

بەشارییوون گرێدراوە بە جوڵەی یان گواستنەوە بۆ ڕێکخستنەکانی ئابووری ئاڵۆزتر، بە واتایەکی تر گۆڕان لە ژیانی کۆمەڵایەتی پشتبەستوو کاری سەرەتایی وەکو ڕاوکردن و کشتوکاڵ بۆ ژیانی پشتبەستوو بە کاری پیشەسازیی و کارگێڕی و بازرگانی و خزمەتگوزاری. بەشارییوون بە واتای گواستنەوە لە ئابووری بژێوییەوە بۆ ئابووری بازاڕ.

چوارەم: بۆچوونی ئیکۆلۆژی بۆ بەشارییوون

ئەم بۆچوونە تێکەڵەیەکە لە بۆچوونی دیمۆگرافی و ئابووری بە جەختکردنە سەر هەریەکە لە شوێن و دانیشتووان یان گۆڕاوی قەبارە و چڕی دانیشتوان. بەواتای ئامادەیی کۆمەڵێک دیاردە لە شوێنێکی دیاریکراودا کە تایبەتمەندی جوگرافی، ئابووریی و کارگێڕی هەیە و هەردوو سیفەتی



**ژیانی شار پێویستی بە بەرەوپێشبردنی پەیوەندییەکان و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان هەیە تا لە ڕێیەوە دانیشتوان هەستی بەشداریکردنی ئامانجدار و بە واتایان بۆ بێتەدی لە ژیانی شارەکەیاندا.**

کاریگەری بەجێهێشتن و کێشکردنی پێبەخشێت لە پەیوەندیدا بە شوێنەکانی دەوروبەری.

پێنجەم: بۆچوونی ڕێکخستن بۆ بەشاریبوون

ئەم بۆچوونە جەخت دەخاتە سەر کەڵەکەبوون و ئاڵۆزبوونی سیستمی ئابوری پشتبەستوو بە تەکنەلۆژیای پیشەسازی پێشکەوتوو بە هەمان پلە و ئاڕاستەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و ئەم ئاڵۆزبوونە هەریەکە لە: پێشکەوتنی حکومەتە مەکەزییە بەهێزەکان، پێشکەوتنی بازاڕی لۆکاڵیی و ناوچەیی و جیهانی، بڵاوبوونەوەی شێوازە جیاوازەکانی ڕێکخستنە فەرمی و نافەرمییەکان وەکو سەندیکا و...هتد، لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی، کە پەیوەستە بە یەکەکانی ڕێکخستنەکان وەک: خێزان، خوێندنگە، دامەزراوەی ئاینی و بازاڕەکان. هەروەها گۆڕانی ستایلەکانی ژیان و فراوانبوونی تۆڕەکانی گەیاندن و پەیوەندی کردن.

شەشەم: بۆچوونی سلوکی بۆ بەشاریبوون

ئەم بۆچوونە جەخت دەکاتە سەر ئەزموونی تاکەکان لە ڕووی فۆرمەکانی ڕەفتار و کارلێککردن، بەوەش گۆڕانی کۆمەڵگە لە ڕووی پێکهاتەوە بۆ فۆرمی دابەشبوونی ڕۆڵەکان و دابەشبوونی ئینتیماکان و زاڵبوونی پەیوەندی ڕووکەشی. بەشاریبوون بە واتای گواستنەوە بۆ نموونەی زیاتر عەقڵانیبوونی کردەی کۆمەڵایەتی و کارلێککردن، کە گرێدراوە بە بەکارهێنانی چەمکەکانی عەلمانییەت، عەقڵانییەت، پەراوێزبوون و ناپێوەریبوون یان نەمانی پێوەرەکان و نامۆبوون.

**چوارەم: گرفتەکانی شار لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی شارەوە**

زۆرینەی توێژینەوە پراکتیکیە تایبەتەکان بە کێشە و گرفتەکانی شارەوە، جیاوازییەک لە نێوان گرفتەکانی شار لە نێوان وڵاتە گەشەکردووەکان (Developed) و وڵاتە گەشەسەندووەکان (Developing) دەخەنەڕوو و دەیگێڕنەوە بۆ هەموو ئەو جیاوازییانەی، کە بوونی هەیە لە بوونی شارەکان و ستایلی ژیانی شارنشینی و گەشەی شارنشینی و چوارچێوە جیاوازەکانی ئاڕاستەبوون بەرەو بەشاریبوون.

یەکێک لە گرفتە پێکهاتەیی و ئەرکییەکانی شار بریتییە لە بوونی گەڕەکە دواکەوتووەکان(فەرامۆشکراوەکان)، کە لە زۆرینەی شارەکانی جیهاندا بوونی گەڕەکی دواکەوتوو بووەتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی. لە ئەنجامی چەندین توێژینەوەی وەصفی و پراکتیکی ئەنجامدراو و تایبەت بە دیاریکردنی نیشانەکانی (پێوەرەکانی) گەڕەکی دواکەوتوو، کۆمەڵێک تایبەتمەندی جێگیرکراوە، کە بە حزوریان لە هەر گەڕەکێکدا بە گەڕەکی دواکەوتوو ناوزەند دەکرێت، لەوانە:

١. گەڕەکە دواکەوتووەکان لەسەر موڵکی گشتی بنیاتنراون و وێنای گیرفانیان بۆ شارەکان دروستکردووە یان بەدەوری شوێنە بازرگانی و پیشەسازییەکاندا وێنای پشتێنەیەکییان دروستکردووە یان لە دەوروبەری ئوتێلەکان و شوێنەکانی کاتبەسەربردن دروستبوون.

٢. بوونی دابڕانێک لە نێوان گەڕەکەکە و گەڕەکەکانی تری نێوەندی شار.



بەشاریبوون لە وڵاتـــانی پیشەسازیدا گرێدراوە بە پێشکەوتنی ئابووریی و پیشــەسازیبوون، لە بەرامبەردا لە وڵاتانی گەشەسەندوودا بەشاریبوون گرێدراوە بە زیادبوونی دانیشتووانەوە و دوورە لە پێوەرەکانی گۆڕانکاری ئابووری.

٣. زۆرینەی نیشتەجێبووانی لە هەژار، نەدار، کۆچکردووان، خاوەن سەرچاوەی داهاتی نزم، پیشەوەرانی پیشە میللییەکان و چالاکی نافەرمییە.

٤. بوونی حاڵەتی شێواوی لە ڕووخساری یەکەکانی نیشتەجێبوون و بەیەکداچوون و نزیکبونەوەیان لە سنووری شوێنە گشتییەکان لە ئوتێل و شوێنەکانی کاتبەسەربردن.

٥. زۆربوونی پەتا و گرفتە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان لە بێکاری، نەخوێندەواری ...هتد.

٦. بوونی خانووی پێکەوەنراو لە تەختە و لەوح و کارتۆن ...هتد، کە زۆرینەیان خزمەتگوزاری ئاو ئاوەڕۆی نییە.

٧. دانیشتووانی گەڕەکی دواکەوتوو دوورن لە بەشداری لە کایەی سیاسی یان بەشداری ئاراستە سیاسییە ڕادیکاڵییەکان.

٨. کەمی یان نەبوونی خزمەتگوزاری ئاو، کارەبا، گەیاندن و دامەزراوەی بەسەربردنی کات..هتد.

٩. چڕی دانیشتووان لە ئاستێکی بەرزدایە و قەرەباڵغی بەردەوامی هەیە.

١٠. سیستمی بەهایی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە هەڵقوڵاوی واقیعی کۆمەڵایەتی و کولتووری خۆیانە.

لەچوارچێوەی توێژینەوەولێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە ئامادەیی گەڕەکە دواکەوتووەکان(فەرامۆشکراوەکان) زیاتر لە پۆلێنکردنێک بوونی هەیە، لەوانە پۆلێنی « بیرجل» کە (سێ) فۆرم لە گەڕەکی دواکەوتوو دەخاتەڕوو:

١. گەڕەکی دواکەوتووی ئەصڵی: پێکهاتووە لە کۆمەڵێک بینای نەگونجاو، کە قابلییەتی ئەوەی نەماوە چاکبکرێتەوە و پێویستی بە ڕووخان و بنیاتنانەوەیە.

٢. گەڕەکی کۆچکردووان: پێکدێت کاتێک خێزانەکانی چینی مامناوەند و چینی باڵا گەڕەکەکە بەجێدێڵن و گەڕەک ئاراستە دەبێت بەرەو وێرانکاری.

٣. گەڕەکی دواکەوتوو(فەرامۆشکراو): ئەو ڕووبەرەیە کە لە دەوری ئوتێلە پلە نزم و هەرزانەکان پێکهاتووە و زۆرینەی شوێنی نیشتەجێبوونی بێنەوا و ماڵی لەشفرۆشی و خانەی خواردنەوەی هەرزانە و لە ڕووی ئابوورییەوە لەلایەن ستافی بەڕێوەبردنی شوێنی قومار و ماددەی هۆشبەرفرۆشی بەڕێوەدەچێت. سەرئەنجام ئەم جۆرە گەڕەکە دەبێتە سەرچاوەی مەترسی بۆ لایەنی ئاکاریی و ئاسایشی شار.

لەکاتێکدا ئەم پۆلێنە بۆ فۆرمەکانی گەڕەکە دواکەوتووەکان(فەرامۆشکراوەکان) پراوپڕ بەسەر زۆرێک لە شارەکانی وڵاتە گەشەسەندووەکاندا جێبەجێ دەبێت، پۆلێنێکی تر لەلایەن» هیربرت جانز» وە بۆ گەڕەکە دواکەوتووەکان خراوەتەڕوو، کە زیاتر پشتی بەستووە بە ڕادەی گونجاندنی کەسە کۆچکردووەکان لەگەڵ فۆرمی ژیانی شارنشینیدا، لەو پۆلێنەدا گەڕەکی دواکەوتوو دەبنە دوو فۆرم:

١- ڕووبەری هاتنەناوەوە: کۆچکردووانی گوند و دێهاتەکان ئەم گەڕەکانە وەک شوێنێکی نیشتەجێبوون و جێگیربوون دادەنێن و هەوڵدەدەن بە بەردەوامی بگونجێن لەگەڵ ستایلی ژیانی نیشتەجێبووانی شار.

٢. گەڕەکی دووەم: ئەو کۆچکردووانەی کە سەرکەوتوو نەبوون لە پرۆسەی گونجاندن لەگەڵ کولتووری شار و ستایلی ژیانی شارنشینی ڕوودەکەنە ئەم ڕووبەرانە و دەبنە خاوەنی نەریت و ستایلی ژیانی هاوبەشی خۆیان.

بە هاوتەریبی لەگەڵ چەمکی گەڕەکی دواکەوتوو دوو چەمکی تر تیشکی خراوەتەسەر لە چوارچێوەی گرفتەکانی شاردا، ئەوانیش چەمکی چالاکی نافەرمی و توێژە فەرامۆشکراوەکانن.

ئەوەی پەیوەستە بە چالاکی نافەرمییەوە بۆچوونی جیاواز پێناسەی دەکات و فۆرمێک لە سیما و تایبەتمەندی بۆ دادەنێت، لەوانە: چالاکی نافەڕمی داهاتی جێگیر زامن ناکات و کاتییە و سەربەسەر پێداویستییەکانی تاکەکان دابین ناکات و بە فۆرمێک لە فۆرمەکان لەلایەن کەرتی گشتییەوە بەکاربردنی بۆ ئەنجام دەدرێت.

فەرامۆشکراوانیش بەتایبەتی لە چوارچێوەی گەڕەکە دواکەوتووەکاندا هەریەکە لە: هەژار، نەدار، خاوەن داهاتی سنوردار، بەتەمەنەکان، کۆچکردووەکان....هتد دەگرێتەوە، کە زۆرینەیان نیشتەجێی گەڕەکە دواکەوتووەکانن.

ئەوەی مایەی سەرنجە لە خوێندنەوە کۆمەڵناسییەکاندا، دەگمەنە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە کە ئەنجامدرابێت لەسەر پێگە و کاریگەری بەها ئایینی و کولتوورییەکان و دامەزراوە خێرخوازیی و هاوکارەکان لە ڕووی پێشکەشکردنی پاڵپشتی ماددیی و ڕەخساندنی هەلی کار و فۆکەس کردنە سەر چەسپاندنی بەهاکانی هاوکاریی و پێکەوەژیان ...هتد لە چوارچێوەی گەڕەکە دواکەوتووەکاندا (فەرامۆشکراوەکاندا).

## سەرچاوەکان


- جابر مليكة و حماني فضيلة، تنمية العمران الصحراوي وأثره على الخصوصية الثقافية: دراسة تحليلية لعمران مدينة ورقلة عبر التاريخ، ورقة بحثية مقدمة لأشغال الملتقى الدولي تحولات المدينة الصحراوية- تقاطع مقاربات حول التحول الاجتماعي والممارسات الحضرية يومي ٣-٤ مارس ٢٠١٥.
- د.غريب محمد سيد أحمد و د.السيد عبدالعاطي السيد، علم الاجتماع الريفي والحضري، دار المعرفة الجامعية، مصر، ١٩٨٨.
- د. كايد خالد عبدالسلام، جغرافيا المدن، الجنادرية للنشر والتوزيع، الطبعة الأولى، ٢٠١٧.
- د. محمجوب عطية الفائدي، علم الاجتماع الحضري، الهيئة القومية للبحث العلمي، بنغازي - ليبيا، ٢٠٠٤.
- سلاطنية رضا، الاحياء المتخلفة والنمو العمراني(دراسة ميدانية لحي الزرقاء)، رسالة ماجستر، كلية العلوم الانسانية والعلوم الاجتماعية، جامعة منتورى، الجزائر، ٢٠٠٦.


پەروەردە
لە شار و لە لادێ
بوخاری عەبدوڵڵای قەسری
لەدایکبووی ١٩٩٠، هەولێر، خاوەنی دوو پەرتووکی
وەرگێڕدراوە، مامۆستایە لە بەشی ئینگلیزی زانکۆی
سەلاحەدین.

پەروەردە وەک رەهەندێکی جەوهەریی لە پێکهێنانی کیانی مرۆڤ، پرۆسێسێکی پێکەوەلکاوە لەو شوێن و خاڵە جیۆگرافییەی کە مرۆڤ تێیدا گەورە دەبێت و پێدەگات. شوێن و پەروەردە دووانەیەکی پێکهەڵاتوون، لێکجیانابنەوە و کاریگەریی لەسەر یەکتری دادەنێن. لە یادداشت و یادەوەریی هەر مرۆڤێکدا ئەو کاریگەرییەی (شوێن)، چ لادێ بێت یاخود شار، بوونێکی بەرجەستەی هەیە و لە یاد ناکرێت.

هەموو ئەو کەسایەتییەی کە مرۆڤ هەیەتی لە دید و هزر و رەفتار و باوەڕیدا لە ئامێزی نشینگە و ماڵ و ژینگەی دەوروبەریدا دروست دەبێت، لە هەر بستێک (شوێن) ساتێک یادەوەریی و ڕووداو وجودی ڕیشەیی هەیە. بۆیە دەشێت کاتێک قسە لەسەر پەروەردە دەکەین ئەوە لە یاد نەکەین کە (شوێن)ی پەروەردەبوونی مرۆڤ بە ئەندازەی بنەما و ڕێبەرە پەروەردەییەکە و بە ئەندازەی مەعریفە و گەیاندنی مەعریفەکەش ئەرزشی تایبەت بە خۆی هەیە. هەر بەم بۆنەیەشەوە لەم نوسینەدا جەخت لەسەر پێوەندی شار و لادێ، وەک دوو فۆرمی (شوێن)، لەگەڵ چەمکی (پەروەردە) دەکەمەوە.

شار و لادێ وەک دوو مەڵبەند و دوو لانەی ژیان لە پەروەردەکردنی مرۆڤدا بەشدارن. هەرکامیشیان لە ژینگە فیزیکییە بینراوەکەیاندا سرووشتی تایبەت بەخۆیان هەیە، بۆیەش ئەزموونی جیاوازی ژیان بە مرۆڤ دەبەخشن. دەکرێت کەمێک لەسەر ئەم خاڵە هەڵوەستە بکەین:

شار بە سرووشتی قەرەباڵخییانەی خۆی، پڕە لە هەمەچەشنی و تێکەڵاویی و زۆر و بۆری و جەنجاڵی. پڕە لە دەنگ، هەر لە دەنگی ئۆتۆمبێل و شەقام و شۆستەکان، تا کارگە و ماکینە مۆڵ و بازاڕەکان، ئەمجا دەنگی فڕۆکە و شەمەندەفەر و هەموو ئامراز و ئامێرەکانی گواستنەوە و گەیاندن. بۆیە دەنگ لە شاردا بوونێکی بەرز و زل و بەرجەستەی هەیە. ڕێک بەپێچەوانەوە، لە لادێدا دەنگ بوونێکی ساکار و کزۆڵ و هێمنی هەیە. مەگەر دەنگی دیاردە سروشتییەکانی وەک ئاژەڵ و باڵندەکان یا تاڤگە و ڕووبارەکان لە گوندا هەبێت، کە هارمۆنی و سازانێکی گونجاویان لەگەڵ یەکدیدا دروستکردووە، بەپێچەوانەی دەنگ لە شاردا کە قەرەباڵغ و پچڕ پچڕ و بە هوژمەیە. لێرەوە دەشێت بڵێین کە (دەنگ) لە شار دروستکراوی مرۆڤە، لە ئەنجامی ئامێر و ئالەت و ماکینەوە سەرهەڵدەدات، واتە مرۆکردەیە، بەڵام لە لادێدا دەنگ سرووشتییانە و خۆڕسکانەیە. لەم سۆنگەیەوە، دەشێت ئەوە بگوترێت کە بیستنی دەنگ چ لەلادێ بێت یان لە شار هەر لە منداڵییەوە تا پیربوون و مردن و، بەو جیاوازییانەی لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردن، کاریگەریی پەروەردەیی و دەروونی لەسەر ئەزموونی تاک دادەنێن و، یادەوەریی بە مرۆڤ دەبەخشن.

خاڵێکی دیکەی گەوهەریی، کە توێژەران (ئیکازارا) و (ڕۆدینکار) لە ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی پەروەردەیی OECD (ل٢٥) باسیان لێوەکردووە، ئەوەیە کە گوند بە هەڵکەوتەی جیۆگرافییانەی خۆی دوور لە چەق و لاپەڕگە و دورەدەستە، بۆیە ناکەوێتە سەنتەری قەرەباڵغی دانیشتوانی دەوڵەتەوە. دانیشتوانی گوند چڕییەکەی کەمە و ڕووبەری خانوو و ماڵ پانتاییەکەی زیاترە تا لە خانووی شار. بەپێچەوانەوە شار هەمیشە چەقی ڕێ و بان و هاتوچۆیە بۆیە پڕاوپڕە لە چڕی دانیشتوان و هاوڵاتی زۆری تێدا نیشتەجێیە، ڕووبەری خانوو وماڵیش لە شار بچوکترە بە بەراورد بە لادێ. ئەم حاڵەتە جیایەی شار لە لادێ وایکردووە کە شار دانیشتەی چەندین نەتەوە و هۆز و خێڵ و گرووپی کۆمەڵایەتی و خوێن و ئاینی جیاوازی تێدا خڕببێتەوە، کە لە زانستی دیمۆگرافیادا پێیدەوترێت (میترۆپۆلیتان، واتە شاری فرەڕەگەز) بەڵام لادێ لە وێنە سادەییەکەی دانیشتواندا زۆربەی جار لە یەک خێڵ و هۆز، یان یەک خێزانی گەورە، یان

لانیکەم یەک نەتەوەی وڵاتێک پێکدێت، کە چەند هۆکارێکی سرووشتی پێکەوە کۆیکردوونەتەوە. ئەم دوو فۆرمە جیاوازەی نیشتەجێبون دوو فۆرمی جیاواز بە پەروەردەی مرۆڤ دەبەخشن.

لێرەدا حەوجێی ئەوەیە بپرسین کە ئاخۆ چلۆن پەروەردەی شار و لادێ دوو شکڵ و رێباز و بنەمای جیاوازیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە؟

ئیکازارا و رادینکار ئاماژە بەوە دەکەن لەبەرئەوەی لادێنیشینان یەکتری لە رەچەڵەکەوە باشتر دەناسن تا شارنشینییەکان و، زۆرتر لەگەڵ یەکتر تێکەڵاویی خزمایەتییان هەیە، بۆیەش هەندێک بەهای کۆمەڵایەتی پتەو بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە. ئەم بەهایانەش هەر لە لەدایکبوونەوە تا مردن لەگەڵیاندا دەمێننەوە و لەسەری گۆش دەکرێن و پەروەردە دەکرێن. بەهای کاری بە هەرەوەز و بەکۆمەڵ، دەستبارگرتن و هاریکاری کەسی لێقەوماو، هاموشۆ و پێکەوەهەڵکردن، زبارە (کاری بە کۆمەڵ) و دەستی یەک گرتن و پشتی یەکدیبەرنەدان لەناو لادێدا بوونێکی زیاتری هەیە تا لە شاردا، بۆ وێنە: لە هاوسەرگیریدا یان لە دروستکردنی ماڵ و خانوودا، یان کشتیاریی و ئاودێریی و پیشەوەرییدا گوندییەکان زیاتر هانا بۆ یەکتر دەبەن و پشت بە هاریکاری یەکتر دەبەستن (بروانە ئیکازارا و رۆدینکار، ل١٢ و گرییف ل١٣)، ئەمەش بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:

یەکەم/ لادێ خەڵکێکی کەمتری لێ نیشتەجێیە، بۆیە بواری پتر هەیە بۆ تۆخبوونەوەی بەها کۆمەڵایەتییەکان و پێکەوەهەڵکردن و، پابەندبوون بە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان کە لە باب و باپیرانەوە بە میرات ماوەتەوە بۆ وەچەی تازە. ئەمەش شوناسێکی هاوبەشی بۆ دروستکردوون.

دووەم/ لە لادێدا کولتوورپارێزی، بە واتای پاراستنی شوناسی نەریت و نۆرم و شێوەژیانی کۆمەڵایەتی، زیاتر بوونی هەیە تا لە شاردا. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەتەی کە شار بەو فرەیی و قەرەباڵغییەی کە هەیەتی زیاتر بواری خۆئەبدەیتکردنەوە و نوێبونەوە و وەرگرتنی کولتووری نوێی تێدا هەیە، کولتوورە جیاوازە هاوچەرخەکان لە شاردا کۆدەبنەوە و گۆڕان بەسەر مۆراڵ و بیروهزر و نەریتی مرۆڤدا دەهێنن، بەپێچەوانەی لادێ کە بەوپێیەی لاپەرگە و دوورەدەستە درەنگتر خۆی ئەبدەیت دەکاتەوە و، زیاتر پارێزگاریی لە شوناسی کولتوورییانەی کۆنی خۆی دەکات، تەنانەت ئەگەر گۆڕانی کەلتووریی و نەریتی و ئەخلاقی کۆمەڵایەتییش لە لادێدا بێتەدی، ئەوا زۆر هێواشتر و خاوترە بە بەراورد بە شار. بۆیەش لە رووی پەروەردەییەوە تاکی لادێنشین لەسەر نەریتی باب و باپیرانی (لە رێورەسمەکانی هاوسەرگیریی، سوڵح، مەسڵەحەت، شەڕ و ئاشتی، بەرگریکردن لە خوێن و خاک، دەسترەنگینی، پیشەوەریی، ئاین و ئاینزادۆستیی) پارێزگارترە لە کەسێکی شارنشین، کە دەشێت کەسێکی شاری ئەمڕۆ بەهایەکی کۆمەڵایەتییانەی هەبێت، بەڵام سبەی دنیابینی و بۆچوونێکی دیکەی هەبێت، یان هێندە لەسەر پاراستنی نەریتە کۆنەکان کۆک و سوور نەبێت.

لەم رووانگەیەوە، یەکەمین ئەرکی خێزانی لادێنیشین دوای هاتنەدنیای منداڵ بریتییە لە پارێزگاریکردن لەو رێورەسمە کۆمەڵایەتییانەی کە بەر لە دروستبوونی ئەم خێزانە وەچەی دیکەی پێشوو لەسەری پێگەیەنراوە و پەروەردە کراوە. بەگوتەی توێژەران (سایمۆنا بریسکۆ و کارمین بابایتا)، هەبوونی پاکێجێک لەو هەمووە ئەزموون و بەها دەوڵەمەندەی باب و باپیرانی زوو لە لادێدا ( لە چیرۆک و حەکایەت و پەند و نەستەق و ئامۆژگاری و زانیاری) سامانێکی کەلەپووری بە بەیاخە بۆ وەچەی تازەپێگەیشتووی لادێ کە دەکرێت وەک کەلەپووری نەتەوە و دەوڵەتیش سەیری بکرێت و لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی کەسایەتی مرۆڤی تازە سودی لێوەربگیردرێت،

نەک فەرامۆشبکرێت(ل٨٠).

دەبێت ئەوەش بگوترێت کە لە شاردا ئامادەیی دایک و باوک بۆ گۆڕینی قەناعەتەکانیان لەبارەی پەروەردەی منداڵ خێراترە تا لە لادێ، قبوڵکردنی بەهای کۆمەڵایەتی نوێ زیاتر هەیە بۆئەوەی منداڵەکانیان لەسەری پەروەردە بکەن، واتە سیستەمی پەروەردەکردنی تاک لە شاردا بۆ خواستە شارییە ئاڵۆزترەکان وا لە دایک و باوکی شار دەخوازن زیاتر منداڵەکەیان بۆ داهاتوو ئامادە بکەن نەک ڕابردوو (وەک ئەوەی ئەوان لەسەری پەروەردە کراون). بەم بۆنەیەشەوە منداڵی شاریی کەمتر لەسەر کەلەپوور و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو پەروەردە دەکرێت، بەڵکو لەسەر کارامەییە بازاڕییەکانی شار و خۆئامادەکردن بۆ ئاڵێنگارییەکانی داهاتوو پەروەردە دەکرێن. جا لێرەدا قسە و باس لەسەر حوکمدانی ئێمە نییە لەسەر «باشی» و «خراپی» هیچکام لەم دوو میتۆدە پەروەردەییە، بەڵکو خستنەڕووی دوو فەلسەفەی جیاوازی پەروەردەیە کە کار لەسەر ڕوواندنی هەستی خۆناسین دەکەن لە مرۆڤی تازەدا. کە دەشێت کاتێک قسە لەسەر پەروەردەی مرۆڤ لە شار و لادێ دەکەین ئەوە بە نادیدە نەگرین کە گوند جۆرێک لە پەروەردە بۆ مرۆڤ دەخاتەبەردەست کە کەلەپوور چەقە و پاراستنی شوناسی گوندییانەی تاڕادەیەک نەریتخوازانەیە، بەڵام شار فۆرمێک لە پەروەردە بەرهەمدەهێنێت کە بازاڕسەنتەرە و جۆرێکیشە لە خۆدابڕین لە تێگەیشتنە کۆنەکان بەرەو تێگەیشتنی تازە.

جا هەر لەبەر ئەوەشە کە شارییەکان ناچاردەکرێن لەبەر لێشاوی جیهانگیری (العولمە) دا خواست و بەها پەروەردەییەکانی خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو بازاڕەی کە شار دەیەوێت، بەڵام لادێنیشیان پارێزی پتر دەکەن لەسەر ئەو بەهایانەی کە بەهۆی لاپەڕگەبوونیانەوە خوویان پێوەگرتووە و لەسەری گۆشکراون و دەشیانەوێت لەسەری بمێننەوە. چونکە ئەوان چەق نین و جیهانگیری کەمتر دەخالەت لە ژیانیان دەکات. لەم سۆنگەیەوە، وەرگرتنی هزری تازە و خوێندنەوەی تازە لەبارەی پەروەردەی منداڵ لە شاردا هەبوونی بەرجەستەترە تا لە لادێ دا، گۆڕانگارییەکانیش لە شێوەی پەروەردەکردنی منداڵ لەشار خێراترن، لە شاردا ئامادەییەکی زیاتریش هەیە بۆ وەلاخستن و پشتگوێخستن و بێدەنگ کردنی هەندێک لەو دید و دنیابینی و بەها کۆمەڵایەتییانەی کە باب و باپیران لەسەری ڕۆیشتوون و، بەهەندیان زانییوە بۆ پەروەردەی منداڵ ( بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە گرییف، ل١٣ – ١٤).

گەرچی ئێستا تەکنەلۆژیا (بەتایبەت ئەنتەرنێت) مەودا و دووری نێوان شار و لادێی کەمترکردۆتەوە بە بەراورد بە جاران، بەڵام دەستگەیشتن بە (زانیاری) و (مەعریفە)ی تازە، لە شاردا ئاسانترە تا لەلادێ. بۆیەش شارییەکان هەلی ئاسانی خۆنوێکردنەوە بە زانیاریی و زانستی تازەیان پتر لەبەردەمدا کراوەیە بە بەراورد بە گوندییەکان. شار کە چەقی گردبوونەوەی توانست و کارامەیی و ئەزموون و ئاوەزی جیاوازە، هەلی ئینشاکردنی قوتابخانە و ڕێکخراو و بارەگا و دەزگا و دامەزراوەی پەروەردەیی و ڕۆشنبیری زیاتری هەیە تا لادێ. واتە ئەزمونە پەروەردەییە کەڵەکەکردووەکان لە شۆڕشی زانیاریی و تەکنەلۆژی لە شاردا پتر خۆیان دەردەخەن، مرۆڤی شارنیشین ئاسانتر دەتوانێت خۆی ڕابهێنێت لەگەڵ خواستە هزریی و زانستییەکانی سەردەم، چونکە هەلی گەیشتن بەو زانست و زانیارییە زیاتر لە بەردەمدا ئاوەڵایە تا کەسێکی لادێنشین کە کەمتر چاوی لەسەرە و دوورەدەستتر و نامەرکەزییترە، کەمتریش لە هەواڵ و کارتێکردن و گۆڕانکارییە سەردەمییەکان بە ئاگایە، گەرچی وەک زووتریش وتمان، مرۆڤی شار و لادێ ئێستا بە پەنجە و کلیکی ئەنتەرنێت و فەیسبوک دەتوانن بە چرکەسات ببنە

خاوەنی زانیاریی تازە (بڕوانە: سایمۆنا بریسکۆ و کارمین بابیتا، ل٨٠).

هەر هەمان توێژەران ئەو تێزە دەخەنە بەردەست کە گوند بە سرووشتی خۆی شێوەژیانێکی ناچەقیی (نامەرکەزیی) هەیە، لاپەڕگەیی و دوورەدەستیی گوند و تەنانەت سرووشتی دەشتەکیی و شاخاوی گوند وایکردووە کە فۆرمێکی تایبەت بەخۆی لە پێگەیاندنی کەسایەتی تاک هەبێت، بۆیە ناکرێت پەروەردەکردنی منداڵی گوند وەک پەروەردەکردنی منداڵی شار بێت، چونکە مرۆڤ بۆ کەش و ژینگە و خواستی ئەو پێتەشوێنەی لێی دەژیت پێدەگەینرێت و گەورەدەکرێت، ڕەنگە دوای گەورەبوونی توانستی ئەوە بەدەستبهێنێت کە خۆی فۆرمەڵەی کەسایەتییەکی تایبەت بەخۆی بکات، لە خۆگونجاندنی بۆ شوێنێکی دیکەی تازەدا (ل٧٨–٧٩).

بۆیە هەندێک لە پەروەردەناسان پێیانوایە کە پرۆگرامی پەروەردەیی گوند دەبێت جیاواز بێت لە پرۆگرام و سیستەمی پەروەردەیی شار، بەجۆرێک کە لانیکەم پرۆگرامی پەروەردەیی گوند مرۆڤێک پێبگەیەنێت کە کشتوکاڵییانە لەسەر پێی خۆی بوەستێت بۆ بەرهەمهێنان و داهێنان و خودبەڕێوەبردن، سود لە ژینگەکەی وەربگرێت بۆ خۆژیاندن، بە سودوەرگرتن لە شێوەژیانی ئاژەڵداریی و کشتیاریی و ئاودێریی و باخەوانیی گوندییانە (وەک ئەوەی زۆر وڵات برەوی پێدەدەن و ئەو جۆرە قوتابخانە گوندییانەیان ناو لێناوە کێڵگە قوتابخانەییەکان School Farms)، نەک ئەو فێرخوازە ناچار بکرێت بەوەی شوێنەکەی لە گوندەوە بگۆڕێت بۆ شار بۆئەوەی ببێتە موچەخۆر و فەرمانبەری میریی و دابمەزرێت، بۆئەوەی بتوانێت بژیت! چونکە ئیکازارا و ڕادینکار ئاماژە بەوە دەدەن لە زۆربەی وڵاتاندا ئێستا کۆچی گوندنشینەکان بۆ شار کێشەیەکی ئابووریی و ڕامیاریی و کولتووریی گەورەیە، دەبێت سیستەمی پەروەردە مرۆڤی گوندی بۆ ژیانی گوند ڕابهێنێت و ناچاری نەکات پەنابەرێتە بەر شار بۆئەوەی بژی و بمێنێتەوە (ل١٢). لەمبارەیەوە (گرییف) دەڵێت: «زۆربەی جار لادێنشینان ئەو شتانەیان ناوێت کە ئێمە پێمانوایە دەبێت بیانەوێت، شێوەژیان و بیرکردنەوەیان لە ئێمەی شاریی (کە خاوەنی دەزگاکانی دەوڵەتین) جیایە« (بڕوانە: گرییف، ل١٥ ، هەروەها ڕاپۆرتی HADF، ل١٦).

دەشێت مرۆڤی ئێستا بۆ دنیای تازە پەروەردە بکرێت (لە خواستە زانستی و تەکنەلۆژییە بازاڕییەکەیدا)، بە سودوەرگرتنیش لە کەلەپوور و بەها و ئەزموون و ئەدەبیات و نۆرمە کلاسیکییەکانی ڕابردوو، ڕەنگە ئەمەش پردێکی پتەو بێت بۆ بە یەکگەیاندنی شار و لادێ، بەیەکگەیاندنی کۆن و تازە، سروشت و پیشەسازی، کولتوور و بازاڕ. بەڵام ئەوە قسە و باسی ئێمە نییە لێرە، دەشێت لە شوێنێکی دیکەدا پتر لەسەری بڕۆین.

مرۆڤی شار لە پەروەردەی خێزانیدا و لە دەزگاکانی خوێندن و میریدا، وەها پەروەردە دەکرێت کە ئامادە بکرێت بۆ ئەم سەردەمەی ئێستای دنیای (خێرایی speed ). مرۆڤی شاریی، بەخواستی خۆی بێت یان نا، قورمیشکراوە بۆ هێندێک ڕۆتینی خێرا، کە پچڕپچڕن، زوو دێن و دەڕۆن، کە هەموو ڕۆژێک دەبێت ئەزموونی بکات. بۆ وێنە، دەبێت لەکاتێکی دیاریکراو بخەوێت، کاتژمێرەکانی خەوتنی ڕۆبۆتییانەن، لەکاتێکی دیاریکراو بە پرۆگرامێکی کاتژمێر یان مۆبایل لە خەو هەستێت، پاشان خۆی بگۆڕێت بە بەرگی (کار) جا لە هەر شکڵێک بێت (واتە لیباس و پۆشاکی کارکردنیشی دەبێت دیاریکراو بێت و ئەو ڕەنگە بێت کە خوازراوە)، پاشان بە ئامرازەکانی گواستنەوە لە شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل و پاسکیل بچێتە کار، لە دەستکەوتنی ئامرازی گواستنەوەی گونجاویش دەبێت خۆی بهێڵێتەوە و لێی بزانێت کە چەندە لەگەڵ گیرفانیدا گونجاوە، قەرەباڵغی شۆستە

و شەقام و ڕێوبان دەبێت ببینێت، لەوێش شوێنی کارکردنی دیاریکراوە، تەنیا یەک ژوورە، دەبێت بە مۆڵەت بچێتە دەرەوەی فەرمانگە، دەبێت پەنجەمۆر بکات، جوڵەکانیشی لەژێر کامێرای چاودێریدایە. دەبێت تەنها لە یەک کاتژمێردا نان بخوات، پاشان بگەڕێتەوە سەر ئەرکەکانی، لە گەڕانەوەشی بۆ ماڵ دەبێت بە هەمان ڕۆتین بگەڕێتەوە ماڵ، مەگەر لەسەر ڕێگە لە مارکێتێکی قەرەباڵغدا بۆ کڕینی هەندێک خۆراک لابدات دەبێت لەوێش لە سەرەی کاشێر بوەستێت و پابەندی ڕێنماییەکان بێت. هەموو ڕۆژێک ئەو حاڵەتە دووبارە دەبێتەوە، مەگەر یەک ڕۆژ یان دووان نەبێت لە هەفتە بۆ پشوو دیاریکراوە.

بۆیە لە پەروەردەکردنیدا مرۆڤی شاریی هەر لە منداڵییەوە فێری پابەندبوون بەو خێراییە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی دەکرێت، فێری پابەندبوون بە ئەتەکێتە کارگێڕیی و خێزانی و گشتییەکان دەکرێت. فێری ئەوەش دەکرێت کە چێژ لەو دووبارەبوونەوەیە وەربگرێت، فێری ئەوە دەکرێت کە چۆن مامەڵە لەگەڵ قەرەباڵغی (شار) بکات و جێگەی خۆی بەپەلە لە فەزای گشتی بکاتەوە، لە وەرگرتنی بەشە بلیت و موچە و نەوت و کارەبا و بەنزین و خۆراکی خۆی...هتد. لە هەموو شتێکیش دەبێت بەشێکی کەم وەربگرێت، بە خێرایی بەکاریبێنێت و زووش وەریبگرێتەوە. بۆیەش شێوەژیانی شار بەبۆنەی جەنجاڵییەکەیەوە وا لە مرۆڤ دەخوازێت کە بۆ هەرکام لەم ڕۆتینیانەی سەرەوە پەروەردە بکرێت لەسەر ڕۆحییەتی ململانێ لەپێناو مانەوە لەنێو قەرەباڵغییەکی زۆری مرۆڤەکانی تردا.

بەڵام لە لادێ دا مرۆڤ بۆ ئەم ڕۆتینانە پەروەردە ناکرێن، مرۆڤی لادێ لە ئەنجامدانی ئەرکە ڕۆژانەییەکانی هێواشتر و ئارامتر و پشودرێژترە. ژینگەی لادێ، بەوپێیەی لەناو سرووشتە، داخوازی پەلەکردن و هەڵپە و پچڕپچڕکێنەی لە مرۆڤ ناوێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە ناخێکی ئارامتر و پشوودرێژتر و هێواشتر و سەربەستانەتریشی بۆ فەراهەم دێنێت، تەنانەت پەروەردەی لادێ لەبەرئەوەی لەناو باخ و چیا و دەشت و بێستان و جەنگەڵی سرووشتە، ناخێکی ئیستاتیکانەی جوانپەروەرانە لە مرۆڤ دروست دەکات کە ئەرزشی (جوانی) یش بزانێت (بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە بۆچوونەکانی فەیلەسوفی هیند تاگور، هەروەها پەروەردەناسی کورد د. عەبدوڕەحمان وەهاب). لەمبارەیەوە (عەبدوڕەحمان وەهاب) لە وتارێکدا بەناوی «جوتیار چۆن پەروەردە دەکرێت؟» نوسیویەتی:»جیهانی کشتوکاڵ و ژیانی جوتیار فەرهەنگ و دنیابینی تایبەت بەخۆی هەیە (...) کەشوهەوا و وەرزەکانی ساڵ و خاک و تۆو و ئەمانە کاری لێدەکەن، چاوەڕوانی و پشودرێژی بەنمونن».

خاڵێکی تر، مرۆڤی لادێ پەروەردە دەکرێت لەسەر ڕۆحییەتی مانەوە لەنێو سرووشتدا. واتە ململانێی مرۆڤی لادێ هێندە لەگەڵ مرۆڤەکان نییە بە ئەندازەی ئەوەی کە ململانێیەکەی لەگەڵ سرووشتدایە. مرۆڤی لادێنشین هەم دۆستایەتی و هەمیش دوژمنایەتی لەگەڵ سرووشت هەیە. بۆیە لە پەروەردەی خێزانیدا ئەو هەستە لە مێشک و دەروونی مرۆڤی لادێدا دەڕوێنرێت کە دەبێت کونج و کەلەبەری سرووشت باش بناسێت، خۆی لەگەڵ سرووشت هەڵبکات و بە بوێریی و وریاییشەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەوپێیەی کە گەرچی سرووشت جێگەی پشتپێبەستنە بۆ مرۆڤ لە دابینکردنی ڕزق و ڕۆزیی و نان و بژێوییەکەیدا، بەڵام سەخت و خەتەرناک و فەوتێنەریشە، بۆیە دەبێت بزانێت چۆن لەگەڵیدا دەژیت.

مرۆڤی لادێنشین لەپێناوی مانەوەی خۆی و خانەوادەکەی، لە چلەی گەرما و سۆڵەی زستاندا چنگەکرێ دەکات لەپێناوی دابینکردنی نشینگە و لانەی ژیان کە شوێنێک بۆخۆی دابین بکات نە

گەرمێکی مرێنەر و نە ساردێکی فەوتێنەر بێت. بۆیە هەر لە منداڵییەوە وا پەروەردە دەکرێت کە بە چنگ و قامی خۆی پیشەوەریی دروستکردنی ئامێر و ئالەتی (سۆبە و کوپە و گۆزە و باگوردان و ئاگردان و ساردخانە..هتد، فێرببێت. توێژەران (بیریسکۆ) و (باباتیا) جەخت لەوە دەکەنەوە کە فێربوونی پیشەوەریی و پیشەسازی، بۆ پشت بە خۆبەستن، بەتایبەت بۆ کشتیاریی و ئاودێری، نابێت لە پەروەردەی گوندنیشینییەکان جیاببنەوە و دەبێت گرنگییان پێ بدرێت (ل٧٩-٨٠).

نوسەری بەریتانی (سینج) لە شانۆی (سواربووەکانی دەریا) Riders to the Sea باس لەوە دەکات کە لە باشووری ئێرلەندادا، گوندنیشنییەکان گەرچی دەیانزانی دەریا و ئاو خنکێنەرن بۆ مرۆڤ و دەبێت لێیان بترسین و بە وریاییەوە لەگەڵیاندا مامەڵە بکەین، بەڵام ئەوان هەر لە بچوکییەوە وەها لەلایەن دایک و باوکانیانەوە پەروەردە دەکران کە بۆ چنگ خستنی رزق و رۆزی خۆیان نەوەستن، وا پەروەردە دەکران کە بۆ نان و بژێویان پشت بە سرووشت ببەستن، لەپێناوی راوکردنی ماسی بۆ خواردن و دۆزینەوەی گەوهەری بەنرخ لەژێر دەریا هەرگیز لە کارکردن نەوەستاون، لەسەر پێی خۆیان وەستاون، تا ئەوساتەی تەنانەت لە یەک خانەوادەدا دوو برا بەناوی (مایکل و بارتلی) و باوکیشیان لە راوەماسیدا بەهۆی شەپۆلە سەختەکانی دەریا تووشی خنکان هاتوون، بەڵام بۆ هەمیشە لەناو گوندەکە ناویان وەک پاڵەوان و ئازا دەهێنرێت لەوەی کە بوێر و چاونەترس بوون، لەپێناوی پەیداکردنی نان بۆ خانەوادەکانیان تێکۆشاون و لە مردن و لە سرووشت نەترساون.

لە پاڵ ئەمەدا، (بریسکۆ) و (بابیتا) ئەوە دوپات دەکەنەوە کە دەبێت کەرەستە پەروەردەییە خانەوادەییەکەی پەروەردەی لادێ بریتی بێت لە سوودوەرگرتن لە سامانە سرووشتییە خواکردەکان، لە ئاژەڵ و ئاووهەوا و خاک و ئاگر، لەوەدا کە چۆن لەگەڵیان هەڵبکەین و بەهۆیانەوە ژیانمان بسورێنین و بژین و بۆ هەمیشە بمێنینەوە (بڕوانە ل٧٩). بۆیەش مرۆڤی لادێ وەها پەروەردە کراوە و وا پەروەردە دەکرێت کە ئاڵێنگارییەکەی لەگەڵ سەختییەکانی سرووشت بە دەرفەت بزانێت بۆ ئەوەی لەسەر سرووشت بژی و بمێنێتەوە، تەنانەت پیشەسازییەکەشی زۆر سرووشتییانەترە تا پیشەسازییە کیمیاویی و تەکنۆلۆژییەکەی مرۆڤی شار. دەستڕەنگینی مرۆڤی لادێ لە بەرهەمهێنانی کاڵا و کەلوپەلدا زۆر خۆجێییانەن، ژینگەپارێزانە و زەمینپەروەرانەن، بەجۆرێک کە هیچ زیانێک بە ژینوار و ژینگە ناگەیەنن، بۆ وێنە پیشەسازی کشتوکاڵی خواردن و ئاودێریی و بەرهەمهێنانی ئاژەڵداریی و هەنگوینی و پەلەوەریی و شیرەمەنی و کەلوپەلی دارین لەو وێنە لەبیرنەکراوانەی گوندن کە هەمیشە خزمەتیان پێشکەش بە شار کردووە (بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ل٥-٨ ڕاپۆرتی پەروەردەی متمانەی ئەفریقی African Trust Education).

دەتوانین برەو بەو بۆچوونە بدەین کە زۆرینەی هەرە زۆری پەروەردەناسان و توێژەرانی پەروەردە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە خاڵێکی هەرە جەوهەریی لە جیاوازی پەروەردەی شار و لادێ بریتییە لەوەی کە منداڵ و نەوجەوانانی لادێ زیاتر پێویستییان بە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری هەیە لەناویاندا (لە سەرجەم کایەکانی تەندرووستی و کۆمەڵایەتی و کولتووری ...هتد). ڕەنگە هۆکاری ئەوەش بریتی بێت لەوەی کە لادێنشینان بەهۆی سەرقاڵی زیاتریان بە ڕنینەوەی بەروبومی ڕەنج و ماندوبوونیان لە کاری ڕۆژانەیان، سەرقاڵییەکانیان بە کارکردن زیاترە تا شارییەکان (هەرچەندە ئەمەش بە ڕێژە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت)، بۆیە کەمتر بواری ئەوەیان هەیە لە دەرفەت و هەلی کاتدا کە بپەرژێنە سەر پەروەردەکردنی هۆشیاریی و خودی تاک. تاک

لە شاردا بەهۆی ئەو تۆڕبەندییە تەکنەلۆژییەی کە لەبەردەستدا هەیە، هەروەها لەبەر زیاتربوونی هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن، زیاتر بواری ئەوەی هەیە بزانێت لە دنیادا چ باسە، چی دەگوزەرێت و دنیا بەرەو چ ئاڕاستەیەک هەنگاو دەنێت، بۆیە بواری ئەوەشی پتر لە بەردەمدا هەیە کە ڕێژەی هۆشیارییەکەی لەمەڕ هەر ئاریشە و باسێکدا فراوانتر بکات.

بەڵام باوکێک لە لادێدا، کە شەو و ڕۆژ خەریکی کار و کەسابەتی باخ و بێستان و لەوەڕگە و مەزرای ئاژەڵان و دەشت و کێوە، هێندە شەکەت و سەرقاڵە، پێویستی بە یارمەتی میریی و دەزگاکانی پەروەردەی ڕەسمی دەوڵەت و ڕێکخراوەکانی هۆشیاریی و مەڵبەندەکانی بواری مەدەنی و مزگەوت و مامۆستایان و زانکۆ هەیە بۆئەوەی لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیدا وردتر و دروستتر دەستبارگر بن بۆ پەروەردەی هۆش و دەروون و کەسایەتی و ڕەفتاری ڕۆڵەکەی، تا ئەو هۆشیارییە پێویستەی هەبێت کە مرۆڤی ئێستا لە دنیا حەوجێی پێیەتی. هەڵبەتە ئەوەش بەو واتایە نایەت کە باوکێکی شارنشین بەبێ یارمەتی ئەم دەزگایانە ئەتوانێت بەو ئەرکە هۆشیاریبەخشییە هەستێت، ئاشکرایە شار و لادێ هەردوک پێکەوە پێویستییان بە دامەزراوە پەروەردەییە جۆربەجۆرەکان هەیە (بڕوانە: ڕاپۆرتی HADF، ل٢، و ڕاپۆرتی پەروەردەی متمانەی ئەفریقی، ل٥).

پوختەی قسە ئەوەیە، پەروەردەکردن بریتییە لە پێگەیاندنی کەسایەتی مرۆڤ و ڕاهێنان و مەشق و برەودان پێی، (بەوبۆنەیەوە وشەی پەروەردە لە ئینگلیزیدا Education لە بنەچەدا لە وشەی لاتینی Educo هاتووە، کە بە واتای مەشقکردن و بەرزکردنەوە و برەودان دێت)، بۆیە ئەرکی سیستەمی پەروەردەیە لە کۆمەڵدا (بە هەر سێ بازنەی خێزان و قوتابخانە و زانکۆ) هەموو تێکڕا مرۆڤ لەسەر بنەماکانی (توانستی نوێ و کارامەیی و هۆشیاری و خودناسی) پەروەردە بکەن، چ لە لادێ دا کە بۆ ژینگەی لادێ لەبار بێت، مرۆڤێکی سەرکەوتووی لادێنشین پەروەردە بکەن، چ بۆ شار کە بۆ خواستی ژیانی ئاڵۆزی شار بشێت. لێرەوە دەبێت ئەوە بزانرێت کە سرووشتی ژیانی شار و لادێ لێکجیان، بۆیە پەروەردەی تاک لە هەرکامیان، فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، نابێت هیچیان بۆ ئەویتر بتوێنرێتەوە.

## سەرچاوەکان

1-Echazarra, Alfonso & Thomas Radinger. LEARNING IN RURAL SCHOOLS: INSIGHTS FROM PISA, TALIS AND THE LITERATURE. Education Working Paper. OECD: 196, 4. 8th March 2019.

2-Engler, Steven & Michael M. Kretzer. Agriculture and Education: Agricultural Education as an Adaptation to Food Insecurity in Malawi. Universal Journal of Agricultural Research 2(6): 224-231, 2014. http://www.hrpub.org/.

3-Grifliths. V.L. The Problems of Rural Education. Unesco : International Institute for Educational Planning. Educational, Scientific and Cultural Organization. USA: 1968.

4-McCracken, J. David & Jeff David T. Barcinas. Differences Between Rural and Urban Schools, Student Characteristics, and Student Aspirations in Ohio. Journal of Research in Rural Education, Winter, 1991, Vol. 7, No.2, pp. 29-40.

5-HADF (Hill Area Development Foundation). Case Study on Education Program at Loh Yo village. Report.

٦- عەبدورەحمان وەهاب، وتاری «جوتیار چۆن پەروەردە دەکرێت؟» لە ماڵپەڕی (کوردستان تایمز).



## دەمەتەقێ گرووپی گوڵنار
## لەگەڵ دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا
# لەبارەی کەلتوور و بنەمای شارەوە

فۆتۆ: شکار جەلال

دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا نووسەر و ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی پێیوایە ئێمە وەک کورد تا ئێستا خاوەنی (شار) نین و (شار) نەبووەتە بەشێک لە کەلتوور و مێژووومان و کەلتووری شارنشینی دانەگەڕاوەتە ناو ژیانمانەوە و مەترسییەکانیشی بە وردی باس دەکات. ئەو باس لەوە دەکات شار بۆ هەر کۆمەڵگە و میللەتێکی زیندووی دونیا زۆر گرنگە و پایتەختە هەرە گەورەکانی دونیا تەنانەت دوای تێکشکان و داگیرکرانیشیان، ئەوە کەلتوور و ئامادەیی شارنشینی بووە وایکردووە، کە وەک خۆیان بمێننەوە و هەستنەوە سەرپێ و خۆیان بنیاد بنێنەوە.. دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا ئاماژە دەکات تەنانەت خەڵکی گوندەکانمان کە کۆچیان کردووە بەرەو سلێمانی و هەولێر و سنە و دیاربەکر و کرماشان، تەنیا شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیانیان گۆڕیوە و هەر بە هەمان کەلتووری لادێوە هاتوونەتە ناو ئەو شارانەوە و تەنانەت دابەشبوونی جوگرافیشیان لەناو شارەکاندا بە پێوەری عەشیرەت و گوند و ناوچەگەرێتییە! لەم دەمەتەقێیەی گرووپی گوڵناردا بە وردی تیشک دەخەینە سەر کەلتوور و گرنگی شار، هەروەها مەترسییەکانی نەبوونی شار بۆ کورد و بۆ داهاتووی میللەتەکەمان.

**گوڵنار: شار چییە و بە چیی دەگوترێت شار؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: ئەگەر بۆ پێناسەیەکی شار بگەڕێینەوە لەوەچێ شار کۆمەڵێک پێناسەی هەبێ، بەڵام ئەو پێناسەیەی کەوا گرنگە شار بریتییە لە گرووپەمەندی یان کۆبوونەوەی کۆمەڵە خەڵکێک، کە لە فەزایەکی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیدا بەیەکەوە دەژین و بەیەکەوە دەتوانن ئەم ژیانە ڕێکبخەن کەوا بتوانن پێداویستییەکانی خۆیانی پێ جێبەجێ بکەن، بێگومان شار و مێژووی شار کۆنە لە مێژوودا، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر مێژووی شار دەبێ بگەڕێینەوە سەر هەزارەی پێنجەمی پێش زایینی و هەزارەی سێیەمی پێش زایینی و کۆمەڵێک شاری زۆر کۆن لەلای ئۆکرانیا و لای مەکدۆنیا و لەو جێگایانە شار هەبووە و لەوانیش زیاتر شاری کۆن هەبووە، لە هەزارەی سێیەمەوە تا هەزارەی یەکەم لە فوڕات و لە عێراقی ئێستا و لە میزۆپۆتامیا شار هەبووە، شاری بەناوبانگ هەبوون، بۆ نموونە شاری ئور لە عێراق کە لە چوارسەد هێکتاردا هەبووە، بەڵام ئەگەر بەگشتی بگەڕێینەوە بۆ سەر چەمکی شار ئەوا سەرەتای شار یانی بە مانا فراوانەکەی لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداریی شار پەیدابووە، ئەویش لە سەرەتای سەدەی یازدە و سەرەتای سەدەی دوازدە، کاتێک سەرمایەداریی گەشەی کرد ئەو شارانە و ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کەوا لە دەوری ڕووبارەکان بوون ئەمانە توانیان شار بنیادبنێن بۆئەوەی بتوانن ئەو کەلوپەلانەی کەوا دروستی دەکەن و ئەوانەی هاوردەی دەکەن بە ئاسانی بتوانن بیگوازنەوە، چونکە ئەو کاتە نە شەمەندەفەر هەبوو نە فڕۆکە هەبوو، ڕەنگە تاکە هۆکاری گواستنەوەی باش هەر ڕێگای زەریایی بووبێ، بۆیە دەبینین زۆربەی ئەو شارانە کەوتوونەتە سەر زەریاوە، سەیری پاریس بکە سەیری بەرلین بکە سەیری لەندەن بکە هەموو ئەو شارە گرنگانە لە ئەورووپا، ئەوانە هەموویان کەوتوونەتە سەر دەریا، بەڵام ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ شار لە کوردستان ئایا ئێمە شارمان هەبووە لەو دەورانە، تائێستاش من ئەگەر بە خاکیانەوە قسە بکەم بەڕاستی ئێمە شارمان نەبووە، لە مێژووی کۆنیشماندا لە باشترین حاڵەتدا شارەکانی ئێمە تەنیا شارۆچکە و کاروان سەرابوون بۆ ئەو قافڵە و بازرگانانەی کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی یانی دەوڵەتی عوسمانی یان دەوڵەتی قاجاری ئەمانە کە کەلوپەلیان دەهێنا و بازرگانیان دەکرد، ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین شار، ئەمانە لە باشترین هەلومەرجدا تەنیا کاروان سەرایەک بوون بۆ ئەو کاروانچییانەی کە دەهاتن و تێدەپەڕین، ئەگینا ئێمە بە مانای شار ڕەنگە تا ئێستاش شارمان نەبێ بە ڕاستی.

**گوڵنار: کەواتە هەڵکەوتەی جوگرافیایی ئێمە و نەبوونی ڕووبار وایکردووە کە ئێمە نەبینە خاوەنی شار، یا پەیوەندی بە کەلتوور و مەعریفە و هۆشیاریی و دووربینی خۆمانەوە هەبووە؟!**

نەجاتی عەبدوڵڵا: ڕاستە ئێمە قوربانی دەست جوگرافیاین و من هەمیشە وامگوتووە جوگرافیا ستەمێکی زۆر گەورەی لە ئێمە کردووە، بەڵام هەڵکەوتەی ئێمە ئەم شاخ و داخەی کەوا لەناو کوردستاندا هەڵکەوتووە ئەمە وایکردووە گۆشەگیریی و دوورەپەرێزییەکی زۆر لەناو کورددا هەبێت، ئەمە یەکێک لە هۆکارەکانی درووستنەبوونی نەتەوەی کوردیش، بەڕاستی ئەم جوگرافیا دڵڕەقەی کەوا خاکی کوردستانی تێدا هەڵکەوتووە، کۆسپێکی گەورە بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوری مرۆڤەکان هەمیشە هەر گرنگە، لە مێژوودا دەوری ئینسانەکان، دەوری شار، دەوری کۆمەڵ لە مێژوودا ناکرێ فەرامۆش بکرێت، تۆ ئەگەر نەتەوەیەکی زیرەک بیت، جوگرافیاکەشت دڵڕەق بێ دەتوانی بۆ خۆت شت دروست بکەی، بەڵام کورد بەداخەوە ئیدی بە هەر جۆرێک لە جۆرەکان بووبێ بە داگیرکاریی کەوتۆتە ناو سێ و چوار قوتبی هێزی گەورەوە کە لەوێوە نەیتوانیوە هیچ شتێک بکات، نەیتوانیوە شار بنیاد بنێ، نەیتوانیوە ژیانی سیاسیی دروست بکات، لەبەرئەوە ئەمڕۆ شاری دروستکردووە بەیانی لافاوێک هاتووە و تێکیداوە. مەبەستم لە لافاو هێرشی داگیرکەرە، هێرشێک هاتووە و وێرانی کردووە و هەمووی سوتاندووە و دووبارە سەرلەنوێ جارێکی تر لە سفرەوە دەستی پێکردووتەوە، یانی بە کورتییەکەی دەمەوێ ئەوە بڵێم کورد لە نێوان ئەم سێ هێزە موگناتیسییە گەورەیەی کەوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبووە لە نێوان جەمسەرەکانی ئێرانی و عوسمانی و عەرەبی-ئیسلامیی دا وەک موگناتیس ڕایانکێشاوە و ئیدی هیچ سەربەستییەک و ئازادییەکیان بۆ نەهێشتۆتەوە، ئەم هێزە گەورانە کە پێکیشیان داداوە ئەمانە هێرشیان بۆ سەر یەک کردووە، هەر هەمووی بەناو خاکی کوردستاندا تێپەڕیون و لەم ڕووەدا کوردستان نە بایەخی بەوە داوە نە توانیویەتی شاری هەبێ نە توانیویەتی پێگەیەکی وای هەبێ ئیتر ئابووری بەهێزی هەبێ، لەبەرئەوە هەرچی کردووە داگیرکەران بە ساغی هاتوون ڕووخاندوویانە و سووتاندوویانە و دووبارە و دیسان کورد تێهەڵچووەتەوە لە سفرەوە، بۆیە مێژووی کورد تەماشا بکەی هەمیشە وابووە دە ساڵێک بیست ساڵێک لە ئاوەدانیدا بووە و لەشکرکێشییەک دێت و وێرانی دەکات و ئەمجارە بیست ساڵ سی ساڵی تر دەگەڕێتەوە دواوە و لە سفرەوە دەستپێدەکاتەوە، ئیدی مێژووی کورد جگەلەوەی کە پارچەپارچە بووە هەمیشە هەرواش بووە ئەمە سیمای مێژوو و خەسڵەتی مێژووی کوردە بەڕاستی.

**گوڵنار: بۆچی سەردەمانێک هەبووە پایتەختە هەرە گەورەکانی دنیا داگیرکراون و سفر کراونەتەوە، مەغۆل دێت و بەغدا و دیمەشق دەگرێت، هیتلەر و ناپلیۆن بەشێکی زۆری پایتەختەکانی دونیا داگیر دەکەن و سفریان دەکەنەوە، بەڵام دوای ئەوە هەڵدەستنەوە و خۆیان بنیاد دەنێنەوە، بەڵام بە قسەی جەنابتان شارەکانی ئێمە بەرگەی داگیرکارییەک ناگرن و نابنەوە بە شار، بەراوردی ئەم دوو داڕووخانە چییە؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: ئەمە پرسیارێکی زۆر بەجێیە، پایتەختەکانی گەورەکانی دونیا خۆیان شاربوون و دەسەڵاتی سیاسیشیان هەبووە، بەڵام کورد دەسەڵاتی سیاسیی نەبووە، کورد هەمیشە لە پەراوێزی ئەم دەسەڵاتانە بووە یانی کورد لە پەراوێزی بەغداد بووە، کورد لە پەراوێزی ئەسفەهان و تاران بووە، کورد لە پەراوێزی ئەستەنبوڵ بووە. یانی ئێمە هیچکاتێک دەسەڵاتی خۆمان نەبووە، دەسەڵاتی بەهێز وەک هێزێک بتوانین مونافەسەی

دەوڵەتان بکەین، شارەکانی دونیا هەموویان خاوەنی دەسەڵاتی سیاسیی بوون، ئەم شارانە شاربوونە و دەسەڵاتی سیاسیی وایلێکردووە و کاتێک دەسەڵاتی سیاسیشت هەبوو، شارت هەبوو، ئەگەر داگیریش بکرێ دووبارە زۆر بە ئاسانی دێیتەوە سەر پێی خۆت، بەڵام حاڵەتی کورد حاڵەتێکی تایبەتە، ئێمە هیچکاتێک نەمان توانیوە وەک یەک نەتەوە خۆمان نمایش بکەین، ئێمە گرووپی جیاواز جیاواز بووین. یانی تۆ سەیرکە ئێستە سەیری پێکهاتە و نەخشەی ئێتنیکی کوردستان بکە چۆن دابەش بووە، لەملایە هەورامییەکان بە تەنها لەناو ناوچەیەکی جوگرافی دابڕاو، کاکەییەکان لەولایە بەتەنیا، لەولایە زازاییەکان، لەولایە گۆرانەکان، لەولایە شەبەک، لەولایە ئێزیدی، لەولایە کرمانج، لەولایە سۆران، مەبەستم ئەوەیە ئەم دابەشبوونەی گرووپە بچووک بچووکانە وایکردووە تۆ نەتوانی خاوەنی یەک نەتەوە بی، یەک دەسەڵاتت هەبێ. کورد ئەگەر یەک نەتەوە بووایە مەبەستم ئەوەیە گرووپی جیاواز جیاواز نەبووایە، یەک نەتەوە بووایە یەک دەسەڵاتی سیاسیی هەبووایە بیتوانیایە شاری ئاوەدانی ئەوەی هەبووایە ئەگەر دەسەڵاتیشی بڕووخایە دووبارە دەسەڵاتی بنیاد دەنایەوە، بەڵام ئێمە گرووپی جیاواز جیاوازی پەڕاگەندەین، بۆیە زۆر بە ئاسانی توانیویانە دەستمان بەسەردا بگرن و دەستمان بەسەردا بکێشن، یانی تۆ ئێستا لە پێدەشتێکی گەورەدا ئەگەر کۆمەڵێک گرووپی بچووک بچووک هەبن لەوێ هێزێک زۆر بە ئاسانی دەتوانێ چەپۆک لەو بدات و ئەم لەناو بدات و ئەو لەناو بدات، بەڵام ئەگەر لەناو ئەم جوگرافیایەدا هێزێکی یەکگرتوو هەبێت و یەک کەس سەرکردایەتیی بکات و بۆ یەک خەون و یەک ئامانج، ئەمانە وا بەئاسانی سەرکوت ناکرێن و لەناو نابردرێن، هیوادارم ڕوونکردنەوەکەم ڕوون بێ.

**گوڵنار: کەسانی وەک جەنابت لاوازی زمان و نەبوونی زمان وەک یەکێک لە فاکتەر و شوناسەکانی مانەوەی نەتەوە دەزانن، هەندێکی تر بۆ نموونە سەربەخۆیی و کیانی سەربەخۆ و هەندێکی تر بۆ نموونە نان و ئازادی دەکەنە هۆکاری مانەوەی هەر میللەتێک، من دەپرسم شار چ پەیوەندییەکی بە دواکەوتوویی ئێمەوە هەیە، مەبەستم ئەوەیە لە ئەگەرێک دا بۆ نموونە جەنابت ئەگەر زمان بە بڕبڕەی پشتی نەتەوە بزانی و پێتوایە خۆزگە کوردستان ببوایە بە هەشت پارچە و دە پارچەوە بەس زمانی یەکگرتووی ستاندەرمان هەبوایە شار لە کوێی مانەوەی نەتەوەدایە، ئەگەر ئێمە شارمان هەبووایە ئێستە چی بووین، کە شاریشمان نییە چین؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: شار بە مانا و مەفهوومە کۆمەڵایەتییەکەی یانی چینی ئەرەستۆکرات، کورد چینی ئەرەستۆکراتی نەبووە بەڕاستی، ئەم تەبەقەیەی کە پێی دەگوترێ چینی ئەرەستۆکرات و سەرمایەدار و ئەوانەی کە دەتوانن خاوەن کارگە بن و ئەوانەی کە دەتوانن هێزی کار بن و بتوانن کۆمەڵگا بەرەو پێشەوە بەرن، کورد ئەوەی نەبووە، ئێستاش نییەتی لە مێژووشدا ئەمەی نەبووە، ئەگەر لە دەشتێک بووە و لە گوندێک بووە دوو سێ سەر مەڕی هەبووە و شیری مەڕەکانی خواردووە و بەروبوومەکانی خواردووە، بە کورتی واتە کورد مانیفاکتۆری نەبووە، دامودەزگای نەبووە، ئەگەر شتێکیشی هەبووبێت بتوانێت خۆی پێ بەڕێوە ببات شتەکە ئەوەندە سەرەتایی بووە یانی دەتوانم بڵێم هی قۆناغی پێش مێژوو بووە ئەوەندە دواکەوتوو بووە، لەبەرئەوە کورد نەیتوانیوە مواکەبە بکات، نەیتوانیوە هاوسەردەمییانە لەگەڵ ئەوە بڕوات ئەگەر مەسەلەن چینی سەرمایەداریی هەبووایە ئەگەر ئەرەستۆکراتی هەبووایە، ئەگەر کارخانەی هەبووایە هێزێک لەم کارخانەیە ئیشی دەکرد هێزێک کە لەم کارخانەیە ئیش دەکات هێزێکی

بەرهەمهێنەرە، بەرهەمی دەبوو لەگەڵیشیدا ژیانی جوانتر دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا شارنشینی دروست دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا شارستانییەت دەهاتە پێشەوە ئەمانە خۆی کە دەسەڵات دروست دەبوو، زمان بەرەوپێش دەچوو و فەرهەنگ بەرەوپێش دەچوو، چاپخانە دەبوو، کتێب دەبوو، بەڵام ئەمانە ئەگەر نەڵێم سفرن زۆر لاواز بوون ئەمانە بوونەتە کۆسپێکی گەورە لەوەی کورد نەتوانێت وەک نەتەوە لەدایکبێ، کورد ئێستاش وەک نەتەوە لەدایک نەبووە، من بەرپرسیارم بەرامبەر ئەو قسەی خۆم کە دەیکەم، ڕەنگە ئەمە قسەیەکی زۆر گەورە بێ، بەڵام بەڕاستی، کورد ئێستاش وەک نەتەوە و ناسنامەی سیاسیی لەدایک نەبووە.

**گوڵنار: ئێمە کە تا ئێستا شارمان نییە و نەشمانتوانیوە ببین بە خاوەنی شار، شار چۆن بنیاد دەنرێت و بەچی دادەنرێ و کێ دەتوانێ شار بنیاد بنێ؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: حەز دەکەم شتێکت پێ بڵێم دوو دیدگای جیاواز هەیە بۆ شار، ئێستا ئەم شارانەی ئێمە تۆزێک سیمای شاریان هەڵگرتووە، بەڵام ئەم سیما هەڵگرتنانەیان بە پەرەسەندنێکی مێژوویی خۆڕسکدا تێنەپەڕیوون، تۆ سەیری دوبەی بکە، دوبەی بیابانێک بوو، بەڵام ئێستا بووەتە شارێکی گەورە و پانوپۆر و پایتەختی بازرگانی جیهان، بەڵام ئەم پەرەسەندنە پەرەسەندنێکی مێژووکرد نییە، ئەمە پەرەسەندنێک نییە لە ڕێگای بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا و لە ڕێگای فکری کۆمەڵگای خەڵکی دوبەیەوە پەرەیسەندبێت، ئەمە ئەندازیارەکە و هەموو بەرهەم و کەرەستەکانیشی لە دەرەوە هاتووە، ئەمە تەنها پارەی نەوتیان هەیە و شاریان بۆ دروست کردوون، ئەمە شار نییە بەو مانایە شارەکە کە رووحی تێدابێ، یانی بە جۆرێکی تر، با پێت بڵێم ئەمە ئەگەر شاریش بێ، بەڵام شارێکی بێ ڕۆحە یانی تۆ ناتوانی دوبەی لەگەڵ پاریس بەراورد بکەی، کە پاریس بە گەشەسەندنێکی سروشتی خۆیەوە شارەکە گەورە بووە و لەگەڵ خۆی خەونی شاری هەڵگرتووە، لەگەڵ خۆی سیمای شاری هەبووە. بەڵام دوبەی وانییە، دوبەی کۆمەڵێک خەڵک هاتوون و بینایان بۆ دروست کردوون و شاریان بۆ دروست کردوون و بازیان بەسەر پرۆسێسی مێژوویی داوە و کابرا بە دشداشەیەکەوە لەناو بورجی خەلیفەیە لەو بەرزی ئاسمانەوە، بەڵام کارەباکەی بکوژێتەوە نازانێت چۆن بێتە خوارەوە دەبێت بە فرۆکە بیهێننە خوارەوە، لەبەرئەوەی خۆی عەقڵی پێ ناشکێ و خۆی دروستی نەکردووە و نازانێت بێتە خوارەوە، ئەمە شتێک دروست دەکات یانی مەرج نییە تۆ شارت هەبێ لە جوگرافیای شار نەبێت، گرنگ ئەوەیە تۆ عەقڵییەتی شارت هەبێ، ئێستە ئێمە شارمان هەیە هەولێر شارە، سلێمانی شارە، بەڵام عەقڵییەتی شاری تێدا کەمە، ئەمە کارەساتە بەڕاستی.

**گوڵنار: کەواتە عەقڵییەت و کەلتووری شار چییە؟ چۆن شار بناسینەوە؟ کامەیە ئەو عەقڵییەت و کەلتوورەی کە بووەتە هەوێن بۆئەوەی سلێمانی یان دوبەی بە شار بشوبهێنین یان بیناسێنن؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: بەڵێ شار ئەوانەن کە کۆمەڵە بازنەکانی بەیەکەوەن، ئەو بازنانەی شار بەیەکەوە بازنەی پێکەوەبەندن، دەتوانن ئینسان لەوێدا زۆر بە ئاسانی بەرهەمهێنان و فیکری خۆی بەرهەم بهێنێ، بەڵام ئێمە لەم شارانەی وەک سلێمانی و هەولێر و ئەوانە وەک کرێچی واین، بەڕاستی ئێمە دەستێکی ئاوهامان نەبووە لە دروستکردنیان یان نا ئەگەر شتێکیشمان دروستکردبێ لە دەرەوە دروستمان کردووە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەم شارانە بە پرۆسێسی مێژوویی خۆیاندا تێنەپەڕیون! تۆ سەیرکە دوو کەس خانوو دروست دەکەن یەکێکیان بەدەستی خۆی بەردەکە و هەموو بیناکە و نەخشەسازیی و هەموو شتەکەی خۆی دایدەنێ، یەکێکیش لە دەرەوە شەریکەیەکی ئەوروپایی



ئێمە میللەتێکی نەخوێندەوارین، ڕەنگە هەندێك خەڵکی خوێندەوارت هەبێ و بخوێننەوە، بەڵام بەگشتی ئەگەر بەو پێوەرە ستانداردەی کە وا لە دونیادا هەیە حساب بکەین کورد میللەتێکی نەخوێندەوارە.

دێ بۆی دروست دەکات و دەچێتە ناوی، ئەمە فەرقیان زۆر زۆرە و بیرکردنەوەشیان زۆر جیاوازە. لەناو ئەم شارە ئەوەی خۆی دروستی کردووە دەزانێ بۆنی دیوارەکەی چۆنە، دەزانێ کەلتووری دروستکردن چۆنە، دەزانێ ڕەنجی شانی خۆیەتی، دەزانێ قیمەتی چەندە، ئەوەی تر کە بۆی دروستکراوە فەرقی گەلێک زۆرە لەگەڵ ئەوەی تردا! من لەسەر ئەم چەمکە قسە دەکەم لەسەر شار، هیوادارم بۆچوونەکانم بە هەڵە نەگەن.

**گوڵنار: با واز لە ستەم و هەڵکەوتەی جوگرافیا بهێنین بەرامبەرمان، کە یاریدەدەر نەبوون لە دروستکردنی شار بۆمان، مەعریفە و ڕۆشنبیریی، سەقافەتی خەڵک، هۆشیاریی خەڵک، کتێب و خوێندنەوە و دونیابینی خەڵک هیچ ڕۆڵێکی هەیە لە دروستکردنی شاردا؟ ئێستا سەیری سلێمانی و هەولێر بکە، ژمارەی چێشتخانە و بەنزینخانە و ئوتێلەکانی هەزار قاتی ژمارەی کتێبخانەکانییانە، کتێبخانە نامۆیە، تۆزی لەسەر نیشتووە و دائەخرێ، کابرا کرێ دوکانی پێ پەیدا ناکرێ، بەڵام بڕۆ ئوتێل و چێشتخانە و بەنزیخانەکانمان جمەیان دێت و سەرە ئەگیرێ بۆیان؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: چۆن دەوری نییە ئێمە میللەتێکی نەخوێندەوارین، ڕەنگە هەندێک خەڵکی خوێندەوارت هەبێ و بخوێننەوە، بەڵام بەگشتی ئەگەر بەو پێوەرە ستانداردەی کە وا لە دونیادا هەیە حساب بکەین کورد میللەتێکی نەخوێندەوارە، بەڕاستی کورد ناخوێنێتەوە، یانی تۆ وەرە ئێستاکە بڕۆ ماڵی هەر کوردێکی ئاسایی کە فەرمانبەرێ یا شوفێرێکی تاکسی بێت، بزانە فەرهەنگێکی کوردی – کوردی لە ماڵەکەی دا دەبینی، بزانە تۆ کتێبێکی کوردی لە ماڵیان دەبینی، لەهەمانکاتدا بڕۆ ماڵێکی ئەورووپایی، بڕۆ ماڵێکی فەرەنسی، بڕۆ ماڵێکی ئینگلیز ئەگەر کابراکە هەمان ئاستی کۆمەڵایەتی ئەم کەسەی کوردستانی هەبێ، مەسەلەن شۆفێری تەکسییەک بگرە لە لەندەن لەگەڵ شۆفێری تەکسیەک لە هەولێر، ئەوەی هەولێر بڕۆ ماڵیان کتێبێکی تیا نابینی، فەرهەنگی (خاڵ)ی تێدا نابینییەوە بۆئەوەی منداڵەکانی بزانن فەرهەنگی کوردی – کوردی چۆنە و چییە؟! بەڵام ئەوەی پاریس یان ئەوەی لەندەن فەرهەنگی لارۆسی هەیە، فەرهەنگی تری هەیە، یانی دە دوازدە فەرهەنگێکی هەر هەیە بۆئەوەی بزانێ ئەگەر کێشەیەکی لە زمانەکەیدا هەبوو بگەڕێتەوە سەری، یان هەر هیچ نەبێ کۆمەڵێک ڕۆمانی هەر هەیە، بەڵام من شەرتت لەگەڵ دەکەم بڕۆ بگەڕێ لەناو هەموو چینەکانی کۆمەڵ بزانە لە چەند ماڵدا فەرهەنگ دەبینیت؟ بەڵام دەبینیت جامخانەیەکی گەورەی داناوە ئەوە مەتبەخە، لەوێندەر ئەنواع و ئەشکاڵ پەرداخی داناوە، بۆ خواردن و بۆ ئەوە، بەڵام یەک فەرهەنگ لەو ماڵە نادۆزییەوە ئێ ئەم ماڵە نەخوێندەوارە! با خاوەنی شەهادەی بەرزیش بێ.

**گوڵنار: مەترسی بە لادێ بوونی شار چییە و چۆن دەرەوێتەوە؟ کامانەن ئەو مەترسییانەی کە ئێمە ڕۆژانە بەبێ ئەوەی بە خۆشمان بزانین بەرخوردیان لەگەڵ دەکەین لەبەرئەوەی هەولێر و سلێمانی شار نین و لەبەرئەوەی کە خەڵکەکەش مۆرکی شاریان وەرنەگرتووە؟**



**کورد لە نێوان ئەم سێ هێزە گەورەیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە هەبوون جەمسەرەکانی ئێرانی و عوسمانی و عەرەبی-ئیسلامیی وەك موگناتیس ڕایانکێشاوە و ئیدی هیچ سەربەستییەك و ئازادییەکیان بۆ نەهێشتۆتەوە.**

نەجاتی عەبدوڵڵا: نا ئێمە بە عەقڵی دەشتەوە هاتووینەتە شار! بەڕاستی ئێستا ئەوەی لەم شارانە دەگوزەرێ عەقڵی دەشتە، بەڕاستی عەقڵی دێهاتە، عەقڵی دەشتە هاتووەتە ئێرە و بە هەمان شێوە بیردەکاتەوە و بە هەمان شێوە ئەوە دەکات، ئەم شارانە نەیانتوانیوە ئەم عەقڵییەتانە قووت بدەن، یانی دەورووبەری شارەکان هەموو عەقڵییەتی دێهاتییە، بە فکری دێهاتەوە لەناو شاردا دەژین بەداخەوە.

**گوڵنار: پرسیاری دووەمی تەوەرەکە ئەوەیە مێژووی شارسازی لە کۆنەوە تا ئەزموونی پانوپۆری ئیسلامیی. مەبەستم ئەوەیە ئایا شارە کۆنەکان کە یەکێکی وەک عومەری کوری خەتتاب دێت بەسرە و کوفە دروست دەکات، کۆمەڵێک شار لە قەڵەمڕەویی ئیسلامیدا دروست دەکرێن، ئەمانە بۆچی شار بن و سلێمانی کە ئێستا لە چاو ئەو شارانە زۆر جوانتر، زۆر سەوزتر جادەوبانی زۆرتر، بۆچی سلێمانی شار نەبێ کەچی شارێکی هەزار ساڵ پێش ئێستە شار بێ؟ پێمخۆشە باسێکی ئەو مێژووەم بۆ بکەی تا سەردەمی قەڵەمڕەویی ئیسلامیی و ئەوانە..**

نەجاتی عەبدوڵڵا: نا، خۆ لە دەسەڵاتی ئیسلامییش ئەم شارانەی کەوا باستکردن مەرکەزی دەسەڵات نەبوونە و شار نەبوون، بەڕاستی ئەم شارانە شار بوون کە ناوەندی دەسەڵات و حوکمڕانی بوون و بازرگانیان تێدا کراوە و مەرکەزی شاربوون و بازرگانیان تێدا کراوە، کوفە، حەلەب، قاهیرە ئەمانە هەمووی شوێنی شار بوون لە سەردەمە کۆنەکانیش، ئەو شارانەی کەوا بازرگانیان تێدا نەکراوە، ئەو شارانەی کەوا کارگە و کارخانەیان نەبووە هەروەها ئەو شارانەی کەوا دەسەڵاتی سیاسییان تێدا نەبووە، قەڵەمڕەویی سیاسییان تێدا نەبووە ئەمانە شاریش بوون و شاری پەراوێزخراو بوون و شاری مردوو بوون، سلێمانی ڕاستە ئێستا گەشاوەیە و سەوزە و پێشکەوتووە، بەڵام سلێمانی لە سەردەمی ئەمارەتی بابان گرنگتر بووە، چونکە هەر نەبێ ئەمارەتی بابانی تیابووە، بەڵام لە دوای ئەوەوە ئیدی پەراوێز خراوە، لە (١٨٥١) کە دەسەڵاتی بابان نەما، ئیدی ئەم شارە پەراوێز خرا، بوو بە شارەدێهاتێک لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و زۆریش پەراوێز خرا بەڕاستی، چەندە گرنگە ڕۆڵی دەسەڵات و ڕۆڵی کارگێریی و ئیداری لە ڕووی شارەوە ئەمانە هەموویان پێکەوەبەندن، ڕۆڵی مەعریفە، ڕۆڵی کارگێری و کارخانەکان ڕۆڵی بەرهەمهێنان، ڕۆڵی زمان، ڕۆڵی دەسەڵات ئەمانە هەر هەموویان پێکەوەبەندن، سیستەمێک دروست دەکەن، کۆی هەمووی ئەمانە سیستەمی شار و عەقڵی شاری لێ پەیدا دەبێت یانی نوقستانی هەر یەکێک لەمانە دەبێتە هۆی کێماسییەکی گەورە لە شارەکەدا.

**گوڵنار: کەواتە بەڕای جەنابت وەک شێخ ڕەزا دەفەرمووێ: لەبیرم دێ سولێمانی کە دارولمولکی بابان بوو، لە سەردەمی دارولمولکی بابانا سلێمانی هێشتا لە شارەوە نزیکتربووە تا ئێستەی؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: تا ئێستا لە دوای ڕاپەرینەوە جیاوازییەک هەیە ئینسان ناتوانێ ئەوەندە بێ ئینساف بێ، بەڵام سلێمانی لە سەردەمی بابان

زیاتر شار بووە و لە شار چووە لەوەی دوای ڕووخاندنی ئەمارەتی بابان تا دەگاتە ڕاپەڕین، سلێمانی تەنها شارێکی پەراوێز خراو بووە بە ڕاستی.

**گوڵنار: با بگەڕێینەوە بۆ سەدەکانی ڕابردوو، کورد کە نەتەوەیەکی گەورە بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئایا هیچ ئەزموونێکی جوانی شارسازیی و دروستکردنی شار و کەلتووری شارمان هەبووە لە مێژوودا کە ئێستە ئێمە شانازی پێوە بکەین و بڵێین بەڵێ کاکە لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی مێژوودا ئێمەش شارمان هەبووە و خاوەنی شاربووین؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: لەناو ئێمە بەرلەوەی شانازی بە شار بکرێ دەبێ شانازی بەوە لە مێژوودا بکرێ تۆ لە مێژوودا چەندە پێت لەسەر ئەو خاکە بووە، دەسەڵاتت لەسەر ئەو خاکە بووە و توانیوتە حوکمڕانی ئەم خاکە بکەی ئیدی لەوێوە تۆ باڵات بەرز دەبێ، بەڵام بەداخەوە بەڕاستی بەر لە ئیسلام سەرچاوەیەکی وامان نییە مێژووی کوردمان پێ بڵێت، یانی بڵێ مێژووی کورد و شار و شارنشینی بەر لە ئیسلام چۆن بووە، هیچ زانیارییەکمان نییە ئەگەر هەشمان بێت زانیاری زۆر کەمە، ئەوە نییە مرۆڤ پشتی پێ ببەستێ، ئەوە ئیتر لە سەردەمی ئیسلامەوە لە ڕێگەی سەرچاوە ئیسلامییەکانەوە سەدەکانی ناوەڕاست و لە ڕێگەی گەڕۆک و جوگرافییناسە مسوڵمان و عەرەبەکانەوە ئێمە هەندێ زانیاریمان لەسەر هەرێمەکانی کوردستان بەدەست گەیشتووە، چونکە کوردستان هیچ کاتێک دەوڵەتێک نەبووە یانی سنوورێکی دیاریکراویی نەبووە، بڵێی ئەم سنوورە کوردستان بووە و ئیدی حوکمڕانی تێدا کردووە. ئەوەی ئێستا ئێمە پێی دەڵێین کوردستان ئەمە سنوورێکی نییە و بەڕاستی لە مێژوودا کوردستان هیچ کات سنوورێکی خۆی نەبووە، ئێمە لە زاکیرەی خۆماندا ئەم شوێنەی وا کوردی تێدا ژیاوە بە کوردستانمان داناوە، ئەگینا بڵێی لە ڕووی بەڵگەنامەی نێودەوڵەتییەوە دانپیانانێک هەبێ و سنوورێک هەبێ و لێرەدا هەر چوار پارچەی کوردستان بگرێتەوە شتی ئاوا نەبووە.

ئەوەی ئێمە لە مێژوودا شارمان هەبووە، بەڵێ بۆ نموونە شارێکی وەک بەدلیس کۆنە، شارێکی وەک دیاربەکر، بەڵام لە سەدا چەند موڵکی کوردی پێوە بووە؟ ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و بەدواداگەرانی زیاترە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کوردستانی عێراق و ئەوەی لای خۆمان و لە ئەزموونی ئێمەدا شارێکی وامان نییە بەڕاستی، یانی بڵێین ئەمە شارە و نەخشەی بیناسازی تێدا بووە، لە ڕووی بیناسازییەوە شارێکی پێشکەوتوو بووە و لە ڕووی سنعەتکارییەوە شارێکی پێشکەوتوو بووە، ئەگەر ئێمە تەماشای سەرەتای سەدەی بیستەم بکەین یەک دوو شار هەیە لە کوردستان گرنگییان پێدراوە، لەبەرئەوەی شاری ناوتی و تاڕادەیەکیش سنعەتی بوون، لە ڕۆژهەڵات ڕەنگە شاری کرماشان تۆزێک زیاتر بێ لەوانی تر، مەسەلەن لە کوردستانی عێراق کەرکوک تۆزێک جیاوازتر بێ لە سلێمانی و هەولێر، مەسەلەن لەولاترەوە دیاربەکر تۆزێک ڕەنگە زیاتربێت. ئەمە ئاوایە ئەگینا بە کۆی گشتی لە ڕووی شارنشینییەوە ئێمە چەندە لە مێژوودا هەژارین لە شارنشینیش دا هەژارین بەداخەوە.

**گوڵنار: فۆکسی ئاینی زۆرجار کاریگەری خۆی هەیە، تەنانەت لە قورئان و فەرموودەدا باس لە کۆمەڵێک خواردنی وەک هەنجیر و زەیتوون و خورما و شیر و هەنگوین و ئەم شتانە دەکرێ، ئەمانە ئێستە مۆرکێکی جیهانیشیان وەرگرتووە، یانی هەموو مرۆڤایەتی یەک دەنگە لەسەر شیر و هەنگوین و خورما و زەیتوون و هەنجیر، ئایا کاتێک کە دەوڵەتی ئیسلامیی مەدینەیە، مەککەیە، بەغدایە، دیمەشقە، حەلەبە، قاهیرەیە کۆمەڵێک شار هەن ویلایەتی گەورەی لێ دروست کردوون و گرنگییەکی زۆریان پێدراوە و فۆکسی زۆری خراوەتەسەر. تەنانەت سەیری شاری قودسیش بکە لەگەڵ ئەو داگیرکاریی و بچووکییەی خۆیدا**

**هەر جێی گرنگی و بایەخی هەم جوولەکە و هەم ئیسلامە، ئایین چۆن دەیتوانی شار بۆ کورد دروست بکات؟ ئایا دەیتوانی و نەیکردووە یان بۆ نموونە ئایینیش کۆڵەوار بووە لە دروستکردنی شاردا بۆ کورد؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: ئەمە پرسیارێکی زۆر ئاڵۆزە بەڕاستی، بەڵام بۆئەوەی وەڵامت بدەمەوە، ئایین ڕۆڵێکی هەبێ لە دروستکردنی شارسازیی بۆ کورد، نەیبووە بەداخەوە، لەبەرئەوەی کورد نەیتوانیوە ئایین وەک دەسەڵات بەکاربهێنێ، کورد هەر نەیتوانیوە تەوزیفی ئایین بکات بۆ دەسەڵات، یانی نەیتوانیوە ئایین وەک دەسەڵات بۆ خۆی بەکاربهێنێت. کێشەکە لەوەدایە کورد تەنیا وەک عیبادەت ئایینی وەرگرتووە، ئەم قسەیەت بۆ دووبارە دەکەمەوە ئەگەر کورد ئایینی هەم وەک عیبادەت و هەم وەک دەسەڵات وەربگرتایە، ئێستا ئێمە لەم ڕۆژە ڕەشەدا نەدەبووین! ئەو مەئساتەی ئێستا ئێمە تێیکەوتووین، بەداخەوە کورد ئایینی وەرگرتووە تەنیا وەک عیبادەت و پەرستن. لەولاشەوە وەکو ڕەعییەتی دەوڵەتە ئیسلامییەکان پاڵی لێداوەتەوە و نەیتوانیوە ئەوە بکات، یانی ئەگەر کورد هەم ئایینی وەکو عیبادەت و هەم وەکو دەسەڵات لەبن دەستبووایە، ئەمە بەڕاستی دەبووە هێزێکی کاریگەر و دەیتوانی وەک نەتەوەکانی تر لە مێژوودا ڕۆڵێکی هەبێ.

**گوڵنار: لە سەرەتاوە باست لە هەندێک لە ئاستەنگەکان کرد پێمخۆشە بە ڕیزبەندیی و بە خاڵ باس لە ئاستەنگەکانی بەردەم بە شار نەبوون و شارنەبوونی ژیان و ژیاریی کورد بکەین، ئەمە هەڵکەوتەی جوگرافی، ئەمە داگیرکەران، چیتر هەیە بۆئەوەی لەم پرسیارەدا و لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا جیایان بکەینەوە، خەڵکێک بزانێ کە ئەمانە کۆی ئەو ئاستەنگانەن کە بوونەتە هۆکاری ئەوەی کورد لە ژیان و ژیاریی خۆیدا شاری بۆ دروست نەکرێ؟**

نەجاتی عەبدوڵڵا: جا چ ئاستەنگێک نییە، کۆمەڵێک ئاستەنگ هەیە بۆئەوەی کورد نەیتوانیوە پێی ببێتە خاوەنی شار، کورد لە ناوخۆی پەڕاگەندە بووە و یەک ڕیز و یەکگرتوو نەبووە، لە ناوخۆی دابەشی سەر چەندین زمان و شێوەزاری جیاجیا کراوە، لە ناوخۆیدا لە ناوچەی جوگرافی بەرتەسکدا ژیاوە و نەیتوانیوە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ دەرەوەی خۆی هەبێ، تۆ سەیری ئێستا مەکە، تا ساڵانی بیستەکان و پەنجاکان هاتووچۆ لە نێوان دوو دێهات سەخت بوو، دوو دێهات نەیاندەتوانی هاتووچۆ بکەن، یەکێک لەوێندەر دەیکردە جەژن دێهاتەکەی نزیک ئەو ڕۆژی پاشتر دەیکرد بە جەژن، یان ڕۆژی پێشتر دەیکردە جەژن. مەبەستم ئەوەیە بڵێم هیچ هۆیەکی گەیاندن بەیەکەوە نەبووە، کوردستان نەیتوانیوە ڕایەڵەیەکی هەبێت بەیەکەوەی بگەیەنێت، جگەلەوەی ئەم هۆیانەی نەبوونە کەوا بتوانن ڕایەڵەیەکی هەبێ بەیەکیانەوە بگەیەنێت، ڕایەڵەی زمانەوانیشی نەبووە لە ڕووی زمانیشەوە یەک نەبووە تەنها تۆ سەیرکە هەم لە ڕووی ناسنامەی ئایینییەوە جیاواز لە ڕووی ناسنامەی زمانەوە جیاواز لە ڕووی ناسنامەی فەرهەنگییەوە، جیاواز یانی کورد یەک ناسنامەی نییە کۆمەڵێک ناسنامەی جیاواز جیاوازی هەیە، ئەم ناسنامەی جیاواز جیاوازانە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینیووە لەوەی کورد نەتوانێت وەک نەتەوە، وەک هێزێکی کاریگەر بتوانێت بێتە پێشەوە، یانی مەسەلەن تۆ ناسنامەی ئێزدیت هەیە، تۆ ناسنامەی کاکەییت هەیە، تۆ ناسنامەی شەبەکت هەیە، تۆ ناسنامەی سارەلووت هەیە، تۆ ناسنامەی زازات هەیە، تۆ ناسنامەی گۆرانت هەیە، تۆ ناسنامەی کرماشانیت هەیە، جگەلەوە لەم ناسنامانە لە ناوخۆشیدا کۆمەڵێک دابەشبوونی عەشیرەتیت تێدایە، یانی مێژووی کورد ئەوەندەی مێژووی عەشیرەتە مێژووی نەتەوە نییە، لە هەموو گۆی زەویشدا عەشیرەت ناتوانێت شار دروست بکات،

عەشیرەت شار دروست ناکات، بەڵکو ڕەشماڵ دروست دەکات، دیوەخان دروست دەکات، عەشیرەت ناتوانێت کەلتووری شارنشینی بەرهەم بهێنێت و نەزمی دەوڵەتی هەبێت، عەشیرەت دەوڵەت نەویستە و نایەوێ، هەورەک فەرهەنگ و دەوڵەتی شاری ناوێ و پێویستی بەوانە نییە.

گوڵنار: دکتۆر تەنانەت ئێستا من ئاگاداری سلێمانیم، لەوەچێ لە هەولێریش هەروابێ هەورامی و پێنجوێنی و هەڵەبجەیی یان شارەزووری کەوتوونەتە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە، چەمچەماڵی و بازیانی و ئاغجەلەر و سەنگاو و پیرەمەگروون کەوتوونەتە ڕۆژئاواوە، شارباژێریی و بەرزنجەیی کەوتوونەتە باکوورەوە، قەرەداغی و بەری ئەو بەریش کەوتوونەتە باشوورەوە، مەبەستم ئەوەیە ئەمەش هەر خۆمان ویستوومانە کە نەبین بە شار، هەر لەناو شاری سلێمانیشدا کاتێک کە لە دێهاتەکان داگیراون یان ویستوومانە بێن لە شارا بژین تەنانەت حیسابیشمان بۆ ئەوە کردووە وەکو لادێ یا وەک دوو عەشیرەت یا وەک دوو تایەفەی نزیک لە یەک بژین تێکەڵی خەڵکی تر نەبن؟

نەجاتی عەبدوڵڵا: ئێ ئەمە ئەو فەرهەنگەیە عەشیرەتمان هەڵگرتووە هێناومانەتە ناو شارەکانەوە، ئێمە تەنیا جێگامان گۆڕیوە یانی عەشیریەتێک لەجیاتی ئەوەی لە دێهاتێک بێت هاتۆتە ناو سلێمانی هاتۆتە ناو هەولێر بە عەقڵ و دابونەریت و هەموو شێوەیەکی عەشیرەتییەوە هاتووە، تا ئێستاش لە زۆر جێگا عەشیرەت هەیە ژن نادات بە عەشیرەتەکەی دیکە! جا نەتەوە کەی ئاوایە؟ ئێستا عەشیرەت هەیە تۆ برۆ داوای ژنیان لێ بکە ناتداتێ، ئەڵێ نابێ ئێمە بەس دەیدەینە قەومی خۆمان، یانی عەشیرەتی خۆی بە قەومی خۆی دەزانێ جا ئەوجا تۆ وەرە وردبەرەوە دەزانی ئەم کۆمەڵگای ئێمە ئەم پێکهاتەکەی چەندە پێکهاتەیەکی پارچە پارچە و دابەشکراو دووبارە دابەشکراو سێ جار و چەندان جار دابەشکراوە.

لە هەموو ڕوویەکەوە دابەشکراوە لە ڕووی زمانەوە لە ڕووی فەرهەنگەوە لە ڕووی ئایینەوە لە ڕووی نەژادەوە و موازییکێکی زۆر زۆر سەیرە لە مێژوودا هێزێکی ناسۆنالیزمی کوردی نەبووە بتوانێت هەموو ئەم گرووپە جیاوازانە لە خۆی کۆبکاتەوە و دواجار لەم سەرەوە نەتەوەیەک دروست بکات بەناوی نەتەوەی کورد، بزاڤێکی ناسۆنالیستی هەبێ نەتەوەی کورد دروست بکات، بۆیە ناسۆنالیزمی کورد فەشەلی هێنا و هەرەسی هێنا لەوەی بتوانێت نەتەوەی کورد دروست بکات، ئێستاش نەتەوەی کورد لەدایک نەبووە ئەگەر لەدایک بووبێتیش بە سەقەتی لەدایکبووە.

**گوڵنار: لە میرنشینی باباندا هەردوو تەریقەتی قادری و نەقەشبەندی سەرهەڵدەدەن، دواتر کتێبخانەیەکی گەورە دروست ئەکرێ و ئەدەبیات و شیعر و بەتایبەت سێ کوچکەی بابان تیایدا دەگەنە لوتکە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ڕۆڵی شارنشینی یان بۆ نموونە شار و کەلتووری شار لە گەشەسەندنی ئەدەب و هونەر و پێدانی ناوەڕۆکی نوێ بەو شتانە چیە، ئایا ئەگەر شارمان هەبێ ئەدەبیاتی ئێمە ئەوەی پێی دەگوترێ پایتەختی ڕۆشنبیری یان بۆ نموونە سەقافەتی کوردی ئەگەر شار هەبێ چ هێزێک یان چ ئاراستەیەک بەم ژانرە ئەدەبیانەی هونەر و مۆسیقا و کتێب و شیعر و ئەم شتانە دەدات.**

دکتۆر: ئەگەر شار هەبێ هاوڵاتی دروست دەبێ، ئەگەر شار هەبێ فەرهەنگی شار دروست دەبێت، شار لە خۆیدا و لە فەرهەنگی خۆیدا چەمکی هاوڵاتی دروست دەکات و هاوڵاتی ئینتیمای بۆ شار دەبێ ئینتیمای بۆ قەبیلە نابێ، ئینتیمای بۆ مەزهەب نابێ، ئینتیمای بۆ گرووپێکی زمانەوانی نابێ. شار لەگەڵ خۆیدا فەرهەنێگێکی باڵا بۆ هەموو ئینسانەکان دروست دەکات، بەڵام بەداخەوە ئەوەی نییە. لەناو کورددا دوو تەریقەت هەبوو بەتایبەتی تەریقەی نەقشبەندی، کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی ڕێبەری دەکرد بەڕاستی ئەمە

دەیتوانی بۆ کورد شوێنی ئایین بگرێتەوە و ببێتە هێزێکی گەورە و بنەمایەک بۆ دروستبوونی دەوڵەتی کوردی، بەڵام بەداخەوە ئاستەنگی زۆر خرایە بەردەم مەولانا خالیدی نەقشبەندی و دواجار وایان لێکرد مەولانا هەڵفرێنن و هەر لە سلێمانیش نەمێنێ و شاربەدەری بکەن، خۆ ئەگەر ئەم بزووتنەوە ڕیفۆرمخوازییەی کە مەولانا خالید دەستیپێکردبوو ئەگەر سەری بگرتبایە ئێستە ئێمە ڕەنگە لە هەوارێکی ئارامتردا بژیبووینایە، بەڵام بەداخەوە سەری نەگرت و نەیتوانی گەشە بکات، دواجاریش وەک یەکێک لە هەوڵەکان شکستی هێنا و نەیتوانی سەربکەوێ.

**گوڵنار: با واز لەوەبێنین کە هەریەکە لە میرنشینەکان ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستانیان لەژێر دەستدا بووە، بۆچی لە ئەزموونی بیست و نۆ ساڵی ڕابردووی حوکمڕانی کوردیدا تا ئێستا خودی مام جەلال و کاک مەسعود یان یەکێتی یان پارتی یان تەنانەت دەسەڵاتی سیاسی حوکمڕانی ئەو ئەزموونەی هەمانە نەیانتوانیوە یان بیریان لە دروست کردنی شار نەکردۆتەوە؟**

دکتۆر: ئەمە پەیوەندی بە بونیاد و پێکهاتەی ئەم حیزبانەوەیە، کە ئەوانە خۆیان ئەوە دەکەن یانی حوکمڕانی دەکەن، یانی تۆ هەر حیزبێک دەیگری مەسەلەن حیزبێک بگرە لە فەرەنسا لە بەریتانیا لەوێندەر ئەمە ئەم حیزبە روئیا و ڕوانگە و تێڕوانینی خۆی هەیە بۆ گەشەندنی کۆمەڵ و شار و نەتەوە و هەموو ئەوانە، بەڵام ئەم حیزبانەی ئێمە کە وا لە دەسەڵاتن دیارە روئیاکەیان هەروا بچووکە و خەونی بچووکیان هەر ئەو جێگایەیە، ئەوانە لەسەر تەپکە شاخێک شەڕیان دەکرد، کە سبەینەکەی یەکێک تەپکە شاخی دەگرت، ئێوارە ئەوی تری دەیگرتەوە وای دەزانی کەرکوکی گرتۆتەوە، بۆری نەوتی تێدایە و بەو عەقڵێتەوە چۆن دەتوانی ئیدارە بکەیت؟ چۆن دەتوانێ شار بەرەوپێش بەری بەم عەقڵیەت و بیرکردنەوەوە؟ بەکورتییەکەی دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم ئەم ئەزموونی حوکمڕانییەی من و تۆ تێیدا دەژین بەرهەمی بیرکردنەوە و ئاستی فەهەنگی و مەعریفی ئەم حیزبانەیە کەوا ئەم وڵاتە بەڕێوە دەبەن.

**گوڵنار: چ شتێکی گرنگی تر ماوە لەبارەی شار و کەلتووری شار و هۆکارەکانی دروست نەبوونی شارەوە نەمان وتبێ یان جەنابت پێویست بکات ئیزافە کەیت؟**

دکتۆر: شتێک هەیە کە من زۆر بەلامەوە بۆم گرنگە بەڕاستی لێرەدا باسی بکەم، حەز دەکەم ئێوەش ئیشارەی بکەن و بیوروژێنن، ئەویش ئەوەیە شاری ئێمە پێویستە مۆرکی کوردانەی پێوە بێت بەڕاستی ئەو شارانە لەو هەموو کەڵەکسازیی و ئاپارتمان و ئەو شتانەی کەوا دروست دەکرێ مۆرکی کوردانەی پێوە نییە، مۆرکی کوردانە مەبەستم ئەوە نییە خانووی کۆن بێنن دووبارەی کەنەوە، من دەمەوێ مۆرکی کوردی لەگەڵ ئەندازیاری سەردەمدا تێکەڵاو بکرێت و شتێکی لێ دروست بکرێت کەوا پێی بگوترێ سیستەمی شارنشینی کوردیی، واتە کاتێک کەسێک دێتە ئەم شارە هەست بکات ئەم باڵەخانە و داروبەردە بۆنی شاری کوردی لێ بێت، مەبەستم ئەوەیە تێکەڵاوێک بێت لە نێوان نوێخوازێک لە دونیادا لە ئەندازە و ئەوانە پەیڕەو دەکرێت لەگەڵ ئەو ڕۆحە کوردییەی کەوا لە بیناسازی شارەکەدا دروست دەکرێ، واتە تەنیا بێیت باڵەخانەیەک دروست بکەی کە هیچ ڕۆحێکی تێدا نەبێت، تۆ هەر هیچ نەبێ سونبولێک مۆرکێکی کوردی لەناو ئەم بینایانەدا ببینی و بزانی لە شارێکی کوردی دای، بەڵام بە داخەوە ئەوە ڕەچاو نەکراوە لە کوردستان، دەبێ ئێمە شارەکانمان ئاوا گەشە پێبدەین و ئاوەدانیان بکەینەوە و سوود لە ئەزموونی شارنشینی جیهان وەربگرین، چۆنە لە پاڵیا متوربەی بکەین بە شێوازی شارنشینی کوردی بە میتۆد و سیمایەکی کوردی بتوانین موتوربەی بکەین. با هیچ نەبێ

سیمایەکی کوردی بە شارەکانمانەوە دیاربێ.

خاڵێکی تر زۆرگرنگ تر کە حەز دەکەم باسی بکەم ئەویش ئەوەیە، زۆر گرنگە شارێکی وەک هەولێر لە رێگای زێی کەڵەکەوە بتوانرێ رووباری بەناودا بهێنرێ، بەرهەمهێنانی ئەم رووبارە ئەگەر دەستکردیش بێت و بەناو شاری هەولێردا بروات سیما و مۆرکێکی تر بە شار دەدات، هیوادارم بتوانرێت ئەوە بکرێت، بەڕاستی ئەمە خەونێکی گەورەیە، ئەگەر ئەمە بکرێت دەبێ بەشێوەیەکی ئەندازیاری رێکوپێک و سەردەمیانە ئەنجامبدرێت و زۆر جوان لەگەڵ سیمای کوردەواریدا بگونجێنرێت، ئەو کات سیمایەکی دیکە بە شاری هەولێر دەدات و زۆر جوانتری دەکات.

**گوڵنار: ئاماژەت بەوە کرد ئێمە تائێستاش شتێکمان نییە بەناوی شاری پیشەسازییەوە، ئەگەر کوردستان شاری پیشەسازی هەبووایە ئێستا خاوەنی هەردوو چینی بورژوازیی و چینی کرێکار بێت، مەبەستم ئەوەیە فەراغی لادێ و گوند لەم نێوانەدا چی بووە ئەوەی کە نەتوانێت شاریش دروست بێ بە رۆڵی خۆی هەستێ لەوەی کە ئێمە لە ئێستادا کەمترین پیشەسازی یان کەمترین کشتوکاڵ یان کەمترین ئاژەڵداری ئەبینین لە وڵاتی خۆماندا، گوندەکانمان چۆڵ بوون و خەڵک تەنها بۆ کەباب خواردن دەچێتە ناویان و ئێوارە دەگەڕێتەوە، ئەگەر گوند وجوودی خۆی هەبوایە ئامادەیی خۆی و رۆڵی خۆی ببینیایە لەم وڵاتە تاڕادەیەک ئاسانترنەبوو لە دروست کردنی شاردا؟**

دکتۆر: ئێمە وەک کابرای لە هەردوو جەژن بووین، نە شارمان هەیە نە گوندمان هەیە، بەڕاستی نە شارەکانمان شارە و نە دێهاتەکانیشمان دێهاتە، لە کاتێکدا ئێمە دەمانتوانی دێهاتەکانمان ببوژێنینەوە، دەمانتوانی کارگەمان هەبێ یانی شەرم نییە بۆ ئێمە کارگەی رۆنمان نەبێ، کارخانەی دۆشاوی تەماتەمان نەبێ، کارگەی هەرچی پێویستییە نەمانبێ، یانی تۆ ئەگەر بەیانیان لەسەر سفرەی نان خواردن دابنیشی هەست دەکەی یەک تاقە شتی سەر سفرەکە هی خۆت و وڵاتەکەت نییە، هەموو شتەکانت لە دەرەوە بۆ دێت، برۆ یەکێک لەو وڵاتانەی دەوروبەر، ئێران تەماشا دەکەی دەبینی هەموو ئەوانەی لەسەر مێزەکە دانراوە خواردنی دەستکردی خۆیەتی، ڕاستە ئێمە بە ئەوان بەراورد ناکرێین، بەڵام کاکە کێ دەستی گرتووین؟ بیست و هەشت ساڵە نەتوانین کارگەیەکی رۆن دروستکردن دابنێین؟ کاکە کارگەیەکی دۆشاوی تەماتە یان شەکر دروست بکەین، کارگەی پیشەسازی بچووک بچووک دروست بکەین، یانی ئێمە هەموو شتێکمان لە دەرەوە بۆ دێ!! خۆ ئەگەر ئەم کۆرۆنایە بەردەوام بێت و دەوڵەتان خواردنیان کەم بێت و نەتوانن بۆ ئێمەی بنێرن ئێمە هەموومان لە برسان دەمرین، کۆرۆناش نەمانکوژێت ئێمە لە برسان دەمرین، لەبەرئەوەی ئێمە هیچ هیچمان نییە نە کێڵگەمان بوژاندۆتەوە نە کشتوکاڵمان کردووە، دانیشتووین تەنیا پارەی نەوت دەخۆین، ئەوە یەکێکە لەو کێشە گەورانەی وڵاتانی ئێمە و بیر لە کارکردن و نیشتمانسازیی ناکەینەوە، چونکە پارەیەکی ئاسان لە رێگای قازانجی نەوتەوە دێت ئیدی ئەم پارەیە گەندەڵی تێدا دەرکرێت، ئەوەش میللەتەکە تەمەڵ دەکات، جا ئەو میللەتانەی کە ئاوان بایەخ بە کشتوکاڵ و سەنعەت و ئەو شتانە نادەن. ئەگەر کۆرۆنا دوو مانگ سێ مانگی تر بەردەوام بێت و تورکیا و ئێران خواردن و شتیان هەر بە تەنیا بەشی خۆیان بکات دڵنیابە ئێمە کۆرۆناش نەمانکوژێ لە برسان دەمرین.

**گوڵنار: هیچ ئومێدێک هەیە لە داهاتووا ئێمە ببینە خاوەنی شار.**

دکتۆر: خۆی دەبێ ئومێد هەر هەبێ، چونکە ئەگەر ئومێد نەبێت ئینسان دەمرێت، بەڵام بەڕاستی من ئومێدم نییە لە ئێستایەکی نزیکدا هیچ ترووسکە و هیوایەک نابینم، رەنگە لە دوارۆژ هەبێ، بەڵام لە ئێستایەکی نزیکدا وەک وتم خەونێکی دوورە.

# ونبوونی (شار) له کەلتووری کوردیدا






**پ.د ئاراس محەمەد صاڵح**

لەدایکبووی ١٩٧٠، ناوچەی بازیان، خاوەنی (١٢) کتێبی چاپکراو و نزیکەی(٤٠) توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە، مامۆستایە لە بەشی بنەماکانی ئاین/ زانکۆی سلێمانی.

لێرەدا کە باسی شار دەکەین، مەبەستمان ڕووە کۆمەڵایەتییەکەی شارە، بێگومان (شار) کاریگەری زۆری هەیە لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی مرۆڤ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و چۆنیەتی بیرکردنەوەی، لەهەمانکاتدا ئەو کاریگەرییانە ڕەنگدانەوەی زۆری هەیە لەسەر بیرکردنەوە و بەرهەمە مەعریفییەکانی و مامەڵەی ڕۆژانەی لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا، لە زۆر ڕووەوە مرۆڤی شارستانی ئاکار و ڕەفتاری جیاوازە لەگەڵ مرۆڤێکی کۆچەری، یان لادێنشین.

لەبەر هەڵکەوتەی جوگرافیی و نەبوونی شاری دێرین و گەورە لە کوردستاندا، کەلتووری شار ڕەنگدانەوەی کەمی هەیە لەناو پێکهاتەی گشتی ژیانی ڕۆژانەی کورددا، وەک دابونەریتی کۆمەڵایەتیی و ئەدەبی و فۆلکلۆریی و هونەر و زۆر شتی تر، ئەگەر لە کوردستاندا شاری گەورە و دێرین هەبوایە، بێگومان ئێستا کورد خاوەنی کەلتوورێکی شاری دەوڵەمەندتر و فرە ڕەنگ و فرە ڕەهەندتر دەبوو، دەبێت تێبنی ئەوەش بکرێت کەلتوور شتێکی بێ کاریگەر و بێ بایەخ نییە، بەڵکو کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ و بیرکردنەوە و ڕەفتاری.

ڕەنگدانەوەی لاوازی کەلتووری شار لەناو پێکهاتەی گشتی ژیانی کورددا لە زۆر ڕووەوە جێگەی ئاماژەپێدان و توێژینەوەیە، لێرەدا هەوڵ دەدەین ئاماژە بە چەند ڕوویەکی ئەو دیاردە بکەین، وەک: لەناو خوێندن و ڕۆشنبیریدا: خوێندن لە کوردستاندا هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیش هەر بە زمانی بێگانە بووە، تەنانەت هەتا ئێستاش تەنها لە کوردستانی باشوور بە زمانی کوردی ئەخوێنرێت، لە ئێران و تورکیا و سوریا کوردی بوونی نییە، هەر ئەمەش وایکردووە هەموو پێویستییەکانی خوێندن هەتا ئێستاش بە کوردی نەکراون، وەک (مەکتەب، قەڵەم، کتێب، حوجرە، دەفتەر..هتد)، تەنانەت ناوەکانی (قوتابخانە، مامۆستا، خوێندنگە) تازە داتاشراون و ڕەگ و ڕیشەی کۆنیان لەناو زمانی کوردیدا نییە.

گرنگیدان بە خوێندن و فێربوون بەرهەمی کۆمەڵی شارە، بە درێژایی مێژوو، مەعریفە و زانست لە شاردا بەرهەمهاتووە، هەتا ئێستا بەهای خویندنەوە و ڕۆشنبیریی و کتێبخانە لەناو کۆمەڵی کوردیدا زۆر لاوازە، تەنانەت لەناو توێژی دەرچووانی زانکۆ و پەیمانگاشدا خوێندنەوە و سەردانی کتێبخانە و پێشەنگای کتێب لە ئاستێکی زۆر خراپدایە، تیراژی کتیب و گۆڤار و ڕۆژنامە لە هەرێمی کوردستاندا ئەوەندە نزمە جێگەی نیگەرانییە، هەرچەندە ئەڵێن: بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیی و تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە کاریگەریان هەبووە، بەڵام دەکرێت ڕاپرسی بکرێت بزانرێت خویندنەوەی کتێبی بە نرخ لە ڕێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە ڕێژەکەی چەندە لای توێژی خویندەوار؟ بێگومان ئەنجامەکەی زۆر کەم دەبێت.

بەپێی بیردۆزەی (ابن خلدون) کە ئەڵێت:( کاتێک زانست فراوان دەبێت و گەشە دەکات کە شار و ئاوەدانی گەورە هەبن و ژیار پێشبکەوێت)، ڕەنگە نهێنی دەرنەکەوتن و گەشەنەکردنی زانایانی کورد ئەوە بێت کە کورد شاری گەورەی نەبووە، بەڵام کاتێک چوونەتە بەغداد و شام و زۆر شوێنی تر ناویان دەرکردووە، هەر (ابن خلدون) ئاماژە بەوە دەکات لە سەرەتای ئیسلامدا لە شارەکانی وەک (بەصرە، بەغداد، کوفە، قورتوبە و قەیرەوان)دا زانست و هونەر و داهێنان لە زانستەکاندا گەشەی کردووە، چونکە شاری گەورە بوون و ئاستی ژیارییان پێشکەوتوو بووە، بەڵام لەکاتێکی تردا کە (قاهیرە) پێشدەکەوێت، خوێندن و فێربوون لەوێ گەشە دەکات.

پیشە و پیشەسازی: پیشە و پیشەسازی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵی شار، بەڵام پیشەوەری لەناو کەلتووری کوردیدا ڕەنگدانەوەی زۆری نییە، هەندێک پیشەی سەرەتایی کۆمەڵی کشتوکاڵی بوونی هەبووە، بەڵام ئەوانە نابنە بەڵگەی

شار و کۆمەڵی پیشەگەر، وەک تەشی ڕستن، نانەوا، قەصاب، بۆ نمونە کورد ئەڵێ: (ڕێسەکەی لێکردمەوە بە خوری)، (تەشی ڕێس ئەگەر تەشی ڕێس بێت بە کلکی ... تەشی ئەڕێسێ)، (نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەصاب)، بەڵام ئەم پیشانە گەشەی نەکردووە و لە ئاستی تاک تێنەپەڕیوە و لەناو چواردیواری ماڵدا کراون، ڕەنگە ئەو قسەی (ابن خلدون) کە ئەڵێ: (أن العرب أبعد الناس عن الصنائع) دوورترین کەس لە پیشەسازییەوە عەرەبە، بۆ کوردیش هەر ڕاست بێت.

پیشە و بەرهەمە پیشەسازییەکان پێویستییان بە شار و دەستی کار هەیە بۆ بەرهەمهێنان، لەهەمانکاتدا پێویستی بە بازاڕی گەورەیە بۆ ساغکردنەوە، کاتێک کورد شاری گەورەی نەبووە، ئەوا بازاڕ و خواستی زۆریشی نەبووە، هەتا بەرهەمەکانی تێدا ساغ بکاتەوە، بۆئەوەی بتوانێت ژیانێکی باشتر بۆ خۆیی و خێزانەکەی دابین بکات.

دینداری ڕووکەشی: لە دەرەوەی خواپەرستییەکەی، دەکرێت ئاین وەک کایەیەکی مەعریفی تەوزیف بکرێت، چونکە هەزاران مزگەوت و سەدان خوێندنگە لە کوردستاندا بە پاڵنەری ئاین دروستکراون و ئاوەدان کراونەتەوە، ئەگەر دینداری لە ئەندەلوس (ابن رشد) و چەندانی تری بەرهەم هێنابێت، ئەوا لە کۆمەڵە دواکەوتووەکاندا زیاتر ئایین تێکەڵاوی خورافە کراوە و ئایندارییەکی ڕووکەشییان کردووە، تەنانەت لە هەندێک شوێن ڕەوشی دینداری هێندە دواکەوتوو بووە بە ئیمانی پیرێژن ( عقیدة العجائز) ناوبراوە.

لەناو کۆمەڵی کوردیشدا ڕاستە زانای گەورە هەڵکەوتووە، بەڵام کۆی گشتی ڕەوشی دینداری شتێکی ڕووکەشی بووە، هەتا شەستەکانی سەدەی ڕابردووش زۆر کەم باسی حیکمەت و فەلسەفەی ئاینداری کراوە، مەبەستەکان شەریعەت و لێکدانەوەی عەقڵانی هەتا ڕۆژگاری مەلای گەورەی کۆیە و شێخ محەمەدی خاڵ لەناو ژینگەی دینداری کورددا جێگەی باس نەبووە، ڕەوشی دینداری ئەوەندەی گرنگی بە گۆڕ و دەمی گورگ و خەونامە و نوشتە و شێخ داوە، زۆر کەمتر بووەتە کایەیەکی مەعریفی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵ، هەموو ئەمانەش ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی دواکەوتووی دوور لە شارە.

شیعر و ئەدەب: شیعر وەک لقێکی سەرەکی ئەدەب لای کورد جێگەی بایەخ بووە، فەقێی کورد هەر لە سەرەتای خوێندندا تیکەڵای ئەدەبی فارسی و شیعرەکانی (گوڵستان و بوستان)ی سەعدی بووە، هەربۆیە شاعیری گەورە لەناو کورددا هەڵکەوتووە، بەڵام ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە لەناو شیعری کلاسیکی کوردیدا ستایشی ژیانی خێڵایەتی و شانازی کردن بە ناوچە و بنەچەوە نەکراوە. لەناو شیعری کلاسیکی کوردیدا زیاتر بایەخ دراوە بە لایەنی ڕەوانبێژیی و توانای خولقاندنی دەقی بەرز و وێنەی شیعری جوان، یان لایەنی خواناسی و عیرفانی، هەروەها ئەڤین و عەشق و خۆشەویستی، هەموو ئەمانەش ئەرکی سەرەکی شیعری کلاسیکە.

هونەر و گۆرانی: هونەر و گۆرانی کوردی دەرهاویشتەی ئەو ژیانە پڕ لە هەڵدێر و نشێوە بووە مێژووی کوردی پیادا تێپەڕیوە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆرانی بۆ کەیف و شادی دەربڕینە، بەڵام گۆرانی کوردی پڕە لە دەقی فۆلکلۆری کارەساتاوی، زۆرجار لەبری ئەوەی دڵت خۆش بکات، تووشی خەم و دڵتەنگیی و یادەوەری تاڵت دەکات، هەموو ئەمانەش کەلتوورێکی دواکەوتووی دوور لە شار بەرهەمی هێناون.

ئەگەر سەیری گۆرانییە فارسییەکان بکەین پڕن لە حیکمەت و وێنای جوانی شیعرەکانی (سەعدی) و (حافز) و (فیردەوسی) و چەندانی تر، بەڵام مەخابن هەتا ئێستا شیعرەکانی (نالی) و (مەولەوی) و (کوردی) و شاعیرانی تری کورد، لەناو گۆرانی و لاوک و هۆرە و سیاچەمانەی

کوردیدا بەرچاو ناکەون، هۆی ئەمەش رەنگە ئەوەبێت کە هونەرمەندانی کورد زیاتر کەسانی میللی و نەخوێندەوار بوون، یان دیوانی شاعیرەکان چاپ نەکراوە و نەگەیشتووەتە دەستی توێژەکانی خوارەوە.

ئەگەر بەخێرایی چاوێک بەناو دەقەکانی گۆرانی کوردیدا بگێڕین، چەندین تێکستی وەک: (لە قریشکەی برنە و شەڕی یاڵەویاڵ، لە گەرمەی شەڕدا تۆم کەوتە خەیاڵ، خۆم کوڕە هەورامیم کۆڵ بە کۆڵەوە، عەرەق ئەڕێژم بە ڕێی چۆڵەوە، دێکەی ئەمبەر، دێکەی ئەوبەر فاتە گەرمیانی، من لەمبەرەوە تۆ لەوبەرەوە هەردووکمان سوتاین بە بەرخۆرەوە)، ئەم دەقانە هەرچەندە بێ ناوەڕۆک و لاوازن، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمی ژیانی کۆمەڵێکی دوورە شاری دواکەوتووە.

ونبونی شار لە پەندی کوردیدا: پەندی پێشنانی کوردی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێکی کشتوکاڵییە، کەلتووری شار وەک: پیشەوەری، کارگێڕی، مەعریفە و فەلسەفە، هیچ ڕەنگدانەوەیەکیان لەناو ئەم پەندانەدا نییە، ناوی شار لەناو پەندی کوردیدا زۆر بەکەمی هاتووە، هەندێک جاریش کە هاتووە وێنەیەکی جوانی شار پیشان نادات، وەک: (ئەگەر چوویتە شاری کوێران ئەبێت دەست بەچاوتەوە بگری)، لێرەدا جۆرێک لە تەسلیم بوون بە واقیع فێری مرۆڤ دەکات، بەڵام بەپێچەوانەوە پێویستە مرۆڤ خاوەنی ئیرادە بێت و بڕوای بە گۆڕین هەبێت.

شێخی خاڵ ئەڵێت: (پەندی پێشینان بەرزی بیروباوەڕی گەل نیشان ئەدات لەناو گەلانی تردا، وە ئەندازەی تێگەیشتن و پێگەیشتن بەرچاو ئەخات)، ئەم لێکدانەوەی شێخی خاڵ پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، پەندی پێشینان تەنها بەرزی بیرکردنەوە پیشان نادات، هەندێک جار نزمی بیرکردنەوەش نیشان ئەدات، ئەگەر خوێندنەوەیەکی زانستی و سۆسیۆلۆجی بۆ پەندی کوردی بکرێت، دەبینی هەندێک پەند مرۆڤ هاندەدات بۆ ڕق ئەستوریی و تۆڵەسەندنەوە، یان سوکایەتی بە کەسانی بەرامبەر، هەموو ئەمانەش ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەی ئەو کۆمەڵەیە ئەو پەندانەی تێدا لەدایکبووە.

نەبوونی پەند لەسەر قەڵەم و کتێب: پەندی پێشینان ڕەنگدانەوەی ژیان و گوزەرانی ئەو پێشووانەیە ئەم پەندانەیان داڕشتوە و دەماودەم گێڕاویانەتەوە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت کەلتوری خوێندن و خوێندەواری هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لەناو ئەم پەندانەدا نییە، ئەگەر (خەنجەر، چەک، دیواربڕ، کێلان) لەناو پەندی کوردیدا هاتبن، ئەی بۆچی تەنها یەک پەند لەسەر قەڵەم، کتیب، کتێبخانە، نەهاتووە؟ چونکە هەموو ئەمانە دەرهاویشتەی ژیانی شارن، لە پەندی ئینگلیزیدا هاتووە: (جوانتریت شت لە ماڵدا کتێبە)، بەڵام مەخابن ئەم جۆرە پەندانە لەناو پەندی کوردیدا بەرچاو ناکەون.

ناوی مناڵ و زیهنییەتی تاکی کورد: ناونانی مناڵ و هەڵبژاردنی ناو، ئاستی هۆشیاری خێزان و کۆمەڵ دەردەخات، چونکە مناڵ میوانێکی زۆر ئازیز و خۆشەویستە، خێزانەکان هەوڵ دەدەن خۆشترین ناو بۆ مناڵەکانیان هەڵبژێرن، بەڵام پێوەری خۆشی چیە لای ئەوان؟ لای هەر کۆمەڵێک کەلتوور و شتە پیرۆزەکانیان کاریگەری زۆریان هەیە لە دیاریکردنی ناودا، لەناو کوردا ئاین کاریگەریی و ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە ناونانی مناڵدا. لەبەرئەوەی کورد نەتەوەیەکی سوننی مەزهەبی موسڵمان بووە، لای هەموو مسوڵمانێک ناوی پێغەمبەر(د.خ) زۆر پیرۆز و گەورەیە، هەروەها ناوی هاوەڵان بەتایبەت چوار خەلیفەکەی، هەربۆیە لەناو کوردا هەزاران (محەمەد، ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، حەسەن و حسێن) هەیە، لە دوای دەرکەوتنی تەریقەتە تەسەوفیسەکان ئەو ناوانەی پاشگری (دین)ی پێوەیە دەرکەوتووە، وەک (بەهادین، نەجمەدین، عەلادین، حسامەدین، سیراجەدین) هەموو ئەمانەش بە کاریگەری ئاین بووە.

بەڵام لە سەدەی بیستەمدا کە تا ئاستێک کۆمەڵی کوردی پێشکەوتووە و گۆڕانی زۆر بەسەر هەست و بیرکردنەوە و دنیابینی خەڵکدا هاتووە، لە هەموو کوردستاندا هەزاران قوتابخانە و دەیان زانکۆ کراونەتەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا کەلتووری شاربوون گەشەی زۆری نەکردووە، دەیان ناوی وەک: (خێڵان، سەرخێڵ، نەبەرد، تۆڵە، شاخەوان، کێوان، چیا، دێکان، شوان، دارەوان، ئازا) بوونی زۆریان لەناو ناوی منداڵی کوردا هەیە، بەڵام ئەو ناوانەی دەرهاویشتەی کەلتووری شارن بوونی بەرچاویان نییە، هەتا ئێستاش دەیان منداڵ بەناوی شەڕکەری ئازاوە ناودەنێن وەک: (ئەسکەندەر، کاوە، ڕۆستەم)، بەڵام لە هەموو کوردستاندا منداڵێک بەناوی فەیلەسوفێکەوە ناونەنراوە.

بۆچی ئاساییە منداڵ بەناوی (شوان، وەرزێر، سەرخێڵ، جوتیار)وە ناوبنرێت، بۆ بەناوی (ئەندازیار، مامۆستا، خوێندکار، نوسەر، ڕۆژنامەوان، پارێزەر)وە ناونانرێت؟ لە زیهنییەتی تاکی کورددا زانا و ڕۆشنبیر وێنایەکی لاوازی هەبووە، تەنانەت مەلای کورد کوڕەکەی ناوناوە (کاوە، شاخەوان، کێوان)، بەڵام ناوی نەناوە (شافیعی)، لەگەڵ ئەوەشدا شافیعی فەقیهو ئوصولی و زانا و خواناسێکی گەورە بووە، بەڵام (کاوە)ی بەلاوە پیرۆزتر بووە، کە لە بنەڕەتدا ئەفسانەیەکی پیاوکوژە.

ئامێرەکانی پێوانە و کێشانە: لەناو زمان و کەلتووری کوردیدا، بابەتەکانی پێوانە و کیشانە بوونی نەبووە، وەک (مەتر، کلم، میل، کیلۆ، تەن)، کورد بۆ پێوانە وتویەتی: گوریسێک یان دوو گوریس درێژە، یان ڕۆژەڕێیەک دوورە، ئەندازە و پێوانەی نەبووە هەتا لەناو ژیانی ڕۆژانەیدا ڕەنگدانەوەی هەبێت، بۆ کێشانەش داهێنراوی خۆی نەبووە، کاتێک کیلۆ پەیدا بووە و مامەڵەی پێوە کردووە، پێشتریش بە هۆقەی عوسمانی و هەندێ پێوانەی تر، ئیشوکاری بازاڕ و کڕین و فرۆشتنی ڕاپەڕاندووە.

خانوو دیوارو تەلارسازی: تەلارسازیی و خانووی جوان و کۆشک و تەلار و پەرستگا و پردی گەورە نیشانەی پێشکەوتنی هەر شارستانی و وڵاتێکە، ئەگەر گەشتێک بکەیت بەناو دێهات و شارۆچکەی کوردستاندا لەمڕۆوە هەژارە و لە ئاستی پێویستدا نییە، چەند کۆشک و پرد و مزگەوت و قەڵا لە کوردستاندا وەک شوێنەواری دێرین ماوەتەوە؟ هەربۆیە کاتێک گەڕیدەی ڕۆژئاوایی (ڕیچ) لە ساڵی (١٨٢٠ز) هاتووەتە سلێمانی کۆشک و تەلارەکانی ئەو شارە سەرنجیان ڕانەکێشاوە، تەنانەت باسی خراپی خانووەکانی ئەو شارە دەکات، ئەڵێت: کۆشکی میر لەگەڵ خانوەکانی تردا جیاوازی وەهای نەبووە، لەوکاتەدا ئەوە حاڵی سلێمانی بووبێت، کە پایەتەختی میرایەتی بابان بووە، بێگومان دۆخی لادێکان زۆر خراپتر بووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێبکرێت ناوچەی هەورامانە، جیاواز لە زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان، هەورامان لە ڕووی بیناسازیی و خانوو تەلارەوە، لە ئاستێکی باشدا بووە، تەلار و خانوو تەڵانەکان، گرنگیدان بە باخ و ڕازاندنەوەی ماڵەکان بە گوڵ، هێمای شارستانی و گرنگیدانی خەڵکی ناوچەکەیە بە ژیانسازیی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات.

ئەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگیرێت نائارامی سیاسیی و شەڕ و پەلاماری داگیرکەران و ڕێکنەکەوتنی میر و ئاغای کورد، ڕۆڵی گەورە و سەرەکی بینیوە لە وێرانکردن و پاشکەوتووی کوردستان لە ڕووی ئاوەدانی و بیناسازییەوە، ئەو دۆخەش وایکردووە هەموو کات خۆیان بە کۆچەری بزانن، زۆرجار ڕووی ڕەخنە دەکرێتە میرەکانی بابان کە شوێنەواری پێشکەوتوویان لە کۆشک و تەلار و پرد و مزگەوتی گەورە و جوان بەجێنەهێشتووە، هۆکەی ئەوە بووە ئەگەر سەیری

مێژووی بابانەکان بکەین، دەبینین دەسەڵاتێکی کۆچەری گەڕۆکیان هەبووە، لە دارشمانەوە بۆ ماوەت و لەوێوە بۆ قەڵاچوالان و پاشان بۆ سلێمانی، لە ماوەی چەند سەدەیەکدا چەند جارێک پایتەختی میرایەتییەکەیان گواستووەتەوە، ئەم دۆخە کاریگەری زۆری هەبووە کە شار و شوێنەواری ئاوەدانی گەورەیان لە دوای خۆیان بەجێنەهێشتووە.

لەهەمانکاتدا هێرش و پەلامار و ڕێکنەکەوتنی ناوخۆی ئەو میرانە، رۆڵی گەورەی هەبووە و لە پاشکەوتوویی و وێرانکردنی ولاتەکەیان، هەر بۆ نمونە کاتێک خانە پاشای میری بابان هێرشی کردووەتە سەر میرایەتی ئەردەلان، لە شاری سنەدا مزگەوتێکی و چەند باخێکی جوانی دروستکردووە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە کاتێک لە هێرشی پێچەوانەدا میری ئەردەلان سنەی گرتووەتەوە، ئەو مزگەوت و باخانەی تێکداوە و لە شوێنی ئەوانە، مزگەوتی (دار الاحسان)ی دروستکردووە.

پابەندی بە نەریت و ترس لە گۆڕان: یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵی شار ئەوەیە زوو لەگەڵ پێشهاتەکاندا هەڵدەکات و توانای خۆگۆڕین و نوێبوونەوەی بەردەوامی هەیە، بەپێچەوانەی کۆمەڵی لادێوە کە زۆر ترسی لە گۆڕان و پێشهاتە تازەکان هەیە، زۆر بە توندی دژایەتییان ئەکات. خۆگۆڕین و لەخۆگۆڕان وەک تاوانێکی کۆمەڵایەتی لای کورد سەیر کراوە، لەمبارەیەوە دەیان پەندی وەک: (ڕێوی لە کونی خۆهەڵگەڕێتەوە گەڕ دەبێت) هەیە، هەندێک جار پەنا دەبەن بۆ زمانێکی زبر لە بەرامبەر ئەوانەی توانای هەڵکردنیان هەیە و لەگەڵ پێشهاتەکاندا دەچنە پێشەوە، وەک ئەڵێن: (تورکەی خۆی لێگۆڕاوە، یان، بۆ نازانن کوڕی کێیە؟) هەموو ئەمانە دەرهاویشتەی کۆمەڵێکی داخراوی دواکەوتووە، بەپێچەوانەی کۆمەڵی شارەوە کە هەموو کات بەدوای ژیانێکی باشتر و کەلتوورێکی پێشکەوتووتردا وێڵە.

لاوازی کەلتووری سیاسی: ئەوەی جێگەی گفتوگۆ نییە ئەوەیە هەریەکە لە (فەلسەفە و سیاسەت) بەرهەمی شارن، ژیانی شار ئاڵۆز و فراوانە و پێویستی بە ڕێکخستن و یاسا و هێز و دەسەڵات هەیە، بەپێچەوانەی ژیانی لادێوە کە بە کوێخایەک ئیشوکارەکانی دەڕوات بەڕێوە، بەپێچەوانەوە شار پێویستی بە شارەوان و پۆلیس و حاکم و قازی و توێژی جیاوازی پیشەوەر هەیە، بەڵام ئەگەر سەیری کەلتووری کوردی بکەین هیچ یەکێک لەو ناوانەی وەک (پۆلیس، قازی، دادگا، شارەوان، فەرمانبەر، سەرۆک) چەندانی تر، لەناو دەقەکانی زمانی کوردیدا بوونیان نەبووە، هەندێک لەم ناوانە لە دوای دروستبوونی (کۆڕی زانیاری کورد)، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو وشەیان نوێیان بۆ داتاشین، لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئێستا هەندێکیان جێگەی خۆیان نەگرتووە.

ڕۆژژمێر و مێژوو: لەبەرئەوەی کورد دەوڵەت و یاسا و پیشەوەری شاری نەبووە، زۆر پێویستی بە ڕۆژژمێر و حسابی ڕۆژانە نەبووە، زیاتر ئیشیان بە وەرزەکان هەبووە بۆ کاری کشتوکاڵ و دروێنە و چاندن، سەرەتای زستان و چلەی زستان و هاوین و چلەی هاوین، لای کورد ناسراوە، ئەگەر سەیری شێوە ژیانی کوردەواری بکەین زۆربەی ڕووداوەکان دەبەستێتەوە بە کارەسات و ڕووداوە گەورەکانەوە، وەک: (ساڵی بەفرە سورەکە، ساڵی گرانی گەورە)و چەندانی تر، بەڵام ژمارەی ساڵەکە نازانێت، هەموو ئەمانەش بەڵگەی بایەخ نەدانی کوردە بە ڕۆژژمێر و مێژوو، بێگومانە هەموو ئەمانە کەلتووری شار و ڕوویەکی گەشی کۆمەڵی شارە، هەربۆیە لای کورد جێگەی بایەخ نەبووە.

قورئانی پیرۆز ڕوویەکی بایەخ نەدانی کۆمەڵی عەرەبی پێش ئیسلام دەگێڕێتەوە، کاتێک قورئان دابەزیوە پرسیاریان کردووە لە پێغەمبەر (د.خ) لەبارەی (مانگ)ەوە، قورئان ئەفەرموێت: **(يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ)** البقرة

١٨٩. پرسیارت لێدەکەن لەبارەی مانگی یەک شەوەوە، پێیان بڵێ: ئەوە بۆ کاتی (مواعید) خەڵکی و حەجە. عەرەبەکان لە بازاڕدا بۆ کاتەکانی (سو، سەلەم، قەرز) و زانینی مانگە حەرامەکان، پێویستییان بە زانینی مانگەکان هەبووە، وەک کۆمەڵێکی نەخوێندەوار.

گیانی تۆڵەکردنەوە و زبری: ئەگەر یەکێک لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵی شار لێبوردن و نەرمیی و هەڵکردن بێت لەگەڵ جیاوازییەکاندا، هەروەها پەنابردنە بەر یاسا و دادگا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکانیان، ئەوا لەناو کۆمەڵی لادێ و ژیانی خێڵدا ڕق و تۆڵەکردنەوە یەکێکە لە نیشانەکانی ئازایەتی و مەردایەتی، تەنانەت ئەگەر کەسێک نەتوانێت تۆڵە بکاتەوە بەچاوێکی کەم سەیری دەکرێت، هەموو ئەمانەش لەناو دابونەریت و ژیانی ڕۆژانەدا ڕەنگدانەوەی هەیە، وەک: (تۆڵە بەسەبرە ئەمما بە زەبرە، شەڕ بە کۆنە قین ئەکرێت، ئەگەر لە جافان یەکێک بمێنێ تۆڵەی بەرودوا ئەسێنێ)و چەندانی تر.

لەم ساڵانەی دوایداو هەتا ئێستاش چەندین کارەساتی کوشتن لەسەر پارچەیەک زەوی، یان بەهۆی لە وەرگا و پوش پاوانەوە ڕوویانداوە و ڕوودەدەن، هەندێک جار ئەو ڕووداوی کوشتنانە لەناو یەک خێزان و خزمی پلەیەکی یەکتریدا بووە، ئەم هەموو زبریی و توندوتیژیی و کوشتنە، هەروەها نەگەڕانەوە بۆ یاسا و دادگا و پەنابردن بۆ چەک و زمانی کوشتن، وێنەیەکی پاشکەوتووی کۆمەڵێکی دواکەوتووی دوور لە شار پیشان دەدات.

شانازی بە بنەچە و باوانەوە: کۆمەڵی دوورە شار زۆر شانازی بە بنەماڵە و بنەچەی خۆیەوە دەکات و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهێزن، بەپێچەوانەی شارەوە کە بنەماڵە و پەیوەندی خزمایەتی کاڵ و بێ کاریگەرە، ئەوەی تێبینی دەکرێت هەتا ئێستا شانازی کردن بە خێڵ و شار و لادێ و ناوچەوە لەناو کورددا بەهێزە، هەرچەندە لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو بەرەو کاڵبونەوە چووبوو، بەڵام بە کاریگەری سیاسیی و زیندووکردنەوەی عێل و دیوەخانانە و زۆر شتی ترەوە، جارێکی تر ڕووی لە بوژانەوە کردووە.

لە کۆمەڵی شاردا کەسانی داهێنەر و فەیلەسوف و سیاسی گەورە و خاوەن پشەی دەست ڕەنگین ناو دەردەکات و جێگەی سەرنجی خەڵکییە، بەڵام پێگە کۆمەڵایەتییە تەقلیدیەکان وەک ئاغا و دەرەبەگ و خاون مەڕو ماڵاتی زۆر هیچ بایەخێکیان نییە، بەڵام ئەوەی تێبینی ئەکرێت هەتا ئێستا لای کورد ئەم ڕەنگدانەوە لاوازە و گەشەی نەکردووە.

## سەرچاوەکان

١- د.حسێن خەلیقی، کۆمەڵناسی کوردەواری، ب١و٢، چ١، ١٩٩٢، بەغداد.

٢- عبدالرحمن ابن خلدون، مقدمة ابن خلدون، (ثلاثة أجزاء) التحقيق: د.علي عبدالواحد الوافي، ط٧، مصر، ٢٠١٤.

٣- عەلادین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، بەغداد، ١٩٧١.

٤- کلاودیس جێمس ڕیچ، گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان، چ٣، دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٢.

٥- محەمەد فەریق حەسەن، مێتەڵێتی خێڵ، چ١، دەزگای ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٨.

٦- محەمەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخ سلێمانی وە وڵاتی، چ٢، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٧- محەمەدی خاڵ، شێخ، پەندی پێشینان، چ٢، بەغداد، ١٩٧١.

٨- نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین کۆمەڵە بابەتێکی کۆمەڵناسی، چ١، لبنان، ٢٠١٥.

٩- نەوشیروان مستەفا ئەمین، بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین، کتێبی یەکەم، چ١، لبنان، ٢٠١٢.

# بونیادی مەقاصدی بۆ شارسازییەکی تەندروست وبەردەوام





**پ.ی.د هاشم عومەر ئەحمەد**

لەدایکبووی ١٩٧٥، هەڵەبجە، خاوەنی (٧) توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە، مامۆستایە لە بەشی یاسای زانکۆی هەڵەبجە.

## دەروازە:

قسەکردن لەسەر بابەتی مەقاصد و مەبەستە گرنگەکانی شەریعەت لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا، تایبەتمەندیی وگرنگییەکی زۆری هەیە بۆ تێگەشتنێکی گونجاو دروست لە بوونی ژیان و ئەحکامەکان لە دوو ڕەهەندەوە، ئەوانیش ڕەهەندی تێگەیشتن و خوێندنەوەی دەقە بە مانا فراوانییەکەی دەق و مامەڵەکردنیکی گونجاو پێویست بۆیان، دوومیشیان ڕەهەندی تێگەیشتنی واقیع و بابەت و ڕووداوە تازەکانە کە دێتە سەر ژیانی مرۆڤ و خوێندنەوەیانە وەک خۆیان، بۆ ئەوەی مانا فراوانەکەی دەقی بەسەردا دابەزێت لە ڕەهەندە مەقاصدییەکەیەوە کە ئەمەش مەبەستمانە لەم بابەتەدا.

## تەوەرەی یەکەم: جێنشینی و ئاوەدانی شار لەسەر بنەمای مەقاصدیی:

### چەمکی مەقاصیدی شەریعە:

بۆ تێگەیشتن لە خوێندنەوەیەکی مەقاصدی بۆ شارسازی پێویستە سەرەتا تێڕوانینێکمان هەبێت بۆ واتای مەقاصیدی شەریعەتی ئیسلامی کە بریتییە لەو: حیکمەت و مانا بینراو و دیارانەی حوکمە شەرعییەکانی ئیسلام، کە خودا مەبەستی بووە بێتە دی لە تەشریعاتەکانیدا، ئەمەش بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی دروستە بۆ بەندەکانی لە هەردوو جیهاندا.

کەواتە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە دروست و چاکەکان بۆ مرۆڤایەتی مەبەستی خوای گەورەیە و دەبێت بێتەدی لەکاتی جێبەجێکردنی دەقەکاندا، چونکە دواجار دەق هاتووە بۆ پاراستنی مەقاصیدە گرنگ و پێویستەکانی مرۆڤەکان، چونکە مرۆڤەکان بێ پاراستنی ئەو زەرورياتانە ژیان و بوونیان دەکەوێتە مەترسییەوە، ژیان و بوون و گەردوونیش بەرەو تێکچون و لەناوچوون دەچێت، ئەوانیش پێکدێن لە پاراستن و پارێزگاری کردن لە پێنج زەروریاتەکانی ئیسلام کە بریتییە لە:(ئایین، گیان، ئەقڵ، ماڵ و وەچەوناموس).

– جێنشینی و ئاوەدانی شار و تێڕوانینێکی مەقاصدیی:

بابەتێکی هەنوکەیش کە قسە و باسێکی زۆر هەڵدەگرێت لە بنیادی فیکر و مەبەستەکانی دەقدا بابەتی شارئاوەدانیی و شارسازییە کە پانتاییەکی گرنگی فیکری هەیە لە مەعریفەی دەقی جێگیرکراو و چەسپاوەکاندا وەک خوای گەورە دەفەرمێت {**هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا**} (هود:٦١)، بەواتای خودا ئێوەی لەو خاکەدا بەدیهێناوە و بەرپای کردوون بۆئەوەی ویستی ئاوەدانی بکەن و ببنە هۆکارێک بۆ شارئاوەدانی و خۆشگوزەرانی(١). لەسەر زەویدا. لەپاڵ ئەمەشدا خوای گەورە ئاسانکاری بۆ مرۆڤەکان کردووە بۆ ئامادەگی ئاوەدانی و هەوڵدانی زیاتری شارسازیی و هۆکارەکانی بۆ فەراهەم کردوون، وەک دەفەرمێت: {**ألم تروا أن الله سخر لكم ما في السماوات وما في الأرض وأسبغ عليكم نعمه ظاهرة وباطنة**} (لقمان:٢٠)، واتە ئەو بەهرە و ناز و نیعمەتە ئاشکار و پەنهانانەی زەوی و ئاسمانەکانی بەسەر ئێوەی مرۆڤدا ڕژاندووە و ملکەچی کردوون، تاوەکو بە باشترین شێوە زەوی جوان و ئاوەدانی بکەنەوە و خزمەتی پێبکەن و دووربن لە بەکارهێنانی خراپ و ناتەندروستی ئەم نیعمەتانە و خراپەکاری لە زەویدا(٢). خۆ ئەگەر زەویمان ئاوەدان نەکردەوە و هەوڵی خراپەکاریماندا و بووینە وێرانکار و گەندەڵکار لە زەویدا، ئەوە ئێمە لاماندواە لە مەقاصیدە پیرۆزەکانی دەق و

شەریعەت و دەرەنجامی خراپ چاوەڕوانمانە لە قیامەتدا، وەک خوای گەورە دەفەرموێت: {**تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ -مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**}، کەواتە بونیادی شار و جوانشاریی و شارپارێزی پێویستە لەسەر بنەمای جێنشین بوون و ئاوەدانکردنەوەی زەوییەوە سەیر بکرێت کە بنەمای گرنگی مەقاصیدی شەریعەتن و پێویستە ڕەچاو بکریت، بێ ئەم دیدگایە مرۆڤ جوانییەکانی سروشتی شار و پاکێتی مەعنەوی شار لەدەست دەدات، و تەنها شار لە بەرد و دار و بونیادە ماددیی و بونییەکەیەوە سەیر دەکات، ئەمەش پێگە و گەورەیی شار و ئاوەدانکردنەوەی دەکەوێتە سەر چەند و چۆنی ماددیی و تەسک بینییە دونیاییەکە.

بۆیە ئەمڕۆش ئاوەدانی شار و خۆشییەکانی تەنها لەو دیدگاوە دەبینین کە کام شارمان شەقامی پان و پۆڕ و ڤێلا و تاوەرە بەرزەکانی تێدایە، بەڵام ئایا پرسیارمان لە خۆمان کرد کام لە مانە جێگەی ئاکار و خۆشگوزەرانی مەعنەویی و بونیادی مرۆڤ و چێژی ژیانی هەیە، ئایا پێمانوایە جێنشینی و ئاوەدانی زەوی کە خودای گەورە فەرمانی پێکردوین لێرەدا بەدی دەکەین، ئایا مەبەستە گرنگەکانی شەریعەت ڕەگیان داکوتیوە لەم جۆرە شارانەدا، یان کاتیەتی جارێکی دی مەعریفەی زهنی شارسازی خۆمان بگۆڕین و بونیادی شار بکەینەوە لەسەر ئەو بنەما گرنگانەی مەقاصیدی ئیسلامی کە لەدواییدا باسیان دەکەین، ئەم کارەشە پێویستە مسوڵمان بیکات وەک فەرمانێکی ئیلاهی نەک خۆدزینەوە لەو فەرمانە و خۆسەرقاڵکردن بەکاری دیکەی دونیاوە.

## تەوەرەی دووەم: بنەمای مەعنەویەت بۆ شارسازی

بەوپێیەی مرۆڤ جێنشینە و فەرمان پێکراوە بە ئاوەدانکردنەوەی زەوی کە ئەمەش مەبەست لێی تەنها بونیادی ماددی نییە لە ئیسلامدا، بەڵکو لەوەش گرنگتر بونیادە مەعنەوییەتەکەیەتی کە مرۆڤەکان هەمیشە عەودالێنی بۆ دۆزینەوەی خۆیان و پێگەیان لەناو بووندا، ئەمەش درێژ دەبێتەوە بۆ ئەو ژینگە و بازنەیەی کە مرۆڤی تیادایە، وەک خودا دەفەرموێت: {**وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ (٣٥) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣٦) رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ**}(إبراهیم:٣٥-٣٧)، ئەمەیە پانتاییە فیکرییە فراوانەکەی مەقاصیدی شەریعەت بۆ ئاوادەنکردنەوە و گەشەی زەویی و بەردەوامییەتی ژیان تیایدا، کە بەبێ ئەم تێڕوانینە پاکە مەحاڵە زەوی و شارمان ئاوەدان بێت، وەک خوای گەورە دەفەرمێت {**وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً**} (البقرة:٣٠).

ئا لێرەوەیە خودا دونیابینییەکی فریشتە ئاسامان پێ دەدات-تا ئەو کاتەی بیر و هزرێکی خوداناسی و بۆ خواناسی و مرۆڤدۆستیمان هەبێت بۆ ئاوەدانیی و خۆشگوزەرانی زەوی و بەخشینی بەخشندەیی بە مرۆڤەکانی شار، نەک ڕق و قین و توندوتیژیی و خراپەکاریی و وێرانکاری شار، هەر ئەم خەسڵەت و وەسفەشە لە پێغەمبەراندا هەیە بەتایبەت محەمەد(د.خ)، وەک خوای گەورە وەسفی دەکات و پێمان دەڵێت و فێرمان دەکات ئەی مرۆڤی شار ببینن چۆن و کێ شار ئاوەدان دەکاتەو، وەک دەفەرموێت {**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً**

**لِلْعَالَمِينَ**} (الأنبياء :١٠٧). دەی ئەمە ئەو ڕوانگەیە کە پێویستە بۆ بونیادی شار، و شاری مەعنەوی لەسەر دروست بکرێت، بۆیە بەخشندەیی و سۆز و میهرەبانی جوانترین مەبەستەکانی شەریعەتن بۆ مرۆڤایەتی، ئەی چۆن دەبێت شارسازی بکەین بێ ئەوەی بنەمایەکی مەعنەوی نەبێت بۆ ئەم شارە.

بابچینە باغی ئەو زانستەی کە فێری بەندە تایبەتە حەکیمەکانی دەکات و بە(من لدن) باسی دەکات، لەوێشدا ئەو دونیابینییە مەعنەوییەی شارسازی دەبینین، دەیخۆ ناکرێت خوای گەورە باسی گەورەترین چیرۆکی ژیانی پێغەمبەرێکمان بۆ بکات لە قورئاندا بێ ئەوەی ئێمە سودی لێ بینین بەتایبەت کاتێک قسەوباسەکە لە زانستی(من لدن) ەوە بێت، دەی باپێکەوە بچینە نێو ئەو چیرۆکەی موسا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ پیاو چاکەکەدا، کە خوای گەورە چەندین وەسفی جوان و بەپێزی ئەم کەسایەتییە دەکات و دەفەرموێت {**فَوَجَدَا عَبْدًا مِنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا**} (الكهف:٦٥)، کەسایەتییەک وەسفکراو بە بەخشندەیی و زانستخواز، دەی خۆ دەبێت ئەم دوو خەسڵەتە جوانە تەنها بۆ خۆی بێت؟ یان گەر بڕوانینە چیرۆکەکە شتێکی دیکەمان پێ دەڵێت، ئەویش هەموو ئەو خەسڵەتانەی بۆ مرۆڤدۆستی و خزمەتی بەندەکانی خودا بەکاری هێناوە.

لە دیوێکی دیکەی چیرۆکەکەوە مانا مەقاصیدییەکانی ئەم دوو خەسڵەتە بەدی دەکەین بۆ بونیادنانی شارێکی تەواو پڕمانا بە خۆشەویستی و بەختەوەریی و خزمەتکردن بە مرۆڤایەتی، با پێکەوە بچینە خزمەت ئەم ئایەتە {**فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا**} (الكهف:٧٧)، گەر ڕووکەشی دەق و واقیعەکە ببینین، گەر بگونجێت و دروست بێت بڵێین وەک چۆن موسا پێغەمبەر بینی، ئەوە تەنها دیوە کورت و ناتەواوەکەی ژیانی شارمان بەدی کردووە وەک ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین هاوشێوەی ئەو سەردەمە، بەڵام بە ڕەنگ و بۆن و تامی جیاواز، خۆ مرۆڤەکانی ئێستاش هەن و دەژین و لە شاردان، بەڵام کوا ئەو شار و شارسازییەی کە هەموومان ئاواتی بۆ دەخوازین ببێتە بەهەشتێکی سەرزەمین بۆ خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی تاک و خێزان و کۆمەڵگە، ئاخر لەبەرئەوەی ئێمە بوینەتە ڕۆبۆت و بەرنامەیەکی کۆمپیوتەریی و یارییەکی ئەلیکترۆنی و قاسەیەکی پارە، کە هەریەکەمان چیرۆکی تایبەتی خۆی هەیە و دابڕاوە لەوانی دیکە، کۆمەڵێک بیر و ئەندێشەی هەیە جیاواز لە خانەوادە و هاوڕێ و کۆمەڵگە، ئەی ئەمەیە لەم چیرۆکە پڕ مانادا موسا پێغەمبەر پێمان دەڵێت هەوڵکانمان بۆ بونیادی شار و کۆمەڵگە تەنها با لەدیوە ماددیی و بەرژوەندخوازییەکەوە نەبێت.

ئەوەتا لە مەقام و پێگەیەکی دیکەی زانستی(من لدن)دا پیاوچاکەکە بەڕوونی دیوە مەقاصیدییەکەی شارسازی لە ڕووی مەعنەوییەوە دەخاتە ڕوو و پێمان دەڵێت ئاگادار بن و وریابن شار بە بەخشندەیی و سۆز و زانستەوە گەورە دەبێت و خەسڵەتەکانی وەردەگرێت، فەرموون بڕواننە ئەم ئایەتە کە خوای گەورە بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت {**وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ...**} (الكهف:٨٢)، سەیر دەکەین ئەم ئایەتە چەند جوان دەمانگەیەنێتە شارێکی مەعنەوی دروست و پێمان دەڵێت:

١-شار دروست دەبێت بە بەرد و دار و چیمەنتۆ و کەرەسەکانی دیکەی ماددی ژیان، بەڵام گەنجینە و گەوهەرە درەوشاو و ڕووناکەکەی شار شاراوە دەبێت و بەدەر ناکەوێت و بنەمای شارسازییەکی تەواوی تیادا بەدی ناکرێت، ئەگەر ئەم شارە ڕێچکەیەکی دروستی

مەعنەویی و خواناسی نەگرێتە بەر، ئەوەتا خوا دەفەرموێت(المدینة)، بەڵام ئەم مەدینە کەموکورتی هەیە، ئەویش دوورکەوتنەوەیە لە فەرمانی خودا و نزیکبونەوەیە لە کردەوە و کارەکانی شەیتان و بەرژەوەندخوازەکان.

٢-خۆ ئەگەر شارسازی کەسانی پاک و دڵسۆز نەیکەن، ئەو کات شار و گەنجینەکەی دەکەوێتە دەست کەسانی بەرژەوەندخواز و پاوەنخواز و گەندەڵ و ئەوەی لەژێر زەمین و سەرزەمینی ئەو شارەیە دەیبەن بۆ خۆیان و مافی خەڵکی خاوەن مافیش دەخۆن و ناتوانن ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی بۆ شاریش فەراهەم بکەن، وەک چۆن خەڵکی ئەو شارەی کە موسا پێغەمبەر دیوارەکەی بۆ چاککردنەوە، بەڵام مافەکەشیان پێ نەدان.

٣- شارسازی بە کەسانی دانا و زانا و دڵسۆز دەکرێت، بەوانە دەکرێت کە خاوەن ماڵ و مافن و مافی کەسانی دیکەش ناخۆن، هەورەها دەبێت لەم شارەدا متمانە و ئەمانەت بوونی هەبێت تاوەکو خاوەن ماف ئاسوودە بێت لەوەی ماڵەکەی ناخورێت و بەهەدەر ناڕوات، بەڵکو بەختەوەرە بەوەی کەماڵەکەی لە کاری بەسوود و بەرژوەندی مرۆڤدا بەکاردەهێنرێت، وەک خوای گەورە دەفەرموێت **{فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا}.**

٤-پێویستە شارسازی لەسەر بنەمای خۆشەویستی و لێبوردەیی و ئاشتەوایی و زانستخوازی بونیاد بنرێت، کە هەمووی تیایدا هەست بە دادگەریی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی بکەن.

٥-شارسازی بێ هۆشیاریی و مەعریفەی مەعنەویی و پرسیاری دروست لە زیهنێکی کراوە و زیندووەوە بۆ دامەزراندنی شارێکی تەواو، مەحاڵە تاک و کۆمەڵگەیەکی بەختەوەر لەو شارەدا دروست ببێت، چونکە تەنها وروژاندنی بابەتەکانی شار و پرسیارکردن و هەڵەشەیی و زۆرکردن لە خود بۆ تێگەیشتن لە شار بەبێ بنەمایەکی دروست و تێگەشتنێکی واقیعی کارەسات دەخولقێنێت و دەرەنجامی کۆمەڵگە و شاریش وێرانی دەبێت، وەک خوای گەورە دەفەرموێت **{يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}** (المائدة:١٠١). خۆ ئەگەر هۆشیاری شارسازی نەبوو یان پرسیار هەبوو لەوبارەوە با پرسیار لە شارازایان بکەن، وەک خوای گەورە دەفەرموێت**{فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ}** (الأنبياء:٧)، خۆ ئەگەر ئەمەمان نەکرد شار پڕۆپاگەندەی نادروست و نابەجێ لەناوی دەبات و دەبێتە دووبەرەکیی و ئاژاوە بۆ کۆمەڵگە و دواجار وێرانی شار و نائارامی دەروونی تاکەکان وەک خوای گەورە دەفەرموێت **{وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ)** (النساء:٨٣).

بەرمەبنای ئەمانەی باسمان کرد:

شارسازییەکی ژیاری بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا پێویستە لەسەر ڕێباز و ڕەگەز و بنەماکانی گەشەی شارستانییانە و ژیارییانە بنیاد بنرێت، کە لە گیانێکی ئاکاری باڵا و بەهایەکی بەرز و و ڕەهەندە خودیی و ناوخۆییەکەیەوە-واتە هۆکارە مەعنەوییەکانی تێدا بەرجەست ببێت نەک تەنها ڕووکەشە مادییەکەی – بەرجەستە بووبێت، نەک لەسەر بەرژەوەندخوازیی و چاوچنۆکی و گەندەڵی، چونکە جیاوازییەکی گەلێک زۆر هەیە لە نێوان شارسازی ژیاریی و شارستانیەتێکی ڕووکەشی و دەمامککراودا. ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کە زۆرێک لە نوسەران و بیرمەندان لە بواری گەشەی شار و مەعنەویەتی شارسازیدا باسی لێوە دەکەن و جیاوازییان کردووە لە نێوان شارستانیەت و شاری مەعنەویدا، ئەوەتا هەندێک لەو بیرمەندانە کاتێک دێن قسە لەسەر شارستانیەت و ئاوەدانی شار دەکەن، پێیانوایە کە شارستانیەتی شار وڵات لەسەر بنەماکانی ئاکار و پاراستنی بەها

بالاکان وەستا بێت و دەستی گرتبێت بە هۆکار و ڕەگەزەکانی پێشکەوتنەوە، شارێکە بەواتای شارێکی مەعنەویی و بالا و گشتگیر و مرۆڤدۆست، لە هەردوو ڕەهەندەکەشەوە-(ڕەهەندی ڕووکەش و ڕەهەندی ناوخۆیی و خودی)ەوە و ڕەفاهییەتی ژیانی مرۆڤەکان و خۆشگوزەرانیان تیادا بەرجەستە دەبێت، لەگەڵ ئەمانەشدا هۆکار و ئامرازەکانی بژێوی ژیان و ئاوەدانی فراوانتر دەبێت، کە تەنها ڕووکەشی نابێت(٣).

کەواتە پێویستە لە بونیادە فراوانەکەی شارسازیدا لەپاڵ گرنگیدان بە ڕووکەش و ئامراز و بەرهەم و هۆکارەکانی ژیار و شارستانیەت گرنگی زیاتر بدرێت بە بالایی مەعنەویی و ناوکرۆکی شتە بەسوود و جوانەکانی ژیان لە لێبوردەیی و ئاشتەوایی و پێکەوەیی و دوور لە توندوتیژیی و دەمارگیری...، نەک تەنها گرنگی بدرێت بە ئامراز و هۆکارە ڕووکەشییەکانی شارستانیەت بێ کارکردن لەسەر پرەنسیپ و بنەما جوانەکانی پێشکەوتنی شار، دواجار دەبێتە هۆکارێک بۆ گومرایی و گەندەڵی و دوورکەوتنەوە لە ئاییندارییی و بەها بالا و پیرۆزەکان، دەرەنجامیش لەناوچوون، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: {**أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ**} (الروم:٩)، کەواتە توانا و هێز و ئاوەدانکردنەوە و شارستانیەتی فراوان، ئەمانە هەموویان هۆکار نین بۆ بەردەوامییەتی شار و گەشە و ئاوەدانکردنەوە بەبێ پابەندبوون بە یاسا و ڕێساکانی خوداوە(٤).

ئەمە و چەندین ئایەتی دیکەی خوایی هەیە چ بە نوسراو وەک ئایەتەکانی قورئان یان مەشهود وەک بوونی شوێنەوار کە دەیسەلمێنێت ئەو شارستانیەتانەی تەنها گەورەییان لە ڕووکەش و ئامراز و هۆکارە مادییەکانی شاردا دۆزیوەتەوە چۆن لەناوچوون و بەرەو هەڵدێر ڕۆشتوون، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: {**وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ**} (الأعراف:٧٤)، کەواتە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە هەر شارێک دوورکەوتەوە لە خواناسی (**قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ**) و خۆناسی (خلفاء-جێنشینی) دەرەنجامەکەی ڕووخان و لەناوبردنی شار و شارسازییە ڕووکەشییەکەیان بووە، وەک خوای گەورە دەفەرموێت {**فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ**} (الأعراف:٧٨).

لە بەرامبەردا هەر خوایە ئاگادارمان دەکاتەوە و بەهۆشمان دێنێتەوە بۆئەوەی پەند و ئامۆژگاری وەرگرین لەوانەی شارسازییان کرد پێش خۆمان و سەیری جۆری شارسازییەکەیان بکەین لە چ ئاست و پێگە و مەقامێکی گەورەدا بووە خودا وەسفی کردووە.

کەواتە پێویستە بیر بکەینەوەی بۆئەوەی سەیری جۆری دووەمی شارسازی بکەین کە چۆن خودا وەسفیان دەکان بە باشە و هەڵگری ئاکاری بەرز و خاوەن بەهای بالا، خۆ ئەمجۆرەشیان هۆکار و ئامرازە ڕووکەشەکانیان بەرجەستە کردووە و بەکاریان هێناوە، بەڵام لەپاڵ ئەمەدا توانا خودیی و ڕەگەزە مەعنەویی و بەهابالاکانیان لە بیر نەکردووە، بەڵکو هەردووکیانیان پێکەوە گرێداوە، ئا لێرەدایە خودا فەرمانمان پێ دەکات بۆئەوەی چاویان لێ بکەین و سوود لە ئەزموون و شارسازییەکانی ئەوان وەربگرین، وەک دەفەرموێت {**وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُون- قُرآناً عَرَبِيّاً غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ**} (الزمر:٢٧-٢٨).

لەم سۆنگەوە سەیری نمونەی دەقەکان دەکەین بۆئەوەی سرووشیان لێوەرگرین و



# ئەگەر شارسازی کەسانی پاك و دڵسۆز نەیکەن، ئەو کات شار و گەنجینەکەی دەکەوێتە دەست کەسانی بەرژەوەندخواز و پاوەنخواز و گەندەڵ.

لەژێر سێبەریاندا بحەسێینەوە، چونکە ڕۆحییەت و مەعنەویەتی شارسازی لە قورئاندا باسکراوە، ئەمەش ئەو پەیوەندییەیە کە دەمانەوێت دروست ببێت لە بونیادنانەوەی شاردا، ئەوەتا قورئان چەندید نمونەمان بۆ باس دەکات لەوبارەوە، ئەو پەیوەندییەشمان فێر دەکات بۆئەوەی ببێتە بناغە و ڕەگەزەکانی شارسازی کە ئەویش بوونی مرۆڤە لەسەر زەویی و پەیوەندی بە ئاوەدانکردنەوە و گرتنەبەری هۆکارەکان، ئەمەش پەیوەست کراوە بە پەرستش و بەندایەتی خوداوە، وەک خودا دەفەرموێت {**لَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ**} (یونس:٩٨).

ئالێرەدایە باوەڕ سوودی هەبوو بۆ هاوڵاتیان تاوەکو بونیادی شارسازییەکی دروست بکەن، ئەم مەرجەش تا بوونی باوەڕ بوو ئەگینا کاتێک دوورکەوتنەوە خودا جۆرێکی دیکە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات(٥) وەک دەفەرموێت:{ولو أن أهل القرى آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض ولكن كذبوا فأخذناهم بما كانوا يكسبون}(الأعراف:٩٦) { **وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ** } (النحل:١١٢)، پەروەردگار لەم دەقانەدا دەلاقەی لایەنە مەعنەوییەکەی مرۆڤ و شارسازی بەگوێی ئێمەدا دەدات و بەهۆشمان دێنێتەوە، لەو ڕوانگەی کە تەنها ئەوەی مایەی ئاسوودەیی و خۆشبەختی و گەشەی بەردەوامە بۆ مرۆڤەکان لە شارسازیدا تەنها ئەو ئارامییەیە کە لە باوەڕ و یەقینێک بەخواوە سەرچاوەی گرتبێت (**قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً**)، (ئاشتی و ئاشتەوایی و پارێزراوی) وەک لە دەقەکەدا هاتووە گەورەترین ناز و نیعمەتە خودا دەیدات بە بەندەکانی لە شارسازیدا، لەپاڵ ئەمەشدا خودا ناز و فەڕ و نیعەمتێکی دیکەش باس دەکات ئەویش(**مطْمَئِنَّةً**)، واتە ئاسودەیی و دڵئارامی کە گەورەترین پایە و بنچینە و ڕەگەزەکانی ڕاوەستانی ژیانی مرۆڤە. گەر مرۆڤ ئەمانەی هەبوو لە شاردا ژیانێکی ئارام و جێگیر و ڕاوەستاوی دەبێت، هەروەک پارێزراویی و ئارامی گەورەترین نهێنی خۆشبەختی و جێگیری و خۆشگوزەرانی مرۆڤن، خودا دەفەرموێت {**لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشتآء والصيف فَلْيَعْبُدُواْ رَبَّ هَٰذا البيت الذي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ**} (قريش:١-٤)، هەر کاتێک مرۆڤ لە شاردا زکێکی تێر و دڵێکی ئارام و ژیانێکی جێگیر و باوەڕێکی پتەوی هەبوو ئەوکات مرۆڤ هەست بەبوونی خۆی دەکات و دەتوانێت بە ڕەفاهییەتەوە ژیان بەسەر ببات لەو شارەدا کە لەسەر ئەم بنەمایە سازی کردووە(٦).

کەواتە پایەکانی باوەڕ و هۆکار و ڕەگەزە دونیاییەکان پێکەوە دوو دیوی کارەکانی مرۆڤن لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا، ناکرێت بۆئەوەی دونیابینییەکی فراوانمان هەبێت تەنها پشت بە یەکێکیان ببەستین، ئەمەش هەر ئەو هاوکێشەیەی ژیانە کە پێغەمبەر(د.خ) وەک نمونەیەکی جوانی ژیان پێمان دەبەخشێت دەفەرموێت ((**مَن أصبحَ آمنًا في سِرْبِهِ، مُعافًى في جَسَدِهِ ، عندَهُ**



# پایەکانی باوەڕ و هۆکار و ڕەگەزە دونیاییەکان پێکەوە دوو دیوی کارەکانی مرۆڤن لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا.

**طَعَامُ يَومِهِ، فكأنَّما حِيزتْ لهُ الدُّنيا))(رواه البخاري في الأدب المفرد:بَابُ مَنْ أَصْبَحَ آمناً في سربه،ر**(٣٠٠):١٢٧)(٧)، ئەمەش بۆئەوەیە دەرک بە گرنگی بابەتی ڕۆحیی و مەعنەوی مرۆڤەکان بکەین لەچوارچێوەی بەرنامەی ژیانیاندا لە زیندووکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی شاردا بەو شێوازەی دەبێتە هۆی ئاوەدانی دڵ و دەروون و ژیانیان. هەر ئەم بیرکردنەوە تەندروستە بوو لە ژیان و بوون و مرۆڤ و شار و ئاوەدانی کە یەثریبی کردە مەدینەی ڕووناک، لە شاری ئاژاوە و دووبەرەکییەوە گۆڕا بۆ شارێکی ئاوەدان و ئاشتەوایی و پێکەوەیی ئایینی.

دواجار دەڵێین: پێویستە وێنە و نەخشەی شارێکی شارساز و ئاوەدان لەم ڕوانگەوە سەیر بکرێت و نەخشە و پلانی بۆ دابنرێت، تاوەکو شار ببێتە شارێکی ئاوەدان و دادگەر و هاریکار لەناو خۆیاندا.

لێرەدا دەمەوێت ئەوە وەبیربهێنمەوە وەک چۆن (ئیبن خەلدون) لە پەرتوکەکەیدا دەڵێت: مرۆڤ بە سرووشتی خۆی کەسێکی ژیاریی و کۆمەڵایەتییە، بۆیە پێویستە کۆببێتەوە و تیکەڵ بێت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئەمەش واتای ئاوەدانی دەگەیەنێت(٨)، چونکە خوای گەورە مرۆڤەکانی وا خەلق کردووە کە ناکرێت بێ ئاو و خواردن و خواردنەوە و مامەڵ لەگەڵ یەکدی بتوانن ژیان ببەنە سەر، ئەمەش وادەکات لە مرۆڤ بیر لە تێکەڵی و پێکەوەیی و خۆگونجاندن و ژیانسازی و شارسازی بکاتەوە، خۆ ناکرێت بەتایبەت لەم سەردەمەدا مرۆڤەکان خۆیان بەدووربگرن لە پیشەسازی و کار و جوتیاریی و ئامرازەکانی گواستنەوە و گەیاندن و بەدەستهێنانی پێداویستییەکان....هتد، چونکە شارسازی بێ ئەم ئامادەکاریی وپێشینە و بنەمایانە مەحاڵە گەشە و جێگیریی و بەردەوامی و شاریتانییەت و ڕەفاهیەت و گەورەبوون بەخۆیەوە ببینێت.



### تەوەرەی سێیەم: بنەما مەقاصیدیەکانی شەریعەتی ئیسلام بۆ بونیادی شارسازی

گرنگترین کارێک پێویست بێت بۆ بونیادی مرۆڤ لە شەریعەتدا: ڕەچاوکردن و پارێزگاری لێکردن و فەراهەمکردنی ژیانێکی ئاسودەیە بۆی لەژێر سایەی مەبەست و ڕۆحی دەقەکانی ئاییندا، ئەویش بە پاراستن و پارێزگاری کردن لە ئەم چەمکە گرنگانە کە بێ ئەم بنەما و چەمکانە ژیان و بوونی مرۆڤ لە شاردا هیچ مانا و مەفهومێکی بوون و واقیعی و لۆجیکی نابێت ئەگەر جەستەکەشی بوونی هەبێت، ئەو چەمکانەش کە ئیسلام هاتووە پارێزگاری لێدەکات لەبەر خاتری مرۆڤ بۆ مرۆڤ بریتین لە: (ئایین، گیان، ئەقڵ، ماڵ، وەچە)، کە نەمانی هەریەک لە مانە دەبێتە دارمان و وێرانی لە ژیان و ژینی مرۆڤدا و ئەوکاتەش شار بێ ژیانی مرۆڤ هیچ مانایەکی تەواوی نابێت و تەنها تەختە و دار و بەرد و کەرەستەکانی دیکە دەبێت.

کەواتە بۆ پارێزگاریکردن لەم مرۆڤە-وەک ئایین کردویەتییە مەبەستە زەرورییەکانی خۆی- پێویستە ئەوەشی ڕێگا و ئامراز و هۆکار بێت بۆ ئەو پاراستن و پارێزگارییە بیگرینە بەر بەمەرجێک گونجاو و دروست بێت لەگەڵ ڕۆح و مەغزا و کرۆکی شەریعەتدا ئەگەر نا دروست نییە و لە سەرەتاوە پوچەڵ و بێ مانا و بێ مەبەست دەبێت.

یەکێکیش لەو ڕێگا و هۆکارانەی دەبێتە هۆی ژیانەوە و پاراستنی بەندەکانی خودا بوونی شارسازییەکی گونجاو و شایستەیە بەم مرۆڤە، واتە پێویست هەموو شتەکان بخرێنە خزمەتی مرۆڤەوە، وەک خودا دەفەرموێت{**أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً** }(لقمان:٢٠)،و{**وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ * وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ**}(إبراهيم:٣٢-٣٣)و{هو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعا}( البقرة:٢٩٦).

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە چەند بنەمایەکی مەقاصیدیمان هەیە بۆ بونیادنانی شارسازییەکی تەواو لەپێناو پاراستنی ئایین و گیان و... ئەم مرۆڤە لەو شارەدا، وەک بنەمای(دفع الضرر مقدم على جلب المنفعة) واتە دوورخستنەوەی زەرەر و زیان لە مرۆڤ پێشترە لە هێنانی سوود و قازانج بۆیان (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب(، هەروەک چەندین بنەمای گرنگی دیکە هەن هەموویان بۆ خزمەتی مرۆڤە و بونیادی شارێکی گونجاوە بۆی تاوەکو ئاسودە بێت.

بەرمەبنای تێگەشتن و چۆنیەتی کارکردن و هەڵێنجاندن لە دەقەکان دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە پێویستە لە بونیادی شارسازیدا ڕەچاوی ئەم بنەما مەقاصیدییانە بکرێت، و هەوڵی جێبەجێکردنی تەواوەتی بدرێت تاوەکو ژیانی مرۆڤەکان و مرۆڤایەتیش بگەڕێنەوە سەر ڕێباز و ڕێگا ڕاست و دروستەکەی ئەو ژیانەی کە خوای میهرەبان بۆی دیاریکردووین، هەر ئەویشە زانا و دانا و جوانکار و دروستکەری ئەم ژیان و گەردوونە و هەموو شتەکانی دیکەی، کەواتە تەنها خودایە دەزانێت چی باش و چاکە بۆ مرۆڤەکان ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنین. ئەو بنەما سەرەکییانەش کە لە مانەی خوارەوە پێکدێت، دابەشکراوە بەسەر ئەو ڕەگەزە گرنگانەی کە شارسازی پێویستی پێیەتی و لەسەری بونیاد دەنرێت، ئەوانیش(٩):

### ڕەگەزی یەکەم: شارسازی لەڕووی بونیادی ئاوەدانی کەرەستەییەوە:

#### ١. پاراستنی ئایین:

کردنەوەی مزگەوت و ئەو شوێنە ئاینییانەی کە ڕێگە پێدراون، و پاراستنیانە لە خراپەکاری و ڕووخان و داگیرکردن، جوانترین نمونەش بۆ ئەمە نمونەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب دێنینەوە کە کتێبەکانی سیرە و ژیاننامەکان باسی دەکەن کاتێک نەیویستووە لەناو کڵێسای ئاینی مەسیحیدا

نوێژ بکات نەوەک مسوڵمانەکان بە نەزانین دواتر بیکەنە بیانوو و پاساو بۆ ئەوەی بیکەنە مزگەوت.

**٢. پاراستنی گیان و ژیان: پارێزگاریکردن لە مافی دانیشتوان لە:**

- دابینکردنی ئاو و پێداویستییەکانی دیکەی هاوڵاتیان و دیاریکردنی شوێنێکی شیاو بۆ هاوڵاتیان بۆ نیشتەجێبوونیان بەمەبەستی پارێزگاریکردن لێیان لە لەناوچونیان.
- پاراستنی دانیشتوان لەڕووی ئاسایشییەوە لەو شوێن و جێگەدا کە شاری تیادا بونیاد دەنرێت.
- گونجانی شارسازی لەگەڵ ژینگەی شاردا بۆ خزمەتی هاوڵاتیانی شار.
- دابەشکردنی شوێنی کاری هاوڵاتیان (فەرمانبەران و ئەوانی دیکە) بەپێی نزیکیان لە شوێنی نیشتەجێبوونیان لەپێناو پاراستنی خۆیان وخێزانیان.
- دیاریکردنی شوێنی نیشتەجێبونی گونجاو بۆ هاوڵاتیان، ئەمەش بۆ پاراستنی گیانیان لە لافاو و زریان و کارەساتە سروشتییەکانی دیکە، بەواتای ئەوەی پێویستە لە شارسازیدا ماستەرپلانی شار بە ڕوونی دیاریکراو بێت و لە خزمەت هاوڵاتیاندا بێت نەک بازرگان و کەسانێکی کەمی دیاریکراو.

**٣. پاراستنی ماڵ و سەروەت: پارێزگاریکردن لە زەویی وزار و سامانی هاوڵاتیانی شار:**

- پارێزگاریکردن لە مافی موڵکدار و چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن بەو مافەوە.
- پارێزگاریکردنی ئەو هاوڵاتیانەی کە توانای نیشتەجێبوونیان هەیە لەڕووی داراییەوە.
- پارێزگاریکردن لە سامانی سروشتی و عەقاری بۆ خزمەتی هاوڵاتیانی شار.

**٤. پاراستنی وەچە:**

- پارێزگاریکردن لە خێزانەکانی بۆ دابینکردنی شوێنی نیشتەجێی گونجاو بەپێی بارودۆخی دارایی و پێداویستییەکانیان، ئەمەش لەسەر بنەمای دادگەری کۆمەڵایەتی نەک چینایەتی کۆمەڵایەتی.
- دابینکردنی شوێنی گونجاو و ڕێکوپێک بۆ هاوڵاتیان وەک نەخۆشخانە و کتێبخانە و دایەنگە و پارک و شاری یاری ....هتد، بەمەبەستی پاراستنی خێزان و منداڵان لە نەخۆشی و بێزاریی و کاری توندڕەوەیی و خراپەکاری و بەرەڵایی بێ مانا.
- دابینکردنی شوێنی تایبەتی و گونجاو بۆ ئەو گەنجانەی کە خواستی هاوسەرگیریان هەیە.

**ڕەگەزی دووەم: شارسازی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:**

**١-پاراستنی ئایین: ئەویش لە ڕێگەی ڕۆڵی مزگەوت و شوێنە ئاینییەکانەوە.**

- پاراستنی بەها باڵاکان و دابونەریتە جوانەکانی کۆمەڵگە.
- هۆشیارکردنەوەی تاک و کۆمەڵگەی شار بە ئاکارە جوان و باڵاکان بەتایبەت لێبوردەیی و ئاشتەوایی و ئاشتەوایی کۆمەڵگە و یەکترقبوڵکردن .... هتد.

**٢-پاراستنی گیان و ژیان: پاراستنی بازنە و چوارچێوەی ژیان و گیانی تاک و کۆمەڵگە لە ڕێگەی:**

- پارێزگاریکردن لە پەیوەندی و پەیوەستبوونی کۆمەڵایەتییەوە.
- ڕێکخستنی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی تاک لە کۆمەڵگەدا.
- ڕەچاوکردنی چۆنیەتی دابەشکردنی کوچە و کۆڵان و بازاڕ و شوێنە گشتییەکانی دیکە لەپێناو پاراستنی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی تاک و خێزان.
- دوورکەوتنەوە لە دیاریکردنی شوێنێکی کۆمەڵایەتی لە جێگەیەکدا کە ببێتە هۆی لەناچوونی گیان و ژیانی هاوڵاتیانی شار یاخود بارگرژی و تێکدانی ئاشتەوایی و پێکەوەژیان لە نێوان خێزانەکاندا.

**٣-پاراستنی ماڵ و سەروەت:**

- فەراهەم کردنی هەلی کار بۆ دانیشتوانی شار.

- پارێزگاریکردن لە سامان و موڵکی گشتی و تایبەتی تاک.

- پێدانی پێشینە بۆ پارێزگاریکردن لە تاک و خێزان و کۆمەڵگە لە دارمانی ئابووری، کە ئەمەش سەردەکێشێت بۆ دارمانی کۆمەڵ لەڕووی ئاکار و بەهاکانەوە.

**٤-پاراستنی وەچە:**

-هاندانی تاک و خێزانەکان بۆ کرانەوە بەڕووی یەکدیی و یەکترقبوڵکردن و مامەڵەنەکردن لەسەر بنەمای چینایەتی و شتە نادروستەکانی دیکە، بەڵکو هەرچۆنێک بێت پێویستە مامەڵەی شایستە و گونجاوی بەرامبەر بکرێت، نەک هەر چین و توێژێک و تایفەیەک بۆ خۆیان لەناو خۆیاندا کارە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجام بدەن، بەتایبەت لەڕووی هاوسەرگیریی و هاریکاری خێزانی و بەخشینەوە، ئەمەیە کە خودای گەورە بەئاگامان دێنێتەوە بەتایبەت لە بونیادی شارسازیدا { **يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**}(الحجرات:١٣)، هەروەها پێغەمبەریش(د.خ) دەفەرموێت((**يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الجَاهِلِيَّةِ وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلاَنِ: بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللهِ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللهِ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ، وَخَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ، قَالَ اللَّهُ: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**))(سنن الترمذي:باب ومن سورة الحجرات ، ر(٣٢٧٠):٥/٣٨٩)(١٠)، کەواتە بۆئەوەی ژیانی هاوسەرگیری تەواو و تەندروست پێک بێت لەم شارەدا پێویستە بیرکردنەوەکان بگۆڕێت لە چینایەتی و توێژایەتییەوە بۆ کەرامەت و مرۆڤبوونی خودی مرۆڤەکە نەک باگراوندی هۆز و سەروەت و سامان.

**ڕەگەزی سێیەم: شارسازی لەڕووی ئابووریی و دەرامەتەوە:**

**١-پاراستنی ئایین:**

-مزگەوت و شوێنە ئاینییەکان هاوکاربن بۆ هۆشیارکردنەوەی دەسەڵات و دەسەڵاتداران و بازرگان و هاوڵاتیان لەپێناو بەهەدەر نەدانی سەروەت و سامانی وڵات.

-هاندان و وەئاگاهێنانەوەی دەسەڵاتداران بۆ دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانی شار بەسەر هاوڵاتیاندا کە دادگەری تیادا بەرجەستە ببێت، ئەوەندە ئەم بابەتە گرنگە خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەران کردووە و ڕەوانەی کردوون بۆ جێبەجێکردنی دادگەری {**فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ**}(الشورى:١٥)و{ **ٰأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ**}(المائدة:٨).

**٢-پاراستنی گیان و ژیان: بۆ پارێزگاری کردن لە گیانی هاوڵاتیانی شار پێویستە:**

- دەسەڵات و دەسەڵاتداران واز لە زیادەڕۆیی بهێنن لەڕووی داراییەوە کە دەبێتە هۆی گەندەڵی و خراپەکاری لە شاردا، وەک خوای گەورەش فەرمان دەکات{ **يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ**}(الأعراف:٣١)،و{ **وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا (٢٦) إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا**}(الإسراء:٢٦ -٢٧). ئەم فەرمانە ئیلاهییە بۆ هاوڵاتیانی دیکەشە نەک تەنها دەسەڵات، ئەویش بۆ پاراستنی ژیانی مرۆڤە بۆئەوەی پەنا نەبات بۆ خراپەکاري ی وکوشتن و کاری نابەجێ کە گیان

و ئەندامی جەستەی خۆی و خەڵکی دیکە بخاتە مەترسییەوە لەپێناو پەیداکردنی بژێویدا.

-بۆئەوەی هاوڵاتیان بتوانن کار و بازرگانی خۆیان بە ئاسانی و بێ گرفت و کێشە بەئەنجام بگەیەنن، پێویستە بازاڕ و بازاڕگە و شوێنی بە بازاڕکردن و هاوردە و ناردنی کاڵا و شتومەکەکان بەشێوازێک دیزاین کرا بێت لەم شارەدا و شوێنی شایستە و گونجاوی بۆ تەرخان کرابێت، کە خزمەت بە گیان و ژیانی هاوڵاتیان بکات، نەک هاوڵاتی و جوتیار و کرێکار هیچ لێی سودمەند نەبن، بەڵکو بۆ پارووەیەکی خێزانیان ڕێگای نادروست بگرنە بەر و زەرەر و خراپە بە گیان و جەستەی خۆیان و خەڵکی دیکە بگەیەنن، دواجار ترس و بیم بڵاو ببێتەوە لە کۆمەڵگەدا.

**٣- پاراستنی ماڵ و سامان: بۆ پارێزگاریکردن لە ماڵ و سامانی هاوڵاتیان لە شاردا:**

- پێویستە شارسازی لەسەر بنەما و بناغەیەکی ئابووری تۆکمە بنیاد بنرێت.

- بنیادنانی ژێرخانێکی ئابووری پتەو بۆ خزمەتکردنی هاوڵاتیان.

- پارێزگاریکردن لە بازاڕ و چاودێریکردنی بۆئەوەی خواست و داواکاری لەناو بازاڕدا تێک نەچێت و نەبێتە هۆکاری هەژاریی و بێکاری لەناو شاردا، چونکە دواجار شارسازییەکی لاواز و لەرزۆک بەدی دێت و هاوڵاتیان تووشی گرفتی دارایی دەبنەوە.

- دادگەری بۆ پارێزگاریکردن لە ماڵ و سەروەت و موڵکی تاک و گشتی پێویستیەکی کەسی ئادەمیانەیە لە هەموو کات و شوێنێکدا، کە خوا فەراهەمی کردووە بۆ ئادەمیزاد بەبێ جیاوازی لە ڕەنگ و ڕەگەز و هۆز و تایفەدا، چونکە هەموو چەمکەکانی مافی مرۆڤ و کەرامەت و ڕێزگرتنی تاک و برایەتی و یەکسانی هاوکاری کۆمەڵی و گشت مانا جوانەکانی دیکەی مرۆڤانە، هیچ پێگە و مانایەکی واتاداری نابێت بەبێ دادگەریی و جێبەجێکردنی لە بونیادی شاردا، ئەمەش لەپێناو شارسازییەکی دادپەروەرانە بۆ گشت هاوڵاتیان .

**٤- پاراستنی وەچە: بۆ پارێزگاریکردن لە خستنەوەی نەوە و ناموسی هاوڵاتیان:**

-. پێویستە لە بونیادی شارسازیدا ڕەچاوی پرسی هاوسەرگیری لە بابەتەکانی تێچونی دارایی و و کارئاسانی کردن بۆ فەراهەم کردنی شوێن و جێگەی گونجاو بۆ هاوسەرانی تازە، نەک هەر لە سەرەتای هاوسەرگیرییەوە عەوداڵی شوێن و جێگە بن و لە کرێچێتی و دەربەدەریدا بژین.

- دانانی بناغەیەکی پتەو و تۆکمە بۆ چۆنیەتی و چەندێتیی وەچە خستنەوە بۆئەوەی بابەتی چڕیی و ڕێژەی دانیشتوان هەر لەسەرەتاوە بە بەرنامە و پرۆگرامێکی شەرعی و تەندروست بێت.

## ڕەگەزی چوارەم: شارسازی لەڕووی ژینگەوە:

**١-پاراستنی ئایین:**

-بۆ پاراستنی ئایین بواری ژینگە و ژینگەدۆستی کاریگەری ڕاستەوخۆ و گرنگی هەیە لەسەر پارێزگاری کردن لە یئاین و ئاییندارى بۆیە پێویستە:

- هانی هاوڵاتی بدرێت بۆ بونیادنانی شار: پاک و خاوێنی ئەو شارە ڕابگرن، ڕێگا و شەقام و شوێنە گشتی و تایبەتییەکان بە پاک و خاوێنی ڕابگرن.

- دوورخستنەوەی ئەو خراپەکاریی و پیسی و خاشاک و خۆڵانەی کە شار ناشیرین دەکەن، ئەویش بەکارکردن لەسەر دیاریکردنی شوێنێکی تایبەت بۆ ئەو خۆڵ و خاشاکانە.

- هاندانی هاوڵاتی بۆ دوورخستنەوەی ئەو هۆکارانەی کە لەسەر شەقام و ڕێگاکانن و دەبنە ئەزیەت و زەرەر بۆ هاوڵاتیان.

- هاوڵاتیان هۆشیار بکرێنەوە و نەهیان لێبکرێت بەوەی کە دەستدرێژی نەکەنە سەر ڕێگا گشتییەکان و ئەو سنورەی بۆیان دیاریکراوە نەیبەزێنن.

- پارێزگاریکردن لە ژینگەی ئایینی و سرووشتی

و زانستی شار بۆئەوەی شار بکرێتە مەڵبەندێکی زانستی و ژینگەیی دروست.

ئەمانەی باسمان کرد چەندین فەرمودەی پێغەمبەرمان(د.خ) لەسەری هەیە، کە هانی مسوڵمانان دەدات بۆ پاراستنی ژینگەی شار و دەوروبەری خۆی و بە بەشێک لە پایەکانی ئیمانی مسوڵمانی داناوە، وەک دەفەرموێت ((**الإيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ ، أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ ، شُعْبَةً ، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ ،وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ**)) (رواه مسلم في صحيحه:كتاب الإيمان،باب شعب الإيمان،ر (٣٥) :١ /٦٣)(١١)، (( عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: «إياكم والجلوس في الطرقات» قالوا: يا رسول الله ما لنا بد من مجالسنا نتحدث فيها، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: «فإذا أبيتم إلا المجلس فأعطوا الطريق حقه» قالوا: وما حقه؟، قال: «غض البصر، وكف الأذى، ورد السلام والأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر)) (واه مسلم في صحيحه:كتاب اللباس والزينة، باب النهي عن الجلوس في الطرقات وإعطاء الطريق حقه،ر(٢١٢١): ٣ /١٦٧٥)(١٢).

**٢-پاراستنی گیان و ژیان:**

مەبەستێکی گرنگی ئەم ئیسلامە پارێزگاریکردنی گیان و جەستەی تاک و کۆمەڵە لە شتە پیس و خراپەکان، ئەویش لە ڕێگەی:

- دوورخستنەوەی ئەو زیانە تەندروستیانەی کە تووشی شار دەبن.
- دوورخستنەوەی ئەو زیانە تەندروستیانەی کە لەسەر شەقام و گەڕەک و مۆڵەکاندا هەیە.
- هەڵبژاردنی شوێنێکی گونجاو و تەندروست لەڕووی ژینگەوە بۆ بونیادنانی شار.

دابینکردنی ئەو پێداویستی و کەرەستانەی کە دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی شار لەڕووی ژینگەوە.

- بەرەو هۆشیاری ژینگەیی لە شارسازیدا بۆ فەراهەمکردنی ژیانێکی تەندروست بۆ خۆمان و ئایندەی خاک و نیشتمان و نەوەکانمان.

**٣-پاراستنی ماڵ و سەروەت:**

.پاراساتنی سەرچاوە ژینگەییەکان جا سرووشتی بێت یان ئایینی یان کەلتووری، کە سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتن بۆ بونیادنانی شارسازی.

- پارێزگاریکردن لەو سەرچاوە سرووشتییە ژینگەییانەی کە دەبێتە هۆی پەیداکردنی بژێوی بۆ تاک و کۆمەڵ و برەودان پێیان لە ڕێگەی پرۆژەی ژینگەییەوە بۆ خزمەتکردنی هاوڵاتیان و شار.

-- هۆشیارکردنەوەی تاک و بەرپرس و دەسەڵات لە زیان گەیاندن بە ژینگە لەڕووی ئابووریی و تەندروستی و ژینگەییەوە، چونکە یەکێک لە سەرچاوەکانی سامانی شار.

هەر لەمبارەوە خوای گەورە هۆشداریمان پێ دەدات کە ژینگەی شار و زەوی تێک نەدەین، لە دوای ئەوەی خوای گەورە بە جوانترین شێوە بۆی ڕازاندوینەتەوە {**وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ**}(**الأعراف:٥٦**)، { **وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ**} (**الأعراف:٨٥**)، و{**كُلُوا وَاشْرَبُوا مِنْ رِزْقِ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ** } (البقرة:٦٠). ئەم دەقانە و چەندین دەقی دیکە ئەوەمان پێ دەڵێت: کە تەنها گەندەڵی و وێرانکاریی و خراپەکاری لە بواری ئایینی و ئاکار و کۆمەڵایەتیدا نییە، بەڵکو ئەم چەمکە درێژدەبێتەوە و دەگاتە هەر گەندەڵی و خراپی و وێرانکارییەک کە بکرێت بەرامبەر بە ژینگەی سرووشتی مرۆڤ، ئەوانەشی خەریکی خراپەکارین لە ژینگەدا خوای گەورە سزایان دەدات وەک چۆن سزای خراپەکارانی دیکە دەدات، لەبەرئەوەی پاراستنی ژینگە یەکێکە لە مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامی و پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت.

هەروەها لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا چەندین دەق هەیە باس لەوە دەکات کە پارێزگاریکردن لە سرووشت و ژینگە بەشێکە لە باوەڕ و پێچەوانەکەشی دژی باوەڕە، بۆیە پێویستە

هەمووومان بەرپرس بین بەرامبەر بە ژینگەی شار، وەک پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت ((**كلُّكم راعٍ، و كلُّكم مسؤولٌ عن رعيَّتِه**)) (رواه البخاري:كتاب في الاستقراض...،باب العبد راع في مال سيده...،ر(٢٤٠٩)) (١٣). هەروها نابێت ببینە هۆکاری زیانگەیاندن لە هەر شتێک لە ژیاندا بوونی هەبێت لە مرۆڤەوە کە گەورەترین دروستکراوی خوایە تاوەکو بچوکترین شت، لەو نێوەندەشدا نابێت زیان بە ژینگەمان بگەیەنین کە پاراستنی یەکێکە لە مەبەستەکانی شەریعەت و پابەندبوونی ئیمانیشە، ئەوەتا پێغەمبەرمان(.خ)دەفەرموێت ((**مَنْ قَتَلَ عُصْفُورًا عَبَثًا عَجَّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْهُ يَقُولُ يَا رَبِّ إِنَّ فُلَانًا قَتَلَنِي عَبَثًا وَلَمْ يَقْتُلْنِي لِمَنْفَعَةٍ**)) (**رواه أحمد في مسنده،ر(١٩٤٧٠):٣٢ /٢٢٠)(١٤)، و ((مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً صَوَّبَ اللَّهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ))(رواه أبوداودفي سننه: بَابٌ فِي قَطْعِ السِّدْرِ»ر(٥٢٣٩) :٣٦١/٤)(١٥)، و((إِنْ قَامَتِ السَّاعَةُ وَفِي يَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ،فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ لَا تَقُومَ حَتَّى يَغْرِسَهَا، فليغرسها**))(رواه البخاري في الدب المفرد،باب اصطناع المال،ر(٣٧١):١٨١)(١٦).

لەم فەرموودانەوە چەند پرەنسیپ و بنەمایەکی گرنگمان دەستدەکەوێت بۆ شارسازی لەم سەردەمەدا ئەوانیش:

- هەتا ئەوکاتەی کە کۆتایی مرۆڤایەتیش دێت لەسەر زەویدا پێویستە پارێزگاری لە ژینگەی شارمان بکەین و دنیامان سەوز و ڕەنگین بکەین.

- نابێت ببینە هۆکاری نەمانی سەوزایی شار، بەڵکو بەپێچەوانەوە شار سەوزتر بکەین، گەر وامان نەکرد تووشی سزا دەبین و خوای گەورەمان لێ توورە دەبێت.

- نابێت بێ هۆکار زیان بگەیەنین بە گیانداران و پەلەوەرەکانی شارمان، بەڵکو بەوانەوە شار جوانتر دەبێت، هۆکارێکیش دەبێت بۆ ڕاکێشانی گەشتیاران و پاکێتی ژینگەمان.

## لە کۆتاییدا

ژیان گەر مەبەست و ئامانجمان هەبێت تیایدا زۆرجوان دەبێت و دەتوانین بیکەینە بەهەشتێکی دونیا بۆ خۆمان، لەناو ئەم ژیانەشدا بۆئەوەی جوانتر بێت ئەو خۆشگوزەرانییەی دونیا بەدی بێت، پێویست بە شوێن و جێگەیەک دەکات کە بتوانین حەز و ئاوات و خۆشییەکانی تیادا بەدی بهێنین ئەویش لە شارسازییەکی گونجاو و تۆکمەدا بەدی دێت، کە مەبەستەکانی شەریعەتی تیادا جێبەجێ بکرێت، ئەویش بە دوورخستنەوەی خراپە و زیانەکان و هێنانی شتە باشەکان بەپێی بنەمای(دفع المفسدة أولى من جلب المصلحة). کەواتە ناکرێت شار لەسەر بونیادی زیاندان دروست بکرێت، ئەمەش دوورە لە ڕاستی و مەغزا و ڕۆحی شەریعەتی ئیسلامەوە وەک پێغەمبەرمان (د.خ)دەفەرموێت: {لاضرر ولاضرار}( رواه أحمد في مسنده:مسند ابن عباس ،ر(٢٨٦٥): ٥٥/٥). واتە ناکرێت و قەدەغەیە لەسەر مرۆڤ هەم زیان بە خۆی بگەیەنێت هەم بە هاوڵاتیانی دیکە، چونکە هەموویان بران و بەندەی خوان لەم شارەدا، ناکرێت ژیان لەسەر بنەمای زیانگەیاندن بێت، هەر ئەمەش مرۆڤدۆستی و ئاشتەوایی و پێکەوەیی و مرۆڤ سەنتەرییە لەئیسلامدا، لەمەش زیاتر پێغەمبەرمان(د.خ) دەفەرموێت: {**لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حتّى يُحِبَّ لأخِيهِ ما يُحِبُّ لِنَفْسِهِ**} (رواه البخاري في صحيحه:كتاب الإيمان، باب: من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه، ر(١٣) :١٢/١).

لەو سۆنگەوەیە کە دەڵێین، شارسازی بێ جێبەجیکردنی بنەماکانی ئیسلام و مەبەستەکانی زەحمەتە شارێکی مرۆڤدۆست و ئاشتیخواز و خۆشگوزەران و ڕەفاهیەت بێتەدی کە هەمووی وەک برا تیایدا ژیان ببەنەسەر و هەرکەس شتێکی پێ خۆش بوو بۆ خۆی دەبێت بۆ براکەشی پێی خۆش بێت، چونکە ئەمە لە ئیمانەوەیە و خودا فەرمانی پێکردووە.

بەرمەبنای ئەمانە دەڵێم، پێویستە شارسازی لەسەر ئەم بنەما مەقاصیدییە شەریعەتییە گرنگانە دروست ببێت، ئەگەرنا چاوەڕێی بەردەوامی و گەشە و دادپەروەری لەو شارە ناکرێت، ئەو بنەما گرنگانەش بریتین لە:

**١-مەقصەد و مەبەستی جێنشینی مرۆڤ لەسەر زەوی:**

خوای گەورە دەفەرموێت: { **وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً**} (البقرة:٣٠).

**٢- مەقصەد و مەبەستی ڕامهێنان و فەراهەمکردن:**

خوای گەورە دەفەرموێت { **لَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ (٣٢) وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ- وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ** } (إبراهيم:٣٢-٣٤).

و{**أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ**} (الحج:٦٥.)

**٣- مەقصەد و مەبەستی ئاوەدانکردنەوە:**

خوای گەورەدەفەرموێت {**هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ** }(هود:٦١) و{ **هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ** } (الملك:١٥).

ئەم مەبەستانە و چەندین مەبەستی دیکەی گرنگ هەن بۆئەوەی مرۆڤەکان بتوانن شارسازی لە دید و ڕوانگەیەکی مەقاصیدی شەریعەتەوە و ڕۆح و مەغزای دەقەوە بنیاد بنێن.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


- پاش قورئانی پیرۆز:

١سەیری: موکریانی، هەژار،وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز، نشر إحسان – تاران، :٢٢٨.

٢ سەیری:موکریانی: ٤١٣ ، وأمين، بورهان محمد، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەشتنی قورئان، چاپی دووەم: ٤١٣.

٣ سەیری: القحطاني، د.مسفر بن علي، الوعي الحضاري مقاربات مقاصدية لفقه العمران الإسلامي، الشبكة العربية للأبحاث والنشر: ٣٨.

٤ سەیری: موکریانی: ٤٠٥، وأمين: ٤٠٥.

٥ سەیری: الشعراوي، محمد متولی، تفسیر الشعراوی (خواطر)، مطابع أخبار اليوم:١٠ / ٦٢١٣-٦٢١٤.

٦ سەیری: الشعراوی:١٣ / ٨٢٥١.

٧ البخاري، محمد بن إسماعيل، صحيح الأدب المفرد للإمام البخاري، حقق أحاديثه وعلق عليه: محمد ناصر الدين الألباني، دار الصديق للنشر والتوزيع، ط٤ / ١٩٩٧

٨ ابن خلدون، ولي الدين عبدالرحمن بن محمد، مقدمة ابن خلدون، تحقيق: عبدالله محمد الدرويش، داريعرب-دمشق، ط ١ / ٢٠٠٤م: ١ / ١٣٧.

٩ سەیری: المسلمي، أحمد منصور، العمران الأصالة والمعاصرة رؤية إسلامية لتخطيط المدينة العصرية، دارالواضح-الإمارات، ط / ٢٠١٤ :١٧٢.

١٠ رواه الترمذي في سننه: الترمذي ، محمد بن عيسى، سنن الترمذي، تحقيق وتعليق: أحمد محمد شاكر وآخرون، شركة مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي – مصر، ط١٩٧٥/٢م.

١١ مسلم بن الحجاج النيسابوري، المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي – بيروت.

١٢سەرچاوەی پێشوو.

١٣ البخاري، محمد بن إسماعيل، الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه (صحيح البخاري)، ت: محمد زهير بن ناصر الناصر، دار طوق النجاة، ط١٤٢٢/١.

١٤ابن حنبل، أحمد، مسند الإمام أحمد، ت: شعيب الأرناؤوط وآخرون، مؤسسة الرسالة، ط٢ / ١٩٩٩م.

١٥ أبوداود، سليمان بن الأشعث بن إسحاق،سنن أبي داود، ت:محمد محي الدين، المكتبة العصرية-بيروت.

١٦ البخاري، صحيح الأدب المفرد.

# ئەدگارەکانی شاربوون لە سەردەمی نەوەی دووەمی قوتابخانەی بابان دا





**پ.ی.د سەلام ناوخۆش**

پ.ی.د سەلام ناوخۆش، لەدایکبووی ١٩٦٦، هەولێر، خاوەنی (٦٠) کتێبی چاپکراو و ژمارەیەکی زۆر توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە، مامۆستایە لە زانکۆی سەلاحەدین.

## دەروازە

**شاربوون پێکهاتەیەکی حەزارییە چەند ئەدگارێکی هەیە، کە هێڵی جیاکەرەوەن، دەلالەت لە گۆڕانی کۆمەڵ دەکەن. شاربوون بەشێکە لە بەرهەمی سەرمایەداری. هەبوونی «ململانێ» یان «ئەویتر» لە هاوکێشەکە بەشێک لە شاربوون دەگەیەنێت، لەوێ هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەگۆڕێت، زەویداریی و دەرەبەگایەتی بەرەو کزیی دەچن.**

**نەوەی دووەمی قوتابخانەی بابان لە نەوەی یەکەم زیاتربوون، بەڵام پاشتر ناتەباتر هەمە چەشنە بوون.**

لەم کورتە وتارەدا ئاماژەی بە پێکهاتەکانی شار لە سەردەمی نەوەی دووەمی بابان دەکەم.

چەمکی شاربوون: لە شاردا کەسانێک دروست دەبن، ئەو چەشنە کەسانە هەڵگری بیرکردنەوەیەکن لە گوند نین، لە شار ئێلێت: سۆسیۆلۆگ، منەوەر و ورد بۆرژوا و ئەشراف هەن، ئەوانە زۆری لەرزۆک و لەسەر بەرژەوەندی دەژین (ناوخۆش ٢٠٢٠:٢٧) پیرەمێردی شاعیر زۆربەی ئەشرافەکان بە (وڵاتفرۆش) ناودەبات:

**وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان**
**هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان**

فەرهاد پیربالّ لە کتێبی (گەنجە کوردەکان)دا ئاماژە بە شوناسی ئەو گەنجانەی شار دەکات، کە زۆربەیان هاتنەوە سلێمانی نەک هەر عەلمانی بوون، بەڵکو مارکسیش بوون.

فایەق بێکەس دەربارەی ئەشراف و منەوەری کوردان دەڵێت:

**منەوەر زۆری هەر لەبەر نانی**
**وەتەن ئەفرۆشێ بە یەک تارانی**
......

ئەشرافمان هەموو بێ ڕۆح و سستن
دەخیلە پشتیان هیچ پێ مەبەستن
هەموو ناکۆک و پارە پەرستن

لەلایەکی تر، شار بووە هۆی کۆکردنەوەی کەسەکان لەسەر پرانسیپی هزریی و سیاسی و بەرژەوەندی نەک عەشیرەت و دەڤەر.

ئادگارەکانی شاربوون: شار هەندێ ئادگار لەخۆدەگرێت، لە گوند نییە، شار هێمای زیندووبوونە، بەڵام بیابانشین و گوندنشین ڕەمزی مردنی بەهاکانە. شار وەک ناوەندێکی هزریی و حەزاری چەند ئەدگارێکی هەیە، لەوانە:

**یەکەم/ هەبوونی میدیا:**

میدیا لە نێو شار سەریهەڵدا، سۆن بە یاریدەی بەشێک لە نووسەرانی نەوەی دووەمی بابان یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە باشووری کوردستان بە ناوی پێشکەوتن لە ١٩٢٠ دەرکرد(١) لە پاش ڕاوەستانی ڕۆژنامەکە بە کەمتر لە هەفتەیەک مستەفا پاشا یامولکی لە ١٩٢٢\٨\١٢ ڕۆژنامەیەکی تری لەژێر سایەی ئینگلیز بەناوی (بانگی کوردستان) دەرکرد(٢) ، لە پاش ئەو دوو ڕۆژنامەیە چەندەها ڕۆژنامەی تر وەک بانگی هەق، ئومێدی ئیستقلال، ژیانەوە(٣) ، ژیان ....هتد دەرکەوتن. لەنێو ئەو هەموو ڕۆژنامەیە شوناسی نوێ دەرکەوتن.

**دووەم/ فۆرمەکانی ئەدەب:**

لە نەوەی یەکەمی قوتابخانەی باباندا تەنیا شیعر هەبوو لەگەڵ هەندێک پەخشان لە فۆرمی مەولودنامەدا (بڕوانە بەکر: پەخشانی ئیسلامی کوردی، ٢٠١٩)، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا شیعر هەر بە هەرمێن بوو، نەوشێروان مستەفا لە (بەرگی سێیەم کتێبی یەکەم،٢٠١٩، ل١٢) ئاماژە بە شازدە شاعیر لە ( فایەق)ەوە تا (ڕەمزی ) دەکات، ئەو شاعیرانە لای ئەو درێژەپێدەری نالی و سالم و کوردی بوون،» بەڵام چەندان شاعیری دی لە سلێمانی هەبوون وەک ئەوانە بیریان

نەدەکردەوە، هەندێک هەر ئاییندار نەبوون! جگە لەو شاعیرانە چەندان وتارنووس لەنێو نەوەی دووەم هەبوون وەک جەمال عیرفان و مستەفا پاشا یامولکی، هەروەها نوڤلیتنووسی وەک جەمیل صائیب و ئەحمەد موختار بەگی جاف خاوەنی دەقی وەک لە (لە خەوما(٤)) و (مەسەلەی ویژدان) بوون! هەر لە سەردەمی نەوەی دووەمی بابان رۆژنامەنووس لە باشوور دەرکەوتن کە نووسینەکانیان لە رۆژنامەکانی وەک (پێشکەوتن، بانگی کوردستان، ئومێدی ئیستقلال، ژیانەوە و ژین....هتد) بڵاو دەکردەوە، وێرای ئەوە ژانرێکی دی ئەدەبی لەو سەردەمە دەرکەوت بەناوی «رەخنەی ئەدەبی» وەک نووسینەکەی شێخ نوری شێخ صالح لە (ژین). ئەو سێ ژانرەی دوایی ( رۆژنامە، نۆڤلیت، رەخنەی ئەدەبی) تەواو بەرهەمی شار بوون.

**سێیەم/ ململانێ یا رای جیاواز:**

لە سەردەمی نەوەی یەکەمی باباندا ململانێ زیاتر لەنێو سیاسییەکان بوو، بۆ نموونە ململانێی ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشای بابان، بەڵام کەسانی وەک نالی و سالم و کوردی تێکەڵی ئەو ململانێیە نەبوون، وێرای ئەوەش ئەو سێیەش (نالی و سالم و کوردی ) گەر لەنێو خۆیان ململانێ و رای جیاواز هەبووبێت، دژ یەک نەبوون، بەڵام لەنێو نەوەی دووەمی شاعیرەکاندا هەبوو، وەک نموونەی ململانێی (زێوەر) و (فایەق بێکەس) لەسەر پرسی (مەی). زێوەر مەلا بوو، بەڵام بێکەس، ئەمرو قەیسی کورد بوو بۆیە بە شیعر لەسەر ئەم باسە وەڵامی یەکتریان دەدایەوە (هاوار: بیرەوەرییەکان، ٢٠٠٧)، هەروەها ململانێ لە نێوان بەشێک لە شاعیران و دەسەڵاتی کوردی (دەسەڵاتی شێخ مەحمود) هەبوو، شیعرەکەی پیرەمێرد لەسەر شێخ مەحمود:

**ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لەراستی مووچەخۆری خۆی**
**سوراحی سەرفرو دێنێ لە بۆ پیاڵە کە تێکا بۆی**

یان حەمدی صاحێبقران هەر بە تەنها بە نەقدی شێخ راناوەستێ، بەڵکو نەقدی دامودەزگای شێخ مەحمودیش دەکات و دەڵێت:

**شەوێک دەست ئەهریمەن کەوت خاتەمی موڵکی سلێمانی**
**کەچی میز و گزیری پێ دەکرد، قەدری وەها زانی**
( هاوار ٢٠٠٧: ١٠٥)

یاخود کەسێکی وەک جەمیل صائیب نۆڤلیتی (لە خەوما) دژ بە شێخ مەحمود دەنووسێت لە ساڵی ١٩٢٤ و دواتر لە رۆژنامەی (ژیانەوە) بە ئەڵقە بڵاوی دەکاتەوە. کەواتە ململانێی شاعیران لەگەڵ یەکتر هەروەها دژ بە دەسەڵاتی خێڵەکیی و قادریی (ئیسلامی کوردی) هەر لەنێو نەوەی دووەمی نووسەرانی بابان دروست بوو. لەنێو ئەو رەخنەیەدا لە شێخ مەحموود دەگیرا، شێخ کەسێکی لەسەر جیاوازی هزری نەکوشت (بروانە ناوخۆش: کتێبی ئیسلامفۆبیا و منەوەری کورد، ٢٠٢٠)

**چوارەم/ دەرکەوتنی حیزبی کوردی لە شار(٥):**

لە ماوەی نەوەی یەکەمدا شتێک نەبوو بەناوی حیزبی کوردی، کەچی لە سەردەمی نەوەی دووەمدا پەیوەندییە جڤاکییەکان بە ئاقارێکی تر داچوون: هزر و ئایدیۆلۆژیا، بەرژەوەندی جێگای خزمایەتی و هاوعەشیرەتی، دەڤەری گرتەوە. لەنێو ئەو هەموو بەرژەوەندییە سیاسیی و هزریی و ئایدیۆلۆژیایەدا چەند کۆمەڵەیەکی کوردی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا دروست بوون، وەک: کۆمەڵەی کوردستان، کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان و کۆمەڵەی زەردەشتی. لە بەشێک لەو حیزبانەدا ناسیونالیزم لە بریتی عەشیرەتیگەریی دروست بوو، هەروەها هەر لە شار حیزبی مارکسی دروست بوو.

شار لانک و دایەنگای هەردوو ئاراستەی حیزبی کوردییە، بۆیە جگە لەو کۆمەڵە نەتەوەییانە | سیاسییانە، لە پاش چلەکان چەند حیزبێکی مارکسیش لە شار دروست بوون وەک حیزبی

شۆڕش و حیزبی ڕزگاری....(بڕوانه: عبدالستار طاهیر شریف: الجمعیات و الاحزاب الكردیه فی نصف القرن، ٢٠٠٥)

**پێنجەم/ ئایدیۆلۆژیا و ئیسلامفۆبیا:**

له قوتابخانەی ئەدەبی بابان یان كۆمەڵەی كوردی بەگشتی دیاردەیەک نەبوو بەناوی ئیسلامفۆبیا (ترس له ئیسلام )، ئەدەب و سیاسەت و ئایینداری له یەک نزیک بوون، بەڵام لەنێو نەوەی دووەمی باباندا ئەو دیاردەیە، دیاردەی ئیسلامفۆبیا، به ئاشكرا هەبوو، بۆیه بەشێک له جلخوارەكان كەسانی وەک جەمال عیرفان و تۆفیق وەهبی، یامولكی به «فەرمەسۆن» ناوزەند دەكرد. ( بڕوانه هاوار: بیرەوەری،٢٠٠٧)

**شەشەم/ نووسینەوەی بیرەوەری:**

له هەناوی نەوەی دووەمدا دیاردەیەكی نووسین بەناوی (بیرەوەری) هەبوو، هەرسێ بیرەوەری: (ئەحمەد خواجه: چیم دی(٦))، (ڕەفیق حیلمی: یاداشت(٧)) و (یاداشتی ئەحمەد تەقی(٨)) سێ بیرەوەری دیاری سەردەمی شێخ مەحمودن، له نەوەی یەكەم دیاردەی بیرەوەری نووسین بەرچاو ناكەوێت هەتا شاعیرەكان به كۆد باسی لەدایكبوونی خۆیان یا میرێكی كوردیان كردووە، ئەو دیاردەیه بەشێكی فراوانی له شیعری كلاسیكی داگیركردووە، بەڵام له شیعری نوێ دا ئەمه زۆر دەگمەنه. ئەو سێ بیرەوەرییه لەگەڵ بیرەوەرییەكەی محەمەد ڕەسوڵ هاوار وێنەیەكی زەلاڵ دەربارەی ڕەوشی ڕۆشنبیری سەردەمی شێخ مەحمود پێشكەش دەكەن.

جگه لەو چەند دیاردەیه چەندان دیاردەی تر له شار هەن، به جۆرێک ڕۆمانووسێكی وەک چارلز دیكنز له هەردوو ڕۆمانی (ئۆلیڤەر تویست و دەیڤید كۆپەرفیلد) زۆر وێنەی ناشرینی شار پیشان دەدات بەوەی له شار ژیان، زمان، بەها كۆمەلایەتییەكان پیس دەبن.

## ئەنجام

**شار سەرچاوەی جیاوازییەكان و ململانێكانه، چەند سیما و ئادگارێک له شار هەن له گوند غائیبن. شاری سلێمانی له ڕۆژی دامەزراندنییەوە نەبووە شار، بەڵكو له دروستبوونی ئەو هەموو جیاوازییانەوە بووە به شار. له هەناوی شار هەندێ دیاردە هەن مولْكی سەرمایەدارین وەک حیزب دروستكردن، میدیا، دەركەوتنی چەندەها فۆڕمی ژانرەكانی ئەدەب وەک نۆڤل (ڕۆمان) و ڕەخنەی ئەدەبی.....**

# پەراوێزەکان

١ ڕۆژنامەکە هەتا ١٩٢٢ بەردەوام بوو، ١١٨ ژمارەی لێ دەرچوو.

٢ بەشێکی زۆر لە ڕۆژنامەنووسانی کورد وەک جەباری ١٩٧٠:٤٨ ؛ هاوار ١٩٩١:٣٢٦ هەروەها دوو براکەی بنکەی ژین ئەو ڕۆژنامەیە بەیەکێک لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحمود دەناسێنن کەچی لەڕاستیدا ئەوکات شێخ نەفی کرابوو بۆ هیندستان، مێجەرسۆن سلێمانی بەڕێوەدەبرد، بۆیە هەر لە ژمارەی یەکەم نووسراوە یامولکی مۆڵەتی لە سۆن وەرگرتووە!!

٣ ڕۆژنامەی (ژیانەوە) سەرەتای دەرکەوتنی عێراقیبوون بوو لە باشووری کوردستان، نەوشیروان مستەفا ٢٠٠٢:٣٤٤ دەنووسێت: ئینگلیز بە کوردی گووت: ئێوە تازە بەشێک دەبن لە عێراق و دەبنە هاوڵاتی عێراقی.

٤ نۆڤلیتی لە خەوما سەرەتا لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بە ئەڵقە بلاوبوویەوە، وەک کتێبیش جەمال بابان لە ١٩٧٥ بڵاویکردەوە، دەزگای ئاراس چاپی دووەمی لە ٢٠٠٨، هەروەها چاپی سێیەمی لە ٢٠١٠ بڵاوکردەوە.

٥ حیزب خۆی بەرهەمی شارە، لە سەردەمی نەوەی دووەمی بابان سێ کۆمەڵە دەرکەوتن.

٦ ئەحمەد خواجە درەنگ بیرەوەرییەکانی خۆی بڵاوکردەوە بەرگی یەکەمی (چیم دی) لە ١٩٦٨ بڵاوکردەوە؛ دەوگای ئاراس لە ساڵی ٢٠١٣ هەرسێ بەرگی لە بەرگێکدا بە ڕێنووسی نوێ بڵاوکردەوە، هەروەها بنکەی ژین لە ٢٠١٦ (چیم دی) بە چوار بەرگ لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە.

٧ ڕەفیق حیلمی لە ژیانی خۆی بەشێکی زۆری لە یاداشتەکان بڵاوکردەوە، ناهیدەی کچی ڕای وایە ئەوە هەموو نەبوو، پێش ڕاپەڕین جارێکی یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی بڵاوکرانەوە، هەروەها لە ٢٠٠١ دەزگای سەردەم بە ڕێنووسی سەردەم هەمووی لە بەرگێکدا بڵاوکردەوە.

٨ یاداشتەکەی ئەحمەد تەقی زۆر نییە، جەلال تەقی لە ساڵی ١٩٧٠ بەناوی (خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا) بڵاویکردەوە.

سەرچاوەکان


- نەوشیروان مستەفا ئەمین: نەوەی دووەمی شاعیرانی قوتابخانەی بابان. سلێمانی، ٢٠١٩.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین: ڕۆژنامەی ژیان بە تەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی، سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
- سەلام ناوخۆش بەکر: پەخشانی ئیسلامی کوردی، هیڤی، هەولێر، ٢٠١٩.
- سەلام ناوخۆش بەکر: ئیسلامفۆبیا و منەوەری کورد، دەزگای نارین، هەولێر، ٢٠٢٠.
- جلال تەقی: خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا. بغداد، ١٩٧٠.
- ناهیدە ڕەفیق حیلمی: بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥ .
- ،محەمەد ڕەسوڵ هاوار: بیرەوەری، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- دیوانی بێ کەس، کۆکردنەوەی ئومێد ئاشنا. سنە: انتشاراتی کوردستان.
- عبدالستار طاهر شریف: الجمعیات و المنزمات و الاحزاب الکردیة في نصف القرن. ط ٢. سلیمانیة، ٢٠٠٥.

# شار و لادێی سەردەم

((برسێتی و خۆشەویستی
جوڵەی ڕەوڕەوەی ئەم جیهانە ڕێکدەخەن)).
شیللەر (٢٠٠٥:٩٩)





**بێستون ئەبوبەکر عەلی**

لەدایکبووی هەڵەبجە، ماستەر لە زانستی زمانی کۆمەڵایەتیدا/ زانکۆی سلێمانی(٢٠١٥)، خاوەنی دوو توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە، مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.

## پێشەکی

مرۆڤ خۆی نازانێت بە دیاریکراوی لە کوێوە هاتووە، بە نامۆیی هاتووە و بۆ نامۆیش دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوەیە زۆرجار ترسی لە چوونەوە هەیە (بۆئەوەی مرۆڤ هەستی بە نامۆی کەمتر بێتەوە خوای مەزن قورئانی ناردووە)، ئەوەی ئاشکرایە کە لە شوێنێکدا لەدایک دەبین، باسی ئەو شوێنە و تایبەتمەندییەکانیشی دەتوانین بکەین، واتە شوێن پەسن «وەسف» دەکرێن، گرنگ ئەوەیە، ئەو شوێنەی مرۆڤ تێیدا لەدایکبووە، پێوەندی بە ئەو شوێنەوە دەکاتەوە، هاتنە دنیا ئەگەر بە خاڵی (ئەلف) دابنێین، بەڵام کاتێک کۆچی داوای دەکەین بە خاڵی (بێ) دادەنرێت، لە هەرکوێیەک بین بە منداڵی لەدایک دەبین، بەڵام کاتێک لە دنیا دەردەچین، مەرج نییە بە منداڵی بچینەوە، ئەمەش پوختەیەکی هاتن و چوونە، کە هاتنمان وەک رۆشتنەوەمان نییە، نێوان و مەودای خاڵی (ئەلف و بێ) کە لەدایکبوون و مردنە - نەزانراوە و لە کەسێکەوە بۆ یەکی تر دەگۆڕدرێت.

نەتەوە جیاوەزەکانیش لە شوێن و جێگەی جیاوازدا دەژین، لەنێو شارەکاندا فرەزمانی هەیە، بە شێوەیەکی گشتیش لە زمان و ئاخاوتنیاندا جیاوازن، ئاخاوتنی گوند و شار - جیاوازە، سلێمانی و هەولێری - ئاخاوتنیان جیاوازە، ئەم لێکنەچوونەش وایکردووە، میللەتێکی وەک کوردی دروستکردووە، کە جیاواز قسە دەکەن، بەڵام نابێتە هۆکاری ئەوەی لە یەکتری تێنەگەن، واتە زمان شوێنی ئاخێوەر» قسەکەر» دیاری دەکەن، لەنێو دنیاشدا جیاوازی شوێنەکان هۆکاری بەردەوامی ژیانە، شارەکان هەمیشە هەوڵدەدەن لە شارەکانی تر نەچن، هەر ئەم لێکنەچوونەیشە بە خودی پێکشکەوتن ناونراوە.

## مرۆڤ و بیرکردنەوەی جیاواز:

سەرەتا دەمەوێت پێکەوە تەماشای دیمەنە کورتەکانی کتێبە ئاینییەکان بکەین، کە باسی چەند رووداوێک دەکات، کە تێیدا سرووشتی کەسایەتی شار و گوند تێکەڵ بە یەکتری کراون، پێکەوە کاری لە توانا بەدەریان کردووە، ئەویش خەوتنێکی سێ سەد ساڵ زیاتر بووە، کە پێکەوە هاوبرواکان نوستوون، بەڵام خودی نوستنەکەیان چونکە رەوا بووە، بە کارێکی مەزن و لە توانابەدەر و رێنیشاندەر ناسراوە، لێرەوە باسی هاوکاریی و پێکەبوونی گوند و شارەکان دەکات، کە لەرووی ئایدیاوە یەکبن، خەونەکانیشیان دەبێتەوە کار، کارەکانیش بۆ جیهان دەبێتە رێنیشاندەر و پەرچوو(موعجیزە: واتە عاجزە لە هەموو کەسێک، جگە ئەو کەسانەی کردوویانە)، هەردوو جۆرە کەسایەتییەکەش بە جیا باسکراون، لە پیاوانی یارانی ئەشکەوتدا، کە لە تەورات و ئینجلیشدا باسکراوە، لەنێو شاردا کۆمەڵێک بیرورای جیاوازییان هەبووە، مەسیحبوون، لەنێو بتپەرستیدا هەڵیاننەکردووە، یارانی ئەشکەوت، ژینگەیەکی پارێزپەندیان لەنێو شاخێکدا هەڵبژاردبوو، کە سروشتێکی گوندی هەیە، نوێنەری دێیەکەش شوانێک بووە بە سەگەکەیەوە، ئەم شوانە بوو بە رێپیشاندەری شارییەکان و لەسەر براوی ئەوانیش مایەوە، دواتر لەنێو ژینگەی سروشتی ئەشکەوتێکدا نیشتەجێبوون، ئەمانەبوون بە فەنەر و رۆشنکەرەوەی لادێ و شارەکان و ئێستاش وەک نمونە دەهێنرێنەوە، واتە گوند و شار هەمیشە لە راستییەکاندا هاوڕان و پشتیوانی یەکترن. سەرکردەی شار (شوانی شارە) کۆمەڵێک هاوئایدیای خۆی بەدواوە بوو، بەڵام شوانی گوند، خۆی و ئاژەڵێکی وەک سەگ هاورێی بووە، وەفای پێ بووە، بنەمای پێوەندی گوند زۆرکات وەفادارییە و لە شاردا بنەمای پێوەندییەکان، واتای وەفاداریان فراوانتر کردووە، وەک بەرژوەندیی و ئایدۆلۆژی و ..هتد، واتە لە شاردا شتەکان و وشەکان واتایان زیاتر و کاریان ئاڵۆزترە.

## تێگەیشتنی مرۆڤەکان لەسەر زەوی لە ڕێگەی چییەوەیە؟

تێڕوانینی مرۆڤەکان زۆربەی کات لە ڕێگەی چاوەیەوەیە، لە ڕێگەی بینینەوە هەموو ئەو شتانەی کە دەیانبینێت دێنە نێو مێشکی مرڤەوە، لەنێو مێشکیدا ترازوو دەکرێن و بەدڵ بڕیاریان لەسەر دەدرێن و لە یادگەدا جێگیر دەبن، دواتر ناوێک بۆ ئەو شتانە دادەنێن، ئەمە بۆ ئەو شتانەی کە لە جیهانی بینراودان، لە دیوی دەرەوەدان و شوێنیان هەیە، دیوکێش هەیە، دەروونە (مەعنەویەتە) نەبینراوە، ئەو خولیایەی مرۆڤە، کە دەویت چۆن وێنەکەی لە مێشکی خۆیدا هەیە، لە دەرەوەش وێنەی بکات بە شتێک و لەنێو شوێنێکدا جێگیری بکات، بۆ ئەمەش ناوێکی بۆ دادەنێت، واتە تێگەیشتنی ئێمە بۆ شتە دەرەکیی و ناوەکییەکان لە ناوەکاندا دەبینرێنەوە، ناوەکان جیاوازی بیروبۆچوونەکانیش دەردەخەن..هتد، وەک فەیلەسوفێک دەفەرموێت (یەکێک لە ئەو سێ شتەی کە مرۆڤ گیانی (ڕۆح) خۆی پێپیشاندەدات لە کارەکانیدا ڕەنگدەداتەوە، یان کارەکانییەتی) (حەمەغەریب:٢٠٠٩:٦).

هەموو کارەکانی ناوێکی بۆ داناون، لێرەوە دەتوانرێت بگوترێت: ناوی گوند بیرخەرەوەیە بۆ بەرهەمی کاری مێشکی گوندنیشانەکانمان و شاریش بەرهەمی کاری شارنیشانەکانمانە، هەر گوندییەکانیشن دوای ئەوەی بیریان پەرەی سەندووە، شارەکانیان دروستکردووە و نیشتەجێبوون، تا گوندەکانمان زۆربن، شارەکانمان قەرەباڵەخیان کەمتر پێوەدیارە، تا شارەکان قەرەباڵەخبن، گوندەکانمان کەمتر دەبنەوە، واتە پەیوەستن بەیەکترییەوە. دەتوانرێت بگوترێت گوندەکان گیانی شارەکانن و شارەکانیش بە جۆرێک لە جۆرەکان بەڕێوبەری گوندەکانن، گوندەکان درێژکراوە و پارێزەری ئەزمون و جوانییەکانی مێژوون، تابلۆی مێژوویی و سروشتی وڵاتن، شارەکان، فرەجۆری سروشتی و گۆڕانی کەرەستە سروشتییەکان و هاوشان ڕۆشتن لەگەڵ جیهانی نوێدا بە ئەرکی خۆیان دەزانن و وەک نوێنەری سەردەمی نوێ خۆیان دەناسێنن، بە کورتی ئەم دوو شوێنە جیاوازن.

مستەفا مەلەکیان جوان دەفەرموێت ((جیاوازی سەردەمی نوێ و سەردەمی کۆن، لە ئەوەدا دەبینرێتەوە، مرۆڤی سەردەمی کۆن «پێش مۆدێرنە« زیاتر سەرقاڵی ناوەوەی خۆیان بوون، لەبری ئەوەی دەستکاری جیهانی دەرەوە بکەن، مرۆڤی سەردەمی نوێ «مۆدێرنە« کەمتر جیهانی ناوەوەی خۆیان دەگۆڕن و زیاتر دەستکار جیهانی دەرەوە دەکەن)) (حەمە غەریب: ٢٠٠٩:٥). لێرەوە شار دەتوانرێت بە چەند تایبەتمەندییەک لە دێ جیابکرێنەوە، لە شاردا ئایدۆلۆژی کار دەکات و کاریگەری لە ژینگە و بیناسازیشدا هەیە، پێوەندی لەنێو شاردا زیاتر لەسەر بنەمای بەرژوەندییە، هاوڕێیەتی زیاتر هاوڕێی کارە، توندوتۆڵی پێوەندییەکان زۆربەی کات لەسەر بنەمایی یەکبوونی ئایدۆلۆژیی و نیشتەجێبوون بنیات دەنرێت، شار فرە ئایدیایە، بنەما و نەریتە کۆمەڵاتییەکان لە شارەکاندا کشاون و وردە وردە کاڵبوونەتەوە، تەکنەلۆژیا و ژیانی تەکنەلۆژیا باڵی بەسەر زۆر بواری شاردا کێشاوە، پرسە و سەرەخۆشی و هەواڵپرسین بەرەو ئەوەدەچێت تەنیا بە ناردنی نامە و کۆمێنتێک بەڕێوەبچێت. لە شاردا وەچە خستنەوە سنوردار کراوە، تەمەنی هاوسەرگیری دواکەوتووە، ژیانی خێزانیش لە گۆڕاندایە، هەموو ئەم نەریتانە بەرهەمی گۆڕانی خێرایی تەکنەلۆژیا و بەرهەمی بیربۆچوونی ئایدۆلۆژییە کاریگەری لەسەر کەسەکان کردووە.

شوێنی نیشتەجێبوون، ئێستا وردە وردە بچووک دەبێتەوە و بیناکان بۆ تاکەکەس ئامادەکراوە، بیناکان بەرزتردەبنەوە، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تارادەیەک بەرەو لاوازی چوون، جلوبەرگەکان

زۆر خێرا گۆڕاون، لە زۆر بواری پۆشین و باوەکۆمەڵاتییەکاندا ئەوەی دوێنێ عەیبە بوو، ئەمڕۆ لەنێو شاردا وردە وردە دەبێت بە هۆشیاری تاک و عەیبەبوون بەرەو کەمبوونەوە چووە. خوێندەواری لە شاردا هەر ئەوە نییە بزانیت بخوێنێت و بنوسیت، بەڵکو ئەوەیە، بزانیت لە ئامێرە تەکنەلۆژییەکان و زمانی ژمارە شارەزابیت. شوێن لە شاردا تەنیا ئەو شوێنانە نین، کە بە گەڕەک و کۆڵان و سەر و خواری شار ناودەبرێن، بەڵکو تەکنەلۆژیا نا شوێنیشی دروستکردووە، کە لە هەرکوێ بیت، دەتوانیت لە گرووپە کۆمەڵاتییەکاندا بەشدارییەکی سارد بە نوسین و وێنە و دەنگ تۆمارکردن بکەین، ئەگەرچی ئەمانەش لە گوندەکاندا بەردەستن، بەڵام ئاوخاتن و شێوازی ئاخاوتن و بابەتی ئاخاوتنەکان لەنێو شار و دێیەکاندا تاڕادەیەک جیاوازن.

گوند/دێ، ژینگەیەکی سنوردارە، کارە قورسەکەیان شوانییە، کە چەندین جۆر ئاژەڵی جیاواز پێکەوە دەلەوەڕێنن، مەڕ، کە تایبەتمەندییەکی هێواش و لەسەرخۆ و سەرداخراوی هەیە (پێشینان دەفەرموون: ئەڵێی مەڕە)، سەری نەویدەکات هەمیشە دەخوات و دەخواتەوە، تا خاوەنەکەی شاد بکات، بزن، کە سروشتێکی بزێوی هەیە (پێشینان دەفەرموون: ئەڵی بزنە، بزن بێت نانی شوان بخوات)، سروشتی وایە، لە پێشی کاروانەوەیە، خێرایە، هەرگیایەک سمی پێدانا – نایخوات، لەبەرئەوەیە لە شوێنێکدا ئارام ناگرێت، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕوات و زۆر کات لەگەڵ خواردنیشدا شەڕە شۆخیش دەکات، بە دەنگەکەشی قەرەباڵەخی دروست دەکات و نایەڵێت شوان بە قەڵەوی بمێنێتەوە. لێرەدا شوان خاوەن ئارامییەکی گەورەیە، هەر لە بەر ئەم هۆکارەیە زۆربەی پێغەمبەران (د.خ) شوانیان کردووە و ئامادەکراون، تا لەگەڵ گیانداری بێزماندا بگونجێن، لەنێو ڕەوێکدا کە ئاژەڵی جیاواز جیاوازی تێدایە هەڵبکەن و بە جوانی سەرپەرشتیان بکەن.

لێرەوە کاریزمای شوانی خاوەن هێز دەبێتە پیشەیەک و بۆ شار دەگوازرێتەوە، بەڵام لە شاردا بە (شوان) ناونابرێن، بەڵکو لەژێر ناوی فەرمی (سەرۆکی حکومەت، سەرۆکی پەرلەمان، پارێزگار، بەڕێوبەر..هتد) ئەم پیشەیە دەکرێن، بەڵام لە ژینگەیەکی جەنجاڵ، ئەوەی لە بەردەستی ئەماندان مرۆڤن و قسە دەکەن، بیروڕای خۆیان هەیە، بۆچوونیان جیاوازە، ناڕازین، ئەرک کەمە، خەڵک زۆر داوای ماف دەکات، لێرەوە جلوبەرگ، بینا، ئۆتۆمبیل، دەسەڵات، هێز..هتد، هەیە. ئەم کەساتییانە ئاسان گوێناگرن و ئاسان ڕامناکرێن، جیاوازی ئایدۆلۆژیی و دووکەڵی کارگە، بینای بەرز و وشەی داخوازی بەرزدەبنەوە، داوای گۆڕینی هەموو شتێک لەلایەن خەڵکەوە دەکرێت، بەڵام کەمن ئەوانەی بیانەوێت خۆیان بگۆڕن، شار بە هاوسێیەتی شارەکان گەورە دەبێت، تا گەورە ببێت، ژینگەی خاوێن کەمدەبێتەوە، تا فراوانتر بێت، نەوەی نوێ بە ئاسانی تێیدا جێگەی نابێتەوە. خواست لە هەڵکشاندایە و بەرهەم لە کەمیدایە، نەخۆشییەکان زۆر دەبن و دەنگی پاڕانەوە و نزاکردن زۆر دەبێت، شادییەکان کەمێکی لە ڕۆژی هەفتە بۆخۆیان دەبەن، ئەوەش ئەو کاتەیە کە کەسەکانی شار بتوانن، شارەکان بەرەو گوندەکان بە جێبهێڵن.

## مرۆڤ، شارییە یان گوندییە؟

ناوەوەی مرۆڤ، هەمیشە کەسێکی گوندییە و لە گوندەوە نزیکە، مەگەر زۆربەی هەرە زۆری کەسایەتییە شارییەکان، خولیایی ئەوەیان نییە، لە گوندەکان ژیان ببەنەسەر، «ڤیلا» لە ئەوێ دروستبکەن، باسی ڤیلاکانیان بکەن و لەسەر سروشتی گوندەکانەوە دروستیان بکەن، بە دیوێکی تردا، هەموو کەسە شارییەکان لە گوندەکاندا ئاسانتر دەژین و شادن بە بینینی دیمەنە سروشتییەکان، چونکە گوند و گوندنشینی لە فیترەتی مرۆڤەوە نزیکترە، هەوا و بۆن و ڕەنگی سروشتی سازگارترە،

بەڵام مەرج نییە گوندنشینەکان بتوانن لە ژینگەی شارەکان هەڵبکەن، چونکە ئەرکی شار و ژیانی شار کەمێک قورسترە، پێوەندییەکان لەنێو شاردا کەمتر و کەسایەتی شار بە ناچاری ئاڵۆزترن، کاتێک تەماشا بکەین، بیرمەندەکان، زاناکان، شاعیرەکان زۆرجار لە شارەکاندا دەردەکەون. شار مرۆڤی بیانی تێدا زیاترە، گۆڕانکارییەکانی خێراترە، هەموو هەڵسوکەوتەکانی چێوەدارتر و فەرمیترە، کێبڕکێ و شانەخڕێی ڕامیاری تێیدا زیاترە، هەموو ئەمانە وادەکەن دوو ژینگەبن، پێکەوە ڕێکبخرێن کە تەواوکەری یەکتربن، وێنەیەکی بچوکی گوندەکان، لەنێو شارەکاندا دووبارە بە بیناسازی جوانترەوە (گوندی ئەڵمانی، قەیوان سیتی..هتد) دروستکراونەتەوە، کەسایەتی شار و گوند یەک پێوەر کاتیان هەیە، خۆر نیشانەی ڕۆژ و مانگ نیشانەی شەوە - لای هەردوکیان، بەڵام شار سود لە پرشنگی مانگ زیاتر وەردەگرن و کاری زیاتری تێدا دەکەن، بەرهەمی گوند دێتە نێو شارەوە، لە شارەوە بەرهەمەکان – بەرهەمی تریان لێ دروست دەکرێن، واتە شار زیاتر کاری بیرکردنەوەیە لەسەر ئەو شتانەی لە گوند بەرهەم دێن، تا زیاتر و زۆرتریان بکات و بازرگانیان پێوە بکات، گوندیش زیاتر ئەرکی پاراستنی کەرەستەی خۆماڵییەکانە، تا بزانرێت خۆماڵی و بیانی جیاوازی چییە، ئەوەتا ماستی کوردی و ماستی کارگەکان «بایۆلۆژی» تامەکەی و ڕەنگەکەی جیایە، یەکیان بەرهەمی خۆماڵی گوندە، ئەوی دی بەرهەمی دەستکاری کراوی شارە، لەنێو ئەم دوانەدا دوو جۆر خواست لای هاوڵاتیان و دوو جۆر نرخ دروستکراوە، ئەمەیە پێشکەوتن کە بتوانرێت لە یەک کاڵا دوو جۆری جیا دروست بکرێن، لەکاتێکدا ئەو جۆرە کاڵایە لە گوندا یەک نرخی هەیە، واتە شار، خواستی زیاتر و نرخی جیاواز و بابەتی جیاواز دروست دەکەن، چونکە شار لە هەموو جۆرە کەسایەتی و هەموو جۆرە مرۆڤەکانی تێدا دەژی.

## ئەنجام

١. گوند و شار، دوو شوێنی جیاوازن، بەڵام تەواوکەری یەکترین.

٢. بابەت و کاڵا سروشتییەکان، لە گوندەوە سەرچاوە دەگرێت و لە شارەکاندا پەرەیان پێدەدرێت و ساغ دەکرێنەوە. واتە دێیەکان بە بڕبڕەی پشتی ئابووری وڵات دادەنرێن.

٣. گوندەکان لانکەی زمانی سروشتی وڵاتن و لە شاردا زمانێکی پێوانەی «ستاندارد» هەڵدەبژرێت، بۆ ڕێکخستن و بەرەوپێشچوونی لایەنی ژیاری وڵات.

٤. نەریتە کۆمەڵاتییەکان لە گوندەوە دروست دەبن، لە شارەکانەوە گۆڕانکاری لە نەریتەکاندا دەکرێن.

٥. وشە ڕەسەنەکان لە گوندەکاندا دەمێننەوە، لە شارەکاندا واتایان فراوانتر دەکرێن و زۆربەی کات وشە بیانییەکانیش لە شارەکانەوە دێنە ناو زمانەوە.

## پەراوێزەکان

*. شیللەر فردریک ڤۆن (١٧٥٩-١٨٠٥) شاعیرێکی ئەڵمانییە، درامانووس و فەیلەسوف و مێژوونووسیشە، بە گەورەترین درامانووس و شانۆنووسی ئەڵمانی دادەنرێت، لە خوێندنگەی سەربازی خوێندویەتی و یاسا و پزیشک خوێندووە، لە ساڵی(١٧٨٠ دەست بەکاری پزیشکی لە «شتوتگارت» کردووە، یەکەمین شانۆنامەی (دزەکان) لە ساڵ ١٧٨١ نووسیووە، بە سەرکەوتوویی لە ساڵی ١٧٨٢ لە سەرتەختی شانۆ لە «مانهایم» پێکەشکراوە..هتد، لە بواری فەلسەفە و وەرگێرانیشدا کاری کردووە، هەندێک لە کارەکانی ولیەم شکسپیری (ماکبێس)ی، لە ئینگلیزییەوە، بۆ زمانی ئاڵمانی وەرگێراوە...هتد، بۆ زانیار زیاتر بڕوانە: سیگمۆیند فرۆید(٢٠٠٥:٩٩).

**. لەم کتێبەدا باسی دیاریدەناسی و شوێن و شوناس کراوە، هاوکات بە دوای ئەو وەڵامەدا گەڕاوە شوێن چ شوناسێک و چ یادەورییەک بە تاک دەبەخشێت، لە ڕێگەی پرسیار (من چیم» ئاستی دەروونناسی» و من کێم «ئاستی کۆمەڵایەتی» و من سەر بە کوێم « ئاستی هۆشیاری مێژوویی و کلتووری» باسی فەزا (Space) و شوێن (Place) و جێگە (Location) شاری کردووە، دواتر باسی یادەوەری هەردوو شەقامی (سالم و تووی مەلیک)ی کردووە، کە ئەو شوێنانە چی بە شوناسی تاک بەخشیووە، لە سەرەتاشەوە، باسی پێناس و ناسنامە (I.D card) ، شوناس (identity) وەک پێواژویەکی (پرۆسەیەکی) بەردەوامی چێککردنی شوناس لە میانەی ژیانی تاکەکەسیدا کردووە، یەکەمیان «پێناس و ناسنامە« دۆخێکی یاساییە و دووەمیان «شوناس» دۆخێکی مەعنەوی شوناسە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سیوەیلی (٧١، ٩٧، ١٠٦،١١٧: ٢٠٠٥).

تێبینی: ئەم نوسینە (گوتارێکی توێژینەوە ئاسایە)، دەسپێکێکە بۆ چوونە نێو ئەم بابەتەوە، هەموو شتێکی تێدا باسنەکراوە، لە داهاتوودا شایەنی ئەوەیە، کەم و زیادی تێدا بکرێت، چونکە قسەکردن لە ئەم بابەتە فراوانە و کاری مەیدانی و خوێندنەوەی زیاتر و شیکردنەوەی وردتری دەوێت.

## سەرچاوەکان

ا. کتێب

١. قورئانی پیرۆز

٢. ئەحمەدی بەهرامی (ژاکاو)، فەرموودەی پیران و پەندی ژیران، چ١، زانکۆی کوردستان - سنە، ٢٠١٤.

٣. تەحسن حەمەغەریب: شارناسی و شارسازی، ئامادەکردن: موسعەب ئەدهەم زەڵمی، چ١، چاپخانەی سیما – سلێمانی، ٢٠٠٩.

٤. سیگموند فرۆید: شارستانیەت و نیگەرانییەکانی، و. ئاوات ئەحمەد، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٥. ڕێبوار سیوەیلی: دیاریدەناسی و شوێن و شوناس، چ١، ناوەندی غەزەلنوس، ٢٠١٥.

ب. چاوپێکەوتنی تایبەت:

عەبدوڵڵا عەبدولعەزیز کەریم نێرگسەجاڕی، گۆڕانی ژیان لەنێو جیهاندا، سلێمانی، ٢٠٢٠/٧/٧.



شار لە كۆن و نوێدا
ڕیشەی زمانەوانی شار (المدینة)
محەمەد ڕەئوف محەمەد
لەدایکبووی ١٩٦١، هەڵەبجە، بەکالۆریۆس لە زانستە ئیسلامییەکان، دبلۆمی باڵا لە زانستە سیاسییەکان، خاوەنی ژمارەیەک بڵاوکراوەیە.

بەپێی توێژینەوەیەکی گۆڤاری توێژینەوەی کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی زانکۆی کوفە دەڵێت: وشەی (المدينه) لە ڕیشە و بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (دین)، ئەم وشەیە ماناکەی لە ئەسڵێکی سامییەوە هاتووە..هەروەها لەلایەن ئاشورییەکانەوە بە (الدين) هاتووە بە مانای(القانون)، بەڵام ئارامی و عیبرییەکان (الديان) بەکارهێناوە واتە (القاضی)، سەرچاوەکەی لە ئارامیدا (مدینتا یە واتە (القضاء).

کەواتە: هەموو ئەم تەفسیر و ڕاڤەکردنانە لەگەڵ قورئاندا یەکدەگرنەوە، کە هەندێک سەرچاوەی زمانەوانی عەرەبیش ئاماژەی بۆ دەکەن و ئەوە دەگەیەنێت کە هەر جێگایەک قورئان بە (المدينة) ناوی بردبێت ئەو جێگایانە بوون کە دەسەڵاتدار و دادوەر و پاشا و فەرمانڕەوا و قەزا و ئایین و کارگێڕی تێدا تێدا بووە، ئەوەش ئاماژەیە بە بەشێک لە پێناسە و پێکهاتە و سیمای شار هەر لە دێرین زەمان و سەردەمانەوە.

## شاری ئیسلامی لە مەدینەوە دەستپێدەکات:

(یثرب)دەکرێتە شار و هەنگاوی یەکەم، و یەکەم هەنگاوە بۆ گۆڕینی ڕیشەیی لە ژیان و ژیاردا، دەمارگیریی خێڵ و توندڕەویی و عەشایەریی دەگۆڕێت بە پەیوەندی هاوڵاتی و نیشتیمانی، لەوێوە دەستدەکات بە دامەزراندنی بەردی بناغەی شار و کۆمەڵگەی شار و کەلتووری نوێ و سیما و ناوەڕۆک بە ڕیشەیی دەگۆڕێت و ئەم هەنگاوە گرنگانەی خوارەوە دەستپێدەکات:

١. بە ڕێکەوتنی تەواو لەگەڵ نوێنەرانی (یثرب) کۆچ دەکرێت بۆ مەدینە و لە دوو کۆبونەوەی جیاوازدا وەک کۆنفرانس و ڕێکەوتن لەسەر بنەمای سەرەکی.

٢. یەکەم کاری پاش کۆچ دروستکردنی مزگەوت بۆ خواپەرستی و سەنتەری یەکتاپەرستی و کۆبونەوە و شورا کردن و ڕا وەرگرتن و بڕیاردان و قەزا و یەکلاکردنەوەی بڕیارەکانی جەنگ و ئاشتی و چارەسەری کێشە خێزانیی و کۆمەڵایەتییەکان و جێگای حەوانەوەی بێ نەوا و هەژارەکان.

٣. ڕاگەیاندنی پرۆسەی ئاشتی و کۆمەڵایەتی، بە ئاشتکردنەوەی هەردوو گەورە هۆزی ئەوس و خەزرەج و ڕێکەوتن لەگەڵ تیرە و تاقمە جولەکەکان.

٤. نوسین و بڕیاردان لەسەر دەستوری مدینە کە بە (الصحيفه) بەناوبانگە، بەڕاوێژ لەگەڵ هەموو پێکهاتەکان و مافی هەموو لایەک پارێزراوە و ناوی هەموو تیرە و باڵەکانی جولەکەی تێدا تۆمار کراوە، لەگەڵ هەموو مافێکی تایبەت و هاوبەش.

٥. پارێزگاری کردن لە شار و سنوری شار بەپێی دەستورەکە.

٦. ڕێکخستنی داهات و دەسکەوت.

٧. پۆلێنکردنی خەڵک و دانیشتوان بۆ پارێزگاری کردن لە مافی هەمووان و ڕێز لە پێکهاتەکانی (کۆچەر - پشتگیر – جولەکە).

٨. پۆلێنکردنی هاوڵاتیان بەپێی داهات و دەرامەت بۆئەوەی دەوڵەمەندەکان هاوکاری هەژارەکان بکەن و زەکاتیش بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجتیهاد دابەش بکرێت.

٩. دروستکردنی سوپا بۆ بەرگریکردن لە شار و دەسەڵاتی شار و سەروەری شار.

١٠. ڕێکخستنی بازاڕ و مامەڵە و بازرگانی بەپێی شەریعەت و ئەو عورفانەی پێچەوانەی شەریعەت نین.

## قۆناغەکانی گۆڕان و پێشکەوتنی شار:

لە مێژووی شارە ئیسلامییەکاندا و بەتایبەت لە ئەندەلوس، شار کۆمەڵێک تایبەتمەندی خۆی هەبووە، سەبارەت بە دروستکردن و دیزاینی ناو شار و کەرەستەکانی، هەروەها هەڵبژاردنی جێگای شار و پاڵنەر و هۆیەکانی دروستکردنی، لەوانە:

**یەکەم**: هەڵبژاردنی جوگرافیی و ژینگەیی و

کەرەستەی ژینگەیی، بۆ ئەوەش هەوڵیانداوە جێگایەک هەڵبژێرن و بە کەرەستەیەک دروستی بکەن کە دووربێت لە ئاسەوارە خراپەکانی ژینگە وەک (گەرما و سەرما، تیشکی خۆری زۆر و بەرنەکەوتنی خۆر).

- بەکارهێنانی کەرەستەی سرووشتی وەک بەرد و خۆڵ و دار و خشت و لە هەردوو جۆرەکەی.
- ماڵەکان و کۆڵانەکان بەشێوەیەک رێکخراون هەوا هاتوچۆی تێدا بکات.
- ناو خانووەکان زۆر بە وردی حیسابی ئاڵوگۆری هەوای تێدا کراوە، لەگەڵ بەرکەوتنی خۆر بەپێی پێویست و دیواری بەردین بۆ پاراستنی تەواوی لە سارد و گەرم.

**دووەم:** هەڵبژاردنی سەربازی: شار وا دیزاین دەکرا کە پارێزراو بێت لەڕووی سەربازییەوە بە ئاسانی داگیر نەکرێت، لەهەمانکاتدا هەڵبژاردنی جێگای شار لە جێگایەکدا بووە کە سوودی سەربازی هەبێت بۆ وڵات و دەوڵەت.

**سێیەم:** هەڵبژاردنی ئابووری : شار لە دوو ڕووی ئابووریی و بازرگانییەوە بەهەندگیراوە، یەکەمیان لە جێگایەکدا دروستکراوە کە زۆرترین خەڵکی ئەو سەردەمە و جوڵەی کاروانی بازرگانەکان و ڕێڕەوی دەوڵەتانی بەسەرەوە بووبێت، بۆئەوەی زوو گەشە بکات، لەهەمانکاتدا دیزاینی ناوشار بە شێوەیەک بووە کە عورفی ئەو سەردەمە لەسەری ڕێکەوتوون و ئێستاش ئاسەواری ماوە، هاتوون لە سەنتەری شاردا مزگەوتی گەورەی شاریان دروست کردووە، لە نزیک یا لە بەرامبەری بازاڕ و قەیسەریی و خانیان دروستکردوە و لە نزیک هەردووکیان حەمامیان دروستکردووە، گەڕەکی دەسەڵاتدار و حوکمڕانیش لە نزیک هەموویانەوەیە، ئەم شێوازە یان بەشێوەی بازنەیی دروستکراوە یان بە چوار گۆشەیی یان بە لاکێشەیی لەو ئەندازە دەرنەچووە، بەتایبەت ئەگەر شارەکە شورای هەبووبێت و لە چەند لایەکەوە دەرگای فەرمی هەبووە و لەکاتی نائاسایدا داخراون بەتایبەت شەوان.

**چوارەم:** هەڵبژاردنی سیاسیی و کارگێری: هەندێک شار لە سەرەتای دروستبوونییەوە بەپێی خواستی دەسەڵات و حوکمڕان بووە، پاش ڕاوێژکردن بە خەڵکی پسپۆڕ لە هەموو بەشەکانی سەرەوە، دواتر ئەگەر ئەو دەسەڵات و دەسەڵاتدارە لەو شارەدا بەردەوام بووبێت ئەوا شارەکە زوو گەشەی کردووە و پێشکەوتووە، چونکە بووە بە سەنتەری دەسەڵات و ئابووریی و بڕیارە چارەنووسسازەکان و زۆرترین سەرمایە و سەرمایەدار و مامەڵەچی و خوێندەوار و سەرکردەی تێدا کۆبووەتەوە، هەرکاتێکیش چۆڵکرابێت لە دەسەڵات وردە وردە بچووکبووەتەوە و پووکاوەتەوە.

سەبارەت بە دیزاین و ڕێکخستنی شار و ژیانی پێکهاتەکانی شار و مافی ئایینەکان لە ژیان و مردن و قەبرسانەکان، هەروەها مزگەوت و بازاڕ بە تەواوکار و خزمەتگوزاری هەموو پێکەوە. گوستاف لوبون دەڵێت: (لە دیاردە و سیماکانی شار لە ژیاری ئیسلامیدا دین و ژین و بازاڕ وا تێکەڵ بوون لە یەک جودا نەکراونەتەوە). (الاسلام والحضاره العربية، ت.محمد محمد حسين، ج١٠، ١٩٨٢، ل١٣)

## شار لەسەدەی بیست و دوای شۆڕشی پیشەسازی:

ئەگەر بە وردی سەیری (سەرمایە)ی کارل مارکس بکەین چیرۆکی مەرگەسات و خۆشی و ناخۆشییەکانی بە جێهێشتنی گوند و کۆچ بەرەو شار بەڕوونی دەبینیت و سەرەتای بە تراژیدیا دەستپێدەکات و لە دوا قۆناغدا بە بووژانەوە و گەشەسەندن کۆتایی دێت، بەڵام دەبێت بپرسین بۆچی ئەوە ڕوویدا؟ دوو هۆکاری سەرەکی هەبوو:

هۆکاری یەکەم/ زۆربوونی خەڵک و خواستی زۆر بۆ بەکاربردن و پێداویستی کەرەستەی زیاتر بۆ ژیان وایکرد کە زانا و داهێنەرەکان

ڕێیان بکەوێت لە داهێنانی ئامێر و پاشان کارگە و دواتریش کارخانەی زەبەلاح، سەرەتا بە سەدان و پاشان بە هەزارەها هەلی کاری دروستکرد.

هۆکاری دووەم/ گەڕان بەدوای ژیانێکی خۆشتر و ئاسودەتر لە ژیانی گوند و کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و مەرگەساتەکانی سەرما و گەرمای بەردەوام. ئەم بابەتە زۆر بە گەرمی لە کتێبی (پوختەی سەرمایەی مارکس)دا هەیە. (کارلۆ کافیرۆ: پوختەی سەرمایەی مارکس، و.بابان ئەنوەر، چ٢، دەزگای ئایدیا، ٢٠١٩)

لە وردەکاری ئەم کتێبە و چیرۆکەکانییەوە تێدەگەین کە پیشەسازی هۆکاری سەرەکی و بنەڕەتی دروستبوونی شار بووە لە سەدەی بیستەمدا و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە کشتوکاڵییەوە گۆڕی بەرەو پیشەسازی، لە گوندنشینی زۆرینەوە بەرەو شارنشینی زۆرینە لەپێناو ژیانێکی خۆشتر و ئاسودەتر و کراوەتر پێشکەوتووتر.

لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەوە شارە گەورەکان بەرەو خنکان و تەواو ئاڵۆزبوون ڕۆیشتوون و کێشە و قەیرانی جۆراوجۆریان تێدا دروستبووە، بەتایبەتی پایتەخت و شارە پیشەسازییە گەورەکان. کێشە و قەیرانی ژینگەیی و دووکەڵ و گازی جۆراوجۆر و قەیرانی نیشتەجێبوون و قەیرانی خزمەتگوزاری گشتی و لۆجستی و گواستنەوە و ئاوی پاک و خواردنەوە.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکیشدا هەڵگشانی قەیرانە ئیقلیمییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا و شەڕە ناوخۆییەکانی ناوچەکە و دەستێوەردانی ڕۆژئاوا لە تەواوی ناوچەکە و دروستکردنی جۆرەها قەیران دوو قەیرانی دیکەی بەرهەمهێنا، یەکەمیان کۆچی بە کۆمەڵی خەڵکی ناوچەکانی شەڕ بۆ ئەورووپا و ئەمریکا و لەو وڵاتانەدا کۆچبەرانی بەردەوام کۆمەڵێک قەیرانیان بەرهەمهێناوە. دووەمیان، چۆڵبونی وڵاتەکانی خۆیان لە هێزی کار و بەرهەم.

## چارەسەری قەیرانە نوێیەکانی شار لە بیست و یەکدا:

بانکی دەولی چەند ساڵێکە توێژینەوە دەکات بۆ دۆزینەوەی چارەسەر لە چوارچێوەی (گەشەی بەردەوامدا) (التنمية المستدامة) بۆ بوژانەوە و دروستکردنی شار و ناوچەی گەشەسەندوو کە بتوانێت بەردەوام خۆی نوێکاتەوە، تازەترین بابەت کە لە سایتی فەرمی بانکی دەولی بڵاوکراوەتەوە و لە ٢٠١٨/١/٣١ نوسراوە، لەسەر ئەم بابەتە ئاماژە بە کۆمەڵێک بوار و لایەنی گرنگ دەکات لەسەر شار و قەیرانی شار و خواستی خەڵک و ئایندەی شار تا ساڵی ٢٠٥٠، ئەمەی خوارەوە پوختەی سێ بیرۆکەی سەرەکییە بۆ بەدیهێنانی شار و کۆمولگەی ناوخۆیی گەشەی بەردەوام:

لە سەرەتاوە لە ڕاپۆرتێکی مەیدانیدا و لە کۆمەڵێک کەسی جیاواز پرسیار دەکات و دەڵێت: دوو شار لەسەر گۆی زەوی لەیەک ناچن، ئایا شارەکەی تۆ بۆ تۆ چی دەگەیەنێت؟

(ڕازی) کە پیشەی خزمەتگوزارە لە قاوەخانەیەکدا و لە کوالالامپور دەژی و وەک ملیۆنەها گەنجی مالیزی کە خاوەنی خەونی ئایندەن دەڵێت: شارەکان ئەو جێگەیەن کە خەونی گەنجەکان دەهێننە دی لە پاڵ چینی مامناوەندی کۆمەڵگادا (مەبەست لە چینی مامناوەند ئەو چینە کاسبکارەیە کە لە نێوان دەوڵەمەند و هەژارەکاندان و بازاڕ دەجوڵێنن و هەلی کار دروست دەکەن، گەشەی ئابووری کۆمەڵایەتی بەستراوە بەڕادەی مانەوەی ئەو چینە لەنێو هەر وڵاتێکدا).

(لیاو شیان می) کە تەمەنی ٤٥ ساڵە و کۆچەرە لە (شنجن)ی چینی دەژی و فاتمە و پیتەریش کە ژن و مێردن لە تەنزانیا دەژین و لەو گوندەوە ژیانیان گواستۆتەوە بۆ دارالسلام، هەرسێکیان دەڵێن شارەکان دەتوانن ژیانێکی باشتر و خۆشتریان بۆ بنیاد بکەن کە بۆ ئایندەیان باشترە.

هەروەها ڕاپۆراتەکە دەڵێت: (٥٦,٦٠٠٠٠٠)

پەنجاو شەش ملیۆن و شەسەد هەزار کەسی دەرکراو لە ماڵ و حاڵی خۆیان و لە جێگا و گوند و شارۆچکەی خۆیان پێیانوایە کە سەقامگیر بوون لە شارێکدا فرسەتێکی باشە بۆ گێڕانەوەی کەرامەت و وزەی ژیانیان..

هەروەها دەڵێت: ئەمرۆ زیاتر لە چوار ملیار مرۆڤ لە شارەکانی دونیادا دەژین کە زیاترە لە ٥٠٪ی تەواوی دانیشتوانی گۆی زەوی، تەنها لە رۆژهەڵاتی ئاسیا و زەریای ئارام نزیکەی١,٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیارێک و دوسەد ملیۆن کەس لە شارەکاندا دەژین. بەپێی داتا و لێکۆڵینەوەکانی بانکی دەولی تا ساڵی ٢٠٥٠ ژمارەی دانیشتوانی شار دەبنە دوو هێندەی دانیشتوانی گوندنشینەکان.

لە راپۆرتەکەی بانکی دەولیدا بە درێژی باس لە ئاڵنگاریی و سەرکەشییەکان دەکات و ئاماژە بە پەرەسەندنی بێ سنووری شارەکان دەکات لەسەر حیسابی گوند و هەژاری شارەکان.

لە چاوپێکەوتنەکانیدا (ئێد ایجاس ڤاسکێز)ی بەڕێوەبەری چالاکییە جیهانییەکان بۆ گەشەی کۆمەڵایەتی شار و گوند، توانای خۆڕاگرتن لە بانکی دەولی پرسیاری چارەسەری لێ دەکەن دەڵێت: لە بانکی دەولی ئێش دەکەین لەگەڵ کەرتی تایبەت و حکومەت و کۆمەڵگای مەدەنی و هەموو شەریکەکانمان بۆ دروستکردنی شار و کۆمەڵگای گشتگیر کە بۆ هەمووان ساز و گونجاو بێت و خۆڕاگربێت بەرانبەر ئاڵنگارییەکان و خۆی نوێ بکاتەوە لە هەموو جیهاندا و هاوکار بێت بۆ خولقاندنی ئابوورییەکی کێبرکێی کە زۆرترین هەلی کار برەخسێنێت بەتایبەت بۆ هەژارەکانی شار.

بەپێی پلانی بانکی دەولی دەبێت تا ساڵی ٢٠٣٠ دیزاینی ئابووری شارەکان بەشێوەیەک بگۆڕێت کە لە قازانجی ئابووری کۆمپانیا مام ناوەند و بچوک و هەژارەکان بێت.

لەم راپۆرتەدا (سامح وهبە) بەڕێوەبەری گەشەی شار و گوند و ئیدارەی کۆسپ و نەهامەتییەکان لە بانکی دەولی دەڵێت: بانکی دەولی لەبەرئەوەی پارەدەر و یارمەتیدەری سەرەکی گەشەسەندنە لە جیهاندا ساڵانە لانی کەم ٦,٠٠٠,٠٠٠ شەش ملیار دۆلار خەرج دەکات بۆ گەشەی شارەکان و خۆڕاگریان و ئامادەیە کە هەر شارێک پلانی گەشەی هەبێت و پلانی ئابووری گەشەسەندووی هەبێت یارمەتی بدات.

راپۆرتەکە دەڵێت: لەم بوارەدا پێویستە چی بۆ ئاینده بکرێت؟ لەوەڵامدا دەڵێت : سێ بیرۆکەی سەرەکی هەیە، چارەسەرەکانیش ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن.

بانکی دەولی لە کۆڕبەندی شارنشینی جیهانی خۆیدا سێ بیرۆکە دەخاتە ڕوو کە پێویستن بۆ سەرکەوتنی ئەجێندای نوێ سەبارەت بە شارەکان:

١. پشتگیریی و هاوکاری دارایی بۆ ئەجێندای نوێ سەبارەت بە شارەکان.

٢. بەهێزکردنی گەشەی ناوچەیی.

٣. بەهێزکردن و پشتگیری کردنی خۆڕاگری شارەکان بەرانبەر گۆڕانی کەشوهەوا و ژینگە و کارەساتەکان.

هەروەها راپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە ژێرخانی گەشەی شارەکان لە جیهاندا لە ئێستادا پێویستی بە (٤,٥ تا٥,٥ ) ترلیۆن دۆلار هەیە تەنها بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی ژێرخان و بانکی دەولی، ئەوە لەحاڵێکدا تەنها لە ٣٪ ئەو بودجەیەی لەبەردەستایە.

به پێی راپۆرتەکە ژیان و گوزەرانی شارەکان بەرەو خراپی دەڕوات بەهۆی:

یەکەم: چۆڵبونی بەردەوامی گوندەکان.

دووەم: زیادبوونی هەژاری شارەکان.

سێیەم: هەڕەشەی گۆڕانی کەشوهەوا و ئەگەری کارەساتی سرووشتی.

چوارەم: تێکچوونی سیستمی ئابووری

گەشەسەندوو کە زۆرترین هەلیکار دروست دەکات ئەوەش لەوێوە دروستبووە، کە کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەسەڵاتی وەبەرهێنانیان گرتۆتە دەست و چینی مام ناوەند کۆمپانیا و پیشە و بازاڕەکانیان نەماوە و لە ٩٠٪ مرۆڤایەتی کار بۆ ١٠٪ مرۆڤ دەکات، ئەگەر ئەوەش بەردەوام بێت هەموو جۆرە کارەساتێک ڕوودەدات.

## کۆنترین (١١) شاری دونیا:

١. ئەریحا لە فەلەستین، ١١ هەزار ساڵ، زانایانی شوێنەوارناسی شوێنەواری ٢٠ مستعمرەی یەک لە دوای یەکیان دۆزیوەتەوە.

٢. جبیل لە لوبنان، پێش حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر فینیقییەکان دروستیان کردووە، یۆنانیەکان لەم شارەوە کاغەزیان هاوردە کردووە.

٣. دیمەشق، ٦٣٠٠ لەمەوبەر، گرنگی ئەم شارە لەوکاتەوە دەستپێدەکات کە ئارامییەکان دەستیان بەسەردا گرتووە و تۆڕی ئاویان تێدا دامەزراندووە و تا ئێستاش شوێنەواری ماوە.

٤. حەلەب لە سوریا، پێش ٦٣٠٠ ساڵە دامەزراوە، ئەم شارە حیثییەکان دروستیان کردووە.

٥. سوسە لە ئێران، ئەم شارە ٦٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە، پایەختی ئیلامییەکان بووە پێش ئەوەی ئاشوورییەکان داگیری بکەن و دواتر ئەخمینییەکانی فارس داگیریان کردووە، ئێستا ناوی ( شوش)ە.

٦. ئەلفەیوم لە مصر،٦٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر لەلایەن فیرعەونەکانەوە دروستکراوە، ئێستا هەندێک بازاڕی شەعبی تێدایە و نزیکە لە هەردوو هەرەمی (لەحن و حەوارە)وە.

٧. صەیدا لە لوبنان، ٦٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر لەلایەن فینیقییەکانەوە دروستکراوە، ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ساڵی ٣٣٣ پ.ز داگیری کردووە.

٨. بلو فدیف لە بولگاریا،٦٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە، ئەم شارە (تراسیۆن)ەکان دروستیان کردووە و دواتر بووە بە شارێکی ڕۆمانەکان، دواتر کەوتووەتە ژێر قەڵەمڕەوی بیزەنتینییەکان دوای ئەوانیش عوسمانییەکان و دواتریش گەڕاوەتەوە سەر بولگاریا.

٩. غازی عەنتاب لە تورکیا،٥٦٥٠ ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە، نزیکە لە سنوری سوریاوە، لە سەردەمی حیثییەکاندا دروستکراوە و شوێنەواری بیزەنتینە و ڕۆمەکانی تێدایە.

١٠. بەیروت لە لوبنان، ٥٠٠٠ ساڵ لەمەبەر دروستکراوە، شوێنەواری هەریەکە لە فینیقییەکان و هلنسیەکان و ڕۆمان و عەرەب و عوسمانییەکان لەم شارەدا هەیە.

١١. هەولێر لە کوردستان، ٧٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە، بەپێی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆمەرییەکان یان ئاشوورییەکان، (ئەربائیلۆ) واتە چوار خواوەند.

## سەرچاوەکان


١. مجلة أبحاث، كلية التربية الأساسية.

٢. مجلد ١١– العدد(١)، د.فؤاز عائد جاسم ٢٠١١/٤/٢٤ www.iasj.net

٣. مدونة العمران – البعدالتأريخي نشأة المدن عبر التأريخ Digiarbs.blogspot.com

٤. ثلاثة أفكار وتنمية لتحقق مدن و صحشمات بشرية حملية مستدامة. al bank al dawali.org

٥. topsarabia.com

٦. maref.org



# تایبەتمەندییەکانی فیکری
# حاجی قادری کۆیی




**عومەر ئیسماعیل ڕەحیم**
لەدایکبووی ١٩٦٧، کۆیە.
ماستەر لە فیکری ئیسلامی
شارەزا و توێژەر لە هزری سیاسی ئیسلامی.

## پێشەکی:

حاجی قادری کۆیی لە جیهانی شیعر و ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی ناوێکی دیارە، ئەگەرچی ئەو بەرهەمە شیعرییانەی بە دەست ئێمە گەیشتووە؛ لە ڕووی چەندییەتیەوە کەمە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆک و ئەو پەیام و هزرەی هەڵیگرتووە، گرنگ و جێگەی بایەخە. ئەو بەتەنها شاعیر نەبووە، یان تەنها شیعری بۆ چێژ و چەشە وەرگرتن و چێژبەخشین لە جوانی زمان و ڕەوانبێژی و وێنە هونەرییەکان بە خوێنەرانی نەهۆنیوەتەوە، بەڵکوو شیعر لای حاجی؛ چەکی دەستی شۆڕشگێڕ و ئامرازی هۆشیارکردنەوە و خولقاندن و گەیاندنی هزر و فیکری نوێ بووە، هەڵگری پەیامی چاکسازی و مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەستبڕ و گەندەڵ و ستەمکارەکان بووە. بەدڵنیاییەوە دەتوانین حاجی قادر بکەین بە نوێنەری قۆناغێکی دیاری پێشکەوتنی هزر و فەرهەنگی کوردی.

ئەگەرچی تائێستا چەندین توێژینەوە کراوە سەبارەت بە حاجی و بەرهەمە شیعرییەکانی، بەڵام هێشتا بەشێکی زۆری ژیان و گوزەرانی بە نادریاری ماوەتەوە و پەردەی لەسەر لا نەدراوە، کە واش نازانم تازە -بە هۆی تێپەڕینی کاتی زۆر بەسەر کۆچی دوایی- ئیدی بتوانرێت ئەو لاپەڕە نادیارانەی ژیانی ڕوون ببێتەوە.

سەبارەت بە هزر و جیهانبینییەکەشی، ئەوە زۆر نووسراوە و وتراوە، هەر یەک بەپێی ئاڕاستەی فیکری خۆی شەرح و ڕاڤەی هۆنراوەکانی کردووە. یەکێک هەوڵیداوە حاجی بکات بە دۆستی پرۆلیتاریا و بیخزێنێتە ناو ئیدیۆلۆژیای چەپەوە، یەکێکی تر بەپێچەوانە، هەندێکی تر کردوویانە بە هەڵگر و تیۆرستی هزر و ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی، هەشیانە کردوویەتی بە گوێزەرەوەی مۆدێرنەی خۆرئاوا و بابایەکی دوور لە دین.

ئەو نووسینەی بەردەستی خوێنەری ئازیز کە باس لە تایبەتمەندییەکانی هزری حاجی قادری کۆیی دەکات، بەشێکە لە توێژینەوەیەکی درێژتر لە بارەی هزری ئەو پیاوە گەورە و بیرمەندەی گەلەکەمان، پشت بە خودا بتوانین لەو نزیکانە چاو و دڵی خوێنەرانی پێ ڕۆشن بکەینەوە و تێیدا ڕاستی و دروستیی هزر و دونیابینیی حاجی بخەینە ڕوو و هەندێ لەو هەڵە و ناحەقییانەی بەرامبەر حاجی کراوە، ڕاست بکەینەوە. ئەو خاڵانەی من لێرەدا باسیان دەکەم وەک تایبەتمەندیی هزری حاجی، هەڵبەت بۆچوونی منە و دەکرێت ڕای جیاواز هەبێت یان خاڵی تر زیاد بکرێت، من بەلای خۆمەوە گرنگترینم هەڵبژاردووە.

## تایبەتمەندییەکانی فیکری حاجی قادری کۆیی:

### یەکەم: ڕەسەنایەتی

ڕەسەن یا ڕەسەنایەتی(١) کە لە زمانی عەرەبی «الأصيل» یا «الأصالة»ی بۆ بەکاردێت، بەواتای: توانای دەربڕین و گوزارشت لە کەسایەتی و بۆچوونەکانی خۆت بکەیت، داهێنانی تێدا بێت و لاساییکردنەوە و دزیی تێدا نەبێت، لەو بۆچوونانەت کێشە و گرفتە خۆماڵییەکان بخەیتە ڕوو، چارەسەری خۆماڵییشیان بۆ بدۆزیتەوە، وێنایەکی جوان و دروستی کۆمەڵگەکەی خۆتت کردبێت.

ئێمە کە لێرەدا باس لە ڕەسەنایەتیی فیکری حاجی دەکەین، مەبەستمان ئەمەی خوارەوەیە:

یەک: حاجی قادر شیعرەکانی چ لە ڕووی ناوەڕۆک، چ لە ڕووی فۆرم و شێوە، داهێنانی خۆیەتی، زۆر کەم لاساییکردنەوەی تێدایە. مارف خەزنەدار لەبارەی شیعری «ئەی بێ نەزیر و هەمتا»وە دەڵێت: «ئەم موناجاتەی حاجی لە شیعری ئایینیی شاعیرانی پێش خۆی ناکات، ئەوان بەزۆری وێنە و ڕستەی داهێنراوی شاعیرانی

پێش خۆیان دەخزێننە ناو شیعرەکانیانەوە. بەشی زۆریان کاریگەریی ‹نالی›یان بەسەرەوەیە، کەمیان شیعری داهێنراو و ڕەسەنیان نووسیوە، یەکێکی وەکوو حاجی نەبێ (٢)».

دوو: هەڵقوڵانی ئەو فیکرەیە لە ژینگە و واقیعی خۆماڵی و کوردەواری، داهێنان و چەمکەکان، پێوەر و پرەنسیپەکان لەو مەرجەعیەتەی خۆت باوەڕت پێیەتی؛ وەرگیرابن. تەنانەت حاجی قادر لە هەڵبژاردن و بەکارهێنانی واژە و ئیدیۆمەکانیش ڕەچاوی ئەو خاڵەی کردووە، هەوڵیداوە ئەو واژە و ئیدیۆمانە بەکاربهێنێت کە لە ناوچەکەی خۆی بەکارهاتوون، وەک نموونە: «کەرمیز» و «بەنی موو» و «گای بنە» و چەندینی تریش.

سێ: بەرهەمەکانی ئەو فیکرە، دەرەنجامی بیرکردنەوە و گفتوگۆی ناوەکی و خودی شاعیر یا بیرمەند خۆی بێت، سەبارەت بە گرفت و کێشەکانی کۆمەڵگەکەی خۆی. کە حاجی بەم شێوە بووە، هەموو شیعر و قەسیدەکانی لێکبدەوە، باس لە دۆخ و گرفت و کێشەکانی کوردەواری بووە، هەر لەو مەرجەعیەتەی باوەڕی پێی هەبووە، بەدوای چارەسەری خۆماڵی و چاکسازیدا گەڕاوە.

چوار: بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە خۆماڵییانە بێت کە لە ناخی کۆمەڵگەکەی خودی شاعیر یان ئەدیبەوە دەکرێن و بۆ گەیشتن بێت بە چارەسەری ئەو کێشە و ناتەواوییانەی لە ژینگەی کۆمەڵگەکەی خۆیەوە هەن.

پێنج: گوزارشت بێت لە کولتوور و نەریتی کۆمەڵگەکەی. کاتێک بێگانەیەک دەیخوێنێتەوە، هەست بکات بەرهەمی فیکریی و ئەدەبی کەسێکی جیاواز و خاوەن شوناس و کولتوور و نەریتێکی سەربەخۆ دەخوێنێتەوە، نەوەک کۆپیکراوی گەلانی تر، بەکورتی: زادەی ئەزموونی خودی خۆی بێت. دەکرێت مرۆڤ سوودوەربگرێت لە ئەزموونی خەڵکی تر، بەڵام هەرگیز دروست نییە دەرەنجامی ئەزموونی کەسانی تر بگوێزینەوە هەرچەندەش لە خۆمان نزیک بن، چونکە لەو کاتەدا ئامانجەکان وەدەست نایەن. هەر کەسێک قەسیدەی «گوتم بە بەختی خەواڵوو»ی(٣) حاجی بخوێنێتەوە، لەو تابلۆ و وێنانەی دەینەخشێنێت، ئەو دەستەواژە و وشانەی بەکاریان دەهێنێت، ئەو پرس و بابەتانەی دەیانورووژێنیت، ئەو ژینگە و جۆرە ژیانەی وێنای دەکات و دەیگوازێتەوە بۆ خوێنەر، لە هەموو ئەمانە دەگاتە ئەوەی کە کوردێک ئەو قەسیدەیەی نووسیوە. هەروەک نموونە ئەو بخوێنیتەوە، کە دەڵێت:

**چیایە شێخ و کەوای سەوزە، مێزەری بەفرە**
**سیواکە چووزەرە ڕێواسە، تەیلەسانی گەڵا(٤)**

کە چ وێنەیەکی جوانی شێخێکی کوردەواریی کێشاوە، لە ڕێگەی چوواندنی بە چیایەکی کوێستانی ئەم کوردستانە. شێخێکی بە هەیبەت و شکۆ، کەواکەی چواندووە بە سەوزایی گژوگیای قەدپاڵی چیایەکە، مێزەرەکەی بە بەفرە سپییەکەی سەر لوتکەی چیاکە و سیواکەکەی چواندووە بە چووزەرە ڕێواسێک کە تازە سەری دەرهێناوە، دواجار لە گەڵای درەختەکانیش عەبایەکی داوە بەسەر کەوا و جلە سەوزەکانیدا. چ وێنەیەکی هونەریی ورد و قەشەنگی شێخێکی خواناسی ئەم کوردستانەی کێشاوە، کە دەکرێت چەندین لێکدانەوە و ڕاڤەی جوانی بۆ بکرێت! لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکە، وازی لێ دەهێنین بۆ دەرفەتێکی تر.

حاجی داهێنانکاریی زۆری کردووە، بابەتی شیعرەکانی زۆربەی داهێنانە. پێش ئەو، لەو مەیدانە شیعر نەنووسراوە، وەک شاکر فەتاح دەڵێت: «بێجگە لەوە حاجی لە بابەت شێخ و مەلا و دەوڵەمەند و لاوەکانیشەوە بابەتی تازە و ناوازەی نووسیوە، کە کەس لە پێش ئەوەوە بەو جۆرە و بەوشێوەی نەگوتووە(٥)»

### دووەم: بوونی مەرجەعیەتێکی چەسپاو و نەگۆڕ

ئەو هزروان و بیرمەندەی کە مەرجەعیەتێکی دیاریکراوی هەیە و لێیەوە سەیری جیهان و دەوروبەری خۆی دەکات، ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی پێ هەڵدەسەنگێنێت، بەپێی پرەنسیپ و ڕێنماییەکانی ئەو مەرجەعە هەنگاو هەڵدەگرێت، بێگومان لە زۆر ڕووەوە جیاوازە لەو هزروان و نووسەرەی کە بێ مەرجەعیەتە، یان لە چەند مەرجەعیەت، یان چەند بیروباوەڕێکی جیاوازەوە لە دیاردە و ڕووداوەکان دەڕوانێت. ئەو کەسەی یەک مەرجەعیەتی هەیە، دەبێتە خاوەن دیدگایەکی دیار و ڕۆشن، زوو زوو و لەگەڵ هەر گۆڕانکارییەک بۆچوونەکانی ناگۆڕێت، لە هەر نووسین و توێژینەوەیەک، یان هەر شیعرێکدا بۆچوونێک ناخاتە ڕوو، بۆچوونەکانی ڕاشکاو و ڕوونن، دەزانێت باسی چی دەکات و چی دەڵێت، هەڵگری پەیامێکە و بڕوای پێیەتی و دەشزانێت چۆن بیگەیەنێتە خوێنەر و گوێگرەکانی، چاکتریش دەتوانێت پەنجە بخاتە سەر گرفت و کێشەکان، کەموکورییەکان دیاری بکات، ئاسانتر دەتوانێت چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە، کاتێ ڕەخنە لە بیرۆکەیەک یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یان ئایینی یان هەر شتێک دەگرێت، دەزانێت ڕەخنە لە چی و لە کوێ و بۆچی و چۆن و لەسەر چی بنەمایەک بگرێت، پێوەرەکانی و جێگرەوەی ڕەخنەلێگیراو چییە!

ئەگەر دیوانی حاجی قادر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بخوێنینەوە، لە دیدێکی ئیسلامیی ڕوون و ڕاشکاوەوە سەرنجی دیاردە و ڕووداوەکانی داوە و خوێندنەوەی بۆ کردوون و هەڵیسەنگاندوون، هەر لەسەر ئەو تێڕوانینەش مامەڵەی لەگەڵ کردوون، لە هەر کوێ نەیاریی و دژیەکیی لەگەڵ ئایینی ئیسلام و پرنسیپ و شەریعەت و بەها باڵاکانی بەدیی کردبێت، ئەوا ڕەخنەی لێگرتووە.

وەک وتمان ئەم مەرجەعیەتبوونەی لە هەموو دیوانەکەی ڕەنگیداوەتەوە، بەڵام بۆ دڵنیایی چەند نموونەیە دەهێنینەوە:

سەبارەت بە خوێندن و خوێندەواریی و وەرگرتنی ئەزموونی ئەوانی دیکە، دەڵێت:

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین:
**اطْلُبُوا الْعِلْمَكم وَ لَوْ بِالصِّين**
**نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نییە**
**گەر مەلا نەهیی فەرموو دینی نییە**
**تۆ وەرە فەننێ فێر بە چیتە لەوە**
**گاورە، هیندووە، وە یاخۆ جووە**
**لازمە خول بخۆی وەکوو بەرداش**
**هەموو قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش**
**تەنبەڵی کاری حیز و بێخێرە**
**دەستی ماندی لەسەر زگی تێرە**
**ئەهلی جەننەت نە شوان و گاوانە**
**ساحیبی فەنن و عیلم و عیرفانە(٦)**

سەبارەت بە هەندێ تێگەیشتنی هەڵە لە ئایین و ڕەخنەلێگرتنی، دەڵێت:

**تا سالیکی مەسالیکی موڵکی قەناعەتی**
**باکت نەبێ لە ڕێگر و ئەهلی شەقاوەتی**
**سۆفی عیبادەتی هەموو بۆ مەکر و ڕیوەیە**
**گەر شێری نەڕ بە گوێ بگرێ، پەشمە تاعەتی**
**ئیخلاسە ئەسڵی مەقسەد و خۆڕا شەقی دەبێ**
**وا تێدەگا بە سەرمەقولاتە سەعادەتی**
**بێ مەعریفەت مەبە لە تەریقی حەقیقەتا**
**سەرمەنزیلی شەریعەتە جێگەی سەلامەتی(٧)**

سەبارەت بە وێناکردنی ستەمی دەسەڵاتدارانی عوسمانی، دەڵێت:

**قسەییێکم هەیە دەیکەم مەڵێ بێ تەجرەبەیە**
**با وجوودی، ئەوی نادانە لەلای وەک گەمەیە**
**موقتەزای ئاب و هەوای خاکی دیاری ڕۆمە**
**ئەهلی سووتاوی مەیە، بەستەیی ئاوازی نەیە**

**حاکمی ڕێگری مەعموورەیە، قازیی دزی ڕۆژ**
**وزەرا و وکەلای گورگە، ڕەعیەت گەلەیە**
**سالیکی ڕیخە ئەگەر شێخە ئەگەر مێخە، لەوێ**
**شێخە هەر کامێ نەدا تا دەمرێ هەر دەدەیە**
**زانی و شاریب و لوّتی دەگرن، والی دەڵێ:**
**بەری دەن پارەی خۆی دایە، چ عەیبێکی هەیە**
**هێندە بێگانە لە ئیسلامن و ئەحبابی فەرەنگ**
**موتتەقی دێوە لەلایان، موتەشەڕیع شەوەیە**
**زوڵمیان عامە لەسەر عاممە، ڕەعیەت فەوتا**
**تۆ مەکە مەنعی عەوامیل، کە خەتای گای بنەیە**(٨)

### سێیەم، بێباکی و متمانەبەخۆبوون

ئاشکرایە کەسایەتیی مرۆڤ چۆن بێت، هەر ئەوە لە شیعر و ئەو دەقە ئەدەبی و فیکرییانەی بەرهەمیان دەهێنێت؛ ڕەنگدەداتەوە. یان بە دەربڕینێکی دیکە: بەرهەمە شیعریی و ئەدەبییەکان، ئاوێنەی ڕەنگدانەوەی کەسایەتیی خاوەنەکەیەتی. کەسی دەروون لاواز، ناتوانێت دەقێک بەرهەم بێنێت پاڵەوانەکەی دەروونێکی بەهێزی هەبێت، ئەگەر هەوڵێکی لەو جۆرەش بدات؛ پێوەی دەردەکەوێت و دەقێکی لاواز دەردەچێت. حاجی قادریش کەسێکی سەرکەش و متمانەی بە خۆ بووە، زۆر بڕوای بە تواناکانی خۆی هەبووە، لە ئەدای خۆی ڕازی بووە، هەرگیز ئامادە نەبووە خۆی بە کزی و زەلیلی ببینێت و پیشان بدات، ئامادە بووە شەو بێ شێو سەر بنێتەوە، بەپێخواسی ڕێ بکات و دەست لە کەس پان نەکاتەوە. حاجی هەر لە منداڵییەوە هەڵگری ئەو تایبەتمەندییەی بووە، بەمنداڵی چۆتە لای پینەدۆز و شاگردیی کردووە، تا خۆی بژێویی خۆی دابین بکات. ئەو بێباکی و متمانەبەخۆبوونەی حاجی لە مێژووی پڕ لە زەحمەتی هۆز و بنەماڵەکەیی و ژینگەی سەردەمی منالیی لە گۆڕقەرەج و کاروانی پڕ لە گەشتەکانی خوێندنی، زوو مردنی دایک و باوکی، هەموو ئەمانە وایان لە حاجی کردووە پشت بە خۆی ببەستێت و متمانەبەخۆبوونی لەلا دروست بکات، بەتەنیا و بە ئیرادەی سەربەخۆ ڕووبەڕووی هەموو زەحمەتییەک ببێتەوە. دواتر حاجی قادر ئەو بێباکی و متمانەبەخۆبوونەی وەک ئامرازێک بەکارهێناوە لە خزمەتکردن بە هزرە چاکسازییەکەی. لە بواری ئەدەبی و فیکرییش وای کردووە حاجی، ئەوەی کە بڕوای پێیەتی و بە ڕاستی دەزانێت، هەر ئەوە بڵێت و هەر ئەوە ئەنجام بدات، نەبێت بە کاسەلێس و دەرباری هیچ کەس، شیعر بۆ کەس، بەتایبەتی دەسەڵاتدار و کاربەدەستان نەهۆنێتەوە، بە شیعرەکانی کاری دزێوی هیچ کەس و لایەنێک جوانکاری نەکات و پاساوی بۆ بهێنێتەوە، لایەنگریی هیچ فیکر و بۆچوونێک نەکات ئەگەر خۆی بڕوای پێی نەبێت، زۆر بوێرانە و ڕاشکاوانە هەرچی بە باشی زانیبێت و قەناعەتی پێی هەبووبێت، وتوویەتی و لەوەی نەپرسیوەتەوە کە چی ڕوو دەدات. هەموو دیوانەکەی حاجی، ڕەنگدانەوەی ئەو تایبەتمەندییەی پێوە دیارە، بەڵام هەروەک نموونە ئەو چەند بەیتەی کۆتایی خاڵی دووەم (حاکمی ڕێگری مەعموورەیە، قازیی دزی ڕۆژ / وزەرا و وکەلای گورگە، ڕەعییەت گەلەیە) جارێکی تر بخوێنەوە، تێدەگەیت حاجی چ شاعیرێکی ڕەخنەگری بوێر و ڕاستگۆ و ڕاشکاو بوو لەگەڵ خۆشی و لەگەڵ بەرامبەرەکەشی. ئەو ڕەخنە توندە کە گرتوویەتی لە بەرپرس و کاربەدەستانی دەسەڵاتی عوسمانی تا دەگاتە سوڵتان و کەسی یەکەم، تەنانەت گوزارشت و دەربڕینەکانی هەندێ سێبەر و بۆنی سووکایەتیپێکردنیشی لێ دێت، بەبێ ئەوەی هیچ حیسابێک بۆ ئەوە بکات پەرچەکرداری جەندرمە و یاساوڵەکانی عوسمانی چ دەبێت و چیی بەرامبەر دەکەن، ئامادەش بووە بەرپرسیارێتیی ئەو بوێری و حەقبێژییەی لەئەستۆ بگرێت، گوێ بەوە نەدات کە چی ڕوودەدات و چی دێتە ڕێگە، هەر بۆیەش لە بەیتە شیعرێکدا دەڵێت:



**ئەگەر دیوانی حاجی قادر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بخوێنینەوە، لە دیدێکی ئیسلامیی ڕوون و ڕاشکاوەوە سەرنجی دیاردە و ڕووداوەکانی داوە و خوێندنەوەی بۆ کردوون و هەڵیسەنگاندوون.**

**لە تووشیی خۆم بوو هەرچی تووشی خۆم بوو**
**لە دەستی خۆیەتی حاجی شکاتی(٩)**

مەبەستەکەی حاجی ڕوونە، دەڵێت هەرچی تووشم هاتووە لە دەربەدەریم و دژایەتیکردنی نەیارەکانم، لە هەژاریی و بێنەواییم، دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی «تووشی» خۆم، واتە ئازایەتی و بوێری و حەقبێژی و لە ڕوو وەستانەوەم بۆ کەسانی دەسەڵاتدار، ئیتر بۆچی سکاڵای خەڵک بکەم! نەخێر، سکاڵای من هەر دەبێت لە خۆم و لەو سروشتەی خۆم بێت.

## چوارەم: کرانەوە و ئامادەیی قبووڵکردنی جیاوازی

حاجی قادر ئەگەرچی دەرچووی حوجرە بووە، زانستەکانی حوجرەی خوێندووە و مۆڵەتی مەلایەتیی وەرگرتووە، کەسێکی پابەند بە ئایین بووە، حیسابی وردی بۆ ڕەفتارەکانی خۆی کردووە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە لە خێزان و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی نەریتی و عەشایەری پێگەیشتووە، بەڵام بیر و هزرێکی کراوەی هەبووە، داوای کرانەوە بەسەر هزر و ئەزموونەکانی دیکەی مرۆڤایەتی دەکات. ئەو کرانەوەیەی حاجییش، لە ئەنجامی قووڵیی تێگەیشتنەکەیەتی لە ئایینی ئیسلام، تێگەیشتن و پابەندیی ئەو بە ئایین و شەریعەت تێگەیشتن و پابەندییەکی مەقاصیدییانە بووە، ئەو ڕاستییە یان ئەو تایبەتمەندییەی هزری حاجی؛ لە تەئصیلکردنەکانی بۆ تێگەیشتن و بۆچوونەکانی ڕەنگ دەداتەوە. بۆ نموونە؛ سەیری ئەم دوو بەیتەی بکە:

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین:
**اطْلُبُوا الْعِلْمَکم وَ لَوْ بِالصِّین**
**نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نییە**
**گەر مەلا نەهیی فەرموو، دینی نییە(١٠)**

یان لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەزموونە مرۆییەکان، بەتایبەتی پێشکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژییەکانی ئەورووپا، کە ڕاشکاوانە کورد هان دەدات چاوی لێ بکەن و لە چەندین شوێن لە دیوانەکەیدا ئاماژە بە پێشکەوتنەکانی ئەورووپا دەکات. ئەمە هەر بۆ خۆشی و پڕکردنەوەی لاپەڕەکانی دیوانەکەی و زیادکردنی دێڕی شیعرەکانی نەبووە، بەڵکوو بۆ دروستبوونی گفتوگۆ و سوودوەگرتن بووە. لەم ڕووەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شتێک یان ئامرازێک یان هەر داهێنراوێکی تازە، ڕێگەیەکی دروستی گرتۆتەبەر، کە بریتییە لە وەرگرتن و سوودلێبردن، بەڵام دوای خۆماڵیکردن و هەموارکردنی لەگەڵ ئایین و کولتووری خۆمان، نەوەک هەر گواستنەوەیەکی میکانیکی، نە ڕەتکردنەوەی کوێرانە و نە گواستنەوە و تەسلیمبوونی بێ مەرج.

**تۆ وەرە فەننێ فێر بە چیتە لەوە**
**گاورە، هیندووە، وە یاخۆ جووە**

وەرە فەننێ فێر ببە، فەن؛ شتی پراکتیکی و عەمەلی، ئامرازەکانی بەڕێوەبردنی ژیان و کۆمەڵگە، ڕێگەکانی خۆشگوزەرانی و گەشەکردن و پێشکەوتن، ئەمانە کە باس لە گۆڕاوەکانی ژیانە،



**شیعرەکانی حاجی بابەتی فیکرین، تێیدا قسە لەسەر بابەتە نەتەوەییەکان، چاکسازیی کۆمەڵایەتی و ئایینی، ستەم و دادپەروەری، ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری، زۆر بابەتی تری هزری دەکات.**

نەوەک فەلسەفەی ژیان و جیهانبینی، ئیدی ئەمە ئەو دیوەیە، بۆ هەموو کەس وەک یەکە، بۆیە ئاساییە لای حاجی لە هەر کەسێک وەربیگری، گاورە، هیندووە، یان تەنانەت جوولەکەیش بێت.

یان کاتێک باس لەوە دەکات کە ئەرمەنەکان منداڵەکانیان دەنێرن بۆ ئەورووپا بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، مەبەستی ئەوەیە بڵێت: دەی ئێوەش وەک ئەوان بکەن.

**هەم حەققیانە ئەرمەن غیرەتکەشی یەکترن**
**وەک ئێمە نین لەگەڵ یەک دەعوا بکەن بە شیران**
**بۆ فەننی حەرب و سەنعەت، بۆ زەبت و ڕەبتی میللەت**
**دەینێرنە ئورووپا گەورە و بچووکی خۆیان(١١)**

تەنانەت ئەزموونی سیاسی کە پرسێکی عەقڵانییە و دەچێتە بازنەی گۆڕاوەکان، ئاماژە لە شیعرەکانی دەست دەکەوێت کە قسە لەسەر بابەتێک دەکات نزیک لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی (العقد الاجتماعي) کە هەوێنی شۆڕشی فەڕەنسا بووە، کە دەکرێت سوودی لێوەربگیرێت. من بە دووری نازانم حاجی قادر ئاگاداریی و شارەزایی لە تیۆرەکەی جان جاک ڕۆسۆ هەبووبێت. سەیری قەسیدەی «خاکی جەزیر و بۆتان»، لە (ل٩٥)ی دیوانەکەیدا بکە، تێدا دەفەرمووێت:

**لەم بەینە ئیتتفاقێ پەیدا بکەن بە مەردی**
**فەرقی نەبێ شوان و جووتیار و میر و گاوان(١٢)**

### پێنجەم: ڕەخنەگری

فیکری حاجی وەک لە دیوانەکەی دەردەکەوێت، فیکرێکی ڕەخنەگرانەیە. هزرڤان و بیرمەند بەر لە هەر شتێک، دەبێت ڕەخنەگرێکی ورد و بوێر بێت، چاوی تیژ و وردبین بێت، توانای خوێندنەوە و شیکردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی بۆچوون و ڕووداو و دیاردەکانی هەبێت. حاجی قادر لەگەڵ ئەوەشدا کە شاعیرێکی هەستناسک و جوانناس بووە، بەڵام هزرڤانێکی وردبین و ڕەخنەگرێکی بوێریش بووە، هەموو ئەو بۆچوون و دیاردە و ڕووداوانەی سەردەمی خۆی خوێندۆتەوە و شی کردۆتەوە. دوای ئەوەی بە تەرازووی مەرجەعیەتەکەی هەڵیسەنگاندووە، هەر کامی کورتی هێنابێت، بێ سڵەمینەوە و بێ ترس و بێ ئەوەی جگە لە پێوەری ڕاستی و دروستی؛ هیچی تری لەبەرچاو گرتبێت و بێباک حیسابی بۆ هیچ هێز و دەسەڵاتێک نەکردووە، ئەگەر خەلیفە و لوتکەی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانییش بووبێت، بێ سڵەمینەوە و ترس ڕەخنەی لە دەسەڵات و ستەمکاری و نادادییەکانی، لە دیاردە و درووشمە بە ناو پیرۆز و پیرۆزکراوەکان، لە کەسایەتی و ڕەمزە دەستڕۆشتووەکانی ناو کۆمەڵگە گرتووە. شاکر فەتاح دەڵێت:»حاجی چونکە زمانتیژ بوو و ڕاستەوڕاست، بەئاشکرا لە دوژمنانی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی توانج و پلاری ئەگرت(١٣)». حاجی جگە لەوە زۆرباش کۆمەڵگەی کوردیی ناسیوە، ڕەخنەگرێکی بەتواناش بووە لە دەرخستن و پەنجە خستنە سەر کەموکورییەکانی و ڕەخنەی لێ گرتوون. حاجی قادر ڕووی ڕەخنەی لە خەڵک

بەگشتی کردووە، ڕەخنەی لە شێخ و مەلا گرتووە، لە دەستەبژێر و لە بەرپرس و کاربەدەستانی وڵات تا دەگاتە کەسی یەکەم، بە زمانێکی زبر و توند ڕەخنەی لە سوڵتان گرتووە، بەڵکوو کەموکوڕی و ناتەواوییەکان و گەندەڵییەکانی هەموو خستۆتە ئەستۆی ئەو و چووانداوویەتی بە گای بنە:

**زوڵمیان عامە لەسەر عاممە، ڕەعیەت فەوتا**
**تۆ مەکە مەنعی عەوامیل، کە خەتای گای بنەیە**

یا لە بەیتێکی تردا دەفەرمووێت:

**ئەم سەگانەی کە لەلای ئێمە وەزیر و وکەلان**
**بێنە لای تۆ بە خودا نایکەیە گاوان و شوان**
**ئەمە کەرمێزە دەڵێن واریسی شەرعی نەبەوین**
**هەموو عەبدی سەنەمن، باسی مەکە گەورەکەیان(١٤)**

ڕەخنەی لە دۆخی کۆمەڵایەتی، لە شێوەی دینداری، لە دووبەرەکی و ڕێکنەکەوتن، لە دواکەوتوویی ئابووریی و ڕەخنەی لە کاریگەربوون بە مۆدێرنێتەی خۆرئاوا و پشتکردن لە ئیسلام گرتووە. ڕەخنەی لە سەروەرنەبوونی شەریعەت و نادادپەروەری گرتووە. ڕەخنەی توندی لە فەرامۆشکردنی زمان و کولتووری نەتەوەیی گرتووە. ڕەخنەی لە سەرکردەکان گرتووە کە ئەوەندەی خەمی خۆیان دەخۆن، ئاگایان لە بەرژەوەندیی گشتی نییە.

**شەشەم: واقیعبینی**

لای حاجی ئەوەی گرنگە ئێستایە، ئەو کات و ساتەی تێیدا دەژی. مامەڵە لەگەڵ واقیع و ڕووداوەکانی ئێستا، نەوەک ژیان لە خەیاڵ یان ڕابردوو. گرنگە کار بۆ چاکسازیی ئێستای کۆمەڵگە بکرێت، مرۆڤ نابێت بە قسەی بێسەروپا، خەیاڵپڵاوی، یان ترس لە نەدیو و نەبینراو؛ ژیانی خۆی تاڵ بکات. نابێت لە ئاست ڕووداوەکانی دەوروبەری؛ بێموبالات و کەمتەرخەم بێت، هیچ نەخشە و پلانێکی نەبێت بۆ مامەڵەکردن و گۆڕینیان بە ئاڕاستەی بەرژەوەندییەکانی خۆی. بۆیە حاجی دەڵێت: حاڵ نەقدینەیە، ڕابردوو کە ئیتر تێپەڕی و تازە ناگەڕێتەوە، داهاتووش کە دیار نییە چۆن دەبێت؛ دەمێنین یان دەمرین، ڕووداوەکان نەهاتوون، هەردووکیان بێنرخ و جێگەی بایەخ نین، نابێت بەبێهیوایی سیم و زەڕی خۆت، کە ئەو کات و ساتانەن تێیدا دەژییت، سەرفی بکەیت و لەدەستی بدەیت.

**بە قسەی بێسەروپا، تاڵی مەکە لەززەتی خۆت**
**بێموبالات مەسووتێنە چرای فیکرەتی خۆت**
**حاڵە نەقدینەیە، موستەقبەل و مازی پەشمە**
**بێئەمەل سەرفی مەکە سیم و زەڕی فورسەتی خۆت(١٥)**

حاجی دەیبینی چەرخی ژیان لە گۆڕانی بەردەوامدایە، تەنانەت هەلومەرج و ڕێوشوێنی پەیداکردنی بژێوییش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێت، بۆیە دەبێت هەمیشە مرۆڤ هونەرەکانی مامەڵەکردن و پەیداکردنی بژێویی هەر سەردەمێک فێر بێت، ئەگینا بەرداشی ڕووداوەکان دەیهاڕن.

**تۆ وەرە فەننێ فێر بە چیتە لەوە**
**گاورە، هیندووە، وە یاخۆ جووە**
**لازمە خول بخۆی وەکوو بەرداش**
**هەموو قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعاش(١٦)**

جگە لەو واقیعبینی و واقیعیەتەی فیکری حاجی کە لە زۆر شوێن هانی کوردی داوە چاو لە واقیعی نەتەوە و گەلە پێشکەوتووەکان بکەن، پەندیان لێ وەربگرن، وەک ئەو نموونە شیعرییانەی پێشتر هێناومانەتەوە.

لە ئەنجامی ئەو واقیعبینی و عەمەلیبوونەی، حاجی گوتاری ڕەخنەی توندتر(١٧) دەکات لەو دیاردانەی هەندێ شێخەکان مومارەسەیان دەکرد لە ئیدعای کەشف و کەرامات و پشتبەستن پێیان لە کاروباری ڕۆژانە و گەیشتن بە ئەنجام و وەدەستهێنانی مەبەستەکان. ڕووی ڕەخنە دەکاتە ئەو شێخانە و پێیان دەڵێت:

موعجیزە و کەشف و کەرامات و دوعا بۆچی نەیبوو فەخری عالم مستەفا(١٨)؟

## حەوتەم: فیکرێکی پراکتیکی و عەمەلی بوو

حاجی قادر لەناو جەرگەی کۆمەڵگە و کێشەکانیدا کولاوە، لەوێوە بیر و هزری خۆی گوشیوە و گەیشتۆتە بەرهەمهێنانی ئەو تێز و بۆچوون و تیۆریایانەی خۆی، لە گۆشەیەکی مزگەوت یان لە کۆشکێکی بلووریی خۆش دانەنیشتووە و هەندێ تیۆری فەلسەفیی ڕووت و ئەبستراکتی دوور لە واقیعی بەرهەم هێنابیت یان هەڵبەستبێت، بە گواستنەوەی هەندێ بۆچوون و ڕای ئەم و ئەو.

هەروەها حاجی کارگەی بەرهەمهێنانی هزر و بیرۆکە نەبووە فیکر بۆ ئەوانی تر بەرهەم بهێنێت، بەڵکوو ئەو فیکر و تێزانەی لە هۆنراوەکانیدا دەیخستنە ڕوو، خۆی لە مەیدان کاری بۆ هێنانەدییان دەکرد و لە خەباتێکی بێوچاندا بووە لە پێناو گەیشتن بەو ئامانج و وێنایەی لە زهنی خۆی و لە شیعرەکانیدا وێنەی بۆ کێشابوو، قوربانی و باجێکی زۆریشی لەو ڕێگەوە داوە. حاجی لە خەیاڵ و ئەندێشە نەدواوە، باسی لە یۆتۆپیا و شاری خەونەکان نەکردووە، بەڵکوو وەک ئاماژە کرا لەناو جەرگەی کۆمەڵگەکەی ڕەخنەی لە هەندێ دیاردەی بە ناو ئایینی گرتووە و قسەی لەسەر ڕێوشوێنی چاکسازیی ئایینی کردووە. بەوەوە نەوەستاوە، بەڵکوو بە کردەیش چۆتەوە بەگژ ئەو کەس و ڕەمزانەی لە پشت هێنان و بڵاوکردنەوەی ئەو دیاردانە بوون، نانیان پێوە خواردووە و بازرگانییان بەسەر دینەوە کردووە و لەوپێناوەدا باجیشی داوە.

لە باسی زیندووڕاگرتنی زمانی نەتەوەیی و گەشەدان بە کولتوورەکەی، وەک بنەمایەک بۆ بونیاتنانی دەوڵەت، چۆتەوە بەگژ ئەوانەی سووکایەتییان بە زمانی کوردی کردووە. لە ڕەخنەگرتنەکانی؛ کینایە و مەجازی بەکارنەهێناوە، ڕاستەوخۆ ئەوانەی ڕەخنەی لێ گرتوون؛ ناوی هێناون، هەر کێ بووبێت، با کاربەدەستی گەورە و دادوەریش بووبێت. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تر حاجی تەنها بیرۆکەی ڕووتی نەخستۆتە مەیدان، بەڵکوو هەمیش پێشنیاز و پڕۆژەی کردەیی و چەندین جار نەخشەڕێی تەواوی پێشکەش کردووە، وەک لە بابەتی چاکسازیی ئابووریی و پێشخستنی کەرتی کشتوکاڵ، بۆ ئەمەش سەیری مەسنەویە سی و پێنج بەیتەکەی لەژێر ناوی «وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی(١٩)» بکە.

## هەشتەم: بەکارهێنان و تەوزیفکردنی شیعر لە بواری هزریدا

حاجی قادر لەگەڵ ئەوەی زانایەکی هەڵکەوتوو و بیرمەندێکی قووڵ و خاوەن پەیام و هەڵگری پڕۆژەیەک بووە، شاعیرێکی هونەرکار و بەتواناش بووە(٢٠)، دەستڕۆیشتوو بووە لە دانانی شیعری عەرووزی جوان و بەهێز. ئەگەرچی لە ڕووی ڕێبازی شیعریدا لە بازنەی قوتابخانەی بابان خۆی دەبینێتەوە(٢١) و لە ڕووی مێژووییشەوە دەچێتە ڕیزی نەوەی دووەمی ئەو قوتابخانەیە، وەک: حەریق و وەفایی و شیخ ڕەزا...، بەڵام لە ڕووی توانای شیعری و بەهێزی و صیناعەتی شیعرەوە یان شیعرسازییەوە، لە نەوەی یەکەم؛ «نالی و سالم و کوردی» نەوەک هەر جێ نەماوە، بەڵکوو دەشێت پێش ئەوانیش کەوتبێت. ڕەفیق حلمی دەڵێت:» حاجی قادر نیشتمانپەروەرێکی شاعیرە. حاجی قادر نیشتمانپەروەریش نەبووایە، بە شاعیر هەر دەژمێردرا، چونکە ئەم شیعرانەی کە شعووری دەروونی خۆی پێ ئیفادە کردووە، لەوانەیە کە حاجی قادر ئیدعای شاعیریی پێوە بکا. لەبەرئەوە دەتوانی بڵێی: ئەگەر لەبەر ئەهەمیەتی گیان (ڕوح)؛ ماددەی ئیهمال نەکردایە و بەتەنگ ڕازانەوەی ئەو شیعرانەوە ببووایە، زۆر بەئاسانی

ئەمەی بۆ دەچووە سەر و ئەیتوانی کە بیانخاتە وێنەیەکی جوانتر و بەرزتری ئەدەبییەوە. بەڵام وەکوو وتمان، حاجی مەبەستی شیعر داڕشتن نەبووە، فکر داڕشتن بووە و بۆ ئەمەش نزیکترین ڕێگەی لە وتاری ڕاست و ڕەوان و لە پەند و مەوعیزەی کوردیی پەتی بینیوە(٢٢)». بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکی شیعرەکانییەوە، بێگومان حاجی داهێنانی خۆی هەیە و پێش نەوەی یەکەم کەوتۆتەوە و ئەگەر ئەحمەدی خانیی لێ لا بدەین(٢٣)، حاجی یەکەم کەسە(٢٤) شیعر بار بکات بە فەلسەفە و هزر و پەیامێکی دیاریکراو و وەک چەک و ئامراز بەکاری بهێنێت بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی، تەوزیفی بکات لە مەیدانی خەباتی چاکسازیی و ئایینی و کۆمەڵایەتی، هۆشیاریی و سیاسی و نەتەوەیی.

بابەتی شیعرەکانی حاجی بابەتی فیکرین، تێیدا قسە لەسەر بابەتە نەتەوەییەکان، چاکسازیی کۆمەڵایەتی و ئایینی، ستەم و دادپەروەری، ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری، زۆر بابەتی تری هزری دەکات.

تا سەردەمی حاجی، بەشێکی زۆری شاعیران شیعریان بۆ خۆیان داناوە، بۆ چێژی تایبەتی، دەربڕینی هەست و سۆز و سەلماندنی خود، بابەتەکان ئایینی و عیرفانی، یان دڵداری، پیاهەڵدان و داشۆرین، دواجار هەر دەربڕینی هەستە ناوەکییەکان بە ئەرێنی و نەرێنییەوە بووە. حاجی ئەو دەقەی شکاند، هات شیعری تەوزیف کرد وەک ئامرازێک، وەک چەکێکی برندە و تیژ بەکاری هێناوە لە مەیدانی چاکسازیی ئایینی و کۆمەڵایەتی، سیاسی و نەتەوەیی... هتد.

بۆ ئەو مەبەستەش، جگە لەوەی هەوڵیداوە توانای شیعریی بەهێز و زیاد بکات، خۆشی بەراورد کردووە بە شاعیرە دیار و هەڵکەوتووەکانی کورد و غەیرە کوردیش، وەک حافیز و نالی و کوردی، ئەوەش وەک ڕێگەیەک تا خەڵک گوێی لێ بگرن و گرنگی بە شیعرەکانی بدەن. هەمیشەش شیعرەکانی وەک نامە و پەیام دەناردنەوە بۆ زێدی خۆی و بڵاوی دەکردنەوە بەملا و ئەولادا، داواشی دەکرد لەبەری بکەن. ئەم ناردن و داواکردنی لەبەرکردنە بۆ دوو مەبەست بووە: یەک: تا شیعرەکانی پارێزراو بن و بڵاو ببنەوە. دوو: تا ڕۆڵی خۆیان ببینن لە چاکسازی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی ئایینی و نەتەوەیی. حاجی لە ڕێگەی شیعرەوە هەڵساوە بە کاری چاکسازی.

کۆتایی: لەو چەند لاپەڕەیە و بە وردبوونەوە لە شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، توانیمان چەند خەسڵەت و تایبەتمەندییەک هەڵێنجین و دیاریی بکەین کە کەسایەتی و فیکری حاجی قادر لە ئەدیب و شاعیر و بیرمەندەکانی تری هاوچەرخی خۆی و دوای خۆشی جیا دەکاتەوە، پێمواببێت هەر ئەم جیاوازییەشە وایکردووە حاجی ببێتە جێگەی بایەخی توێژەر و ڕەخنەگران، هەروەها ئەو پێگە گرنگەی لە مێژووی گەشەکردن و پێشکەوتنی فیکری کوردی بۆ خۆی دەستەبەر بکات.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١. لە فەرهەنگی زانستگای کوردستان هاتووە: ڕەسەن وەک ناو = بنەچەکە، بنچینە، نەژاد، وەک ئاوەڵناو = گران، ئادەر، جسن، بندڕس، جانەدان، بە نەژادی چاک (ئەسپی ڕەسەن)، أصیل، نجیب. فەرهەنگی زانستگای کوردستان، بە سەرپەرشتیی ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، ب٢، ل١٣٣٨.

٢ مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٤، ل١٤٢.

٣ لەو قەسیدەیەدا حاجی چەندین دیمەنی ژیان و گوزەرانی کوردەواری کە بوون بە بەشێکی ڕەسەنی کولتوور و کۆمەڵگەی کوردەواریی ڕەسەن لەو سەردەمەی حاجی و تا ئێستاش هەندێکی بەزیندوویی ماونەتەوە، وەک تابلۆیەکی هونەری دەخاتە بەر دیدی خوێنەر کە چێژێکی زۆر دەدات بە خوێنەرەکەی، لەوانە چەند تابلۆیەکی ژیانی لادێی کوردەواری کە دەڵێت:

**لە کێو و کەژ کە سەرئێوارە دێتەوە ماڵات**
**لە دەوری چادری ساحێبی مەوجی دا، وەستا**
**لە حیلەحیلی کەحێل و لە بارەباری مەڕان**
**لە دەنگی قوڕەی گاجووت و بۆڕەی مانگا**
**لە گورگەلوور و حەپەی سەگ، لە قاپەقاپی بزن**
**لە عەکسی دەنگی دووبارەی کە دێتەوە لە چیا**
**لە ئۆحەئۆحەیی گاوان و قیرەقیری شوان**
**لە بگرەبەردەیی کابان دەبێتە حەشر و حەلا**
**مەلائیکەی سەری تاق و ڕەواقی مینایی**
**دەبێتە جونبوش و لەرزین، دەکەونە حەولەوەلا**
**٤ دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل٤١**

٥ سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی، ب٣، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٢٧٦.

٦ دیوانی حاجی، ل١٨٩-١٩٠.

٧ دیوانی حاجی، ل١٦٣-١٦٤.

٨ دیوانی حاجی، ل١٤٦-١٤٧.

٩ هەمان سەرچاوە، ل١٧١.

١٠ پێشتر ئاماژەی پێ کراوە.

١١ دیوانی حاجی، ل٩٩.

١٢ دیوانی حاجی، ل٩٥.

١٣ سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ب٣، ل٢٧٦.

١٤ دیوانی حاجی قادر، ل٩٢.

١٥ دیوانی حاجی قادر، ل٦٢.

١٦ دیوانی حاجی قادر، ل١٩٠.

١٧ بەگشتی حاجی وەک مرۆڤێکی شۆڕشگێر هەندێ جار گوتاری توند و گرژ دەبێت بەرامبەر نەیارەکانی:

**لە عەهدی کەر نەبی تا دەوری گا کوێر**
**لە گوێی گا نووستوون زۆر حەیفە بۆ شێر**

١٨ دیوانی حاجی، ل٢٠٤.

١٩ لە ل٢٥٢-٢٥٧ لە دیوانەکەیدا.

٢٠ هەندێ نووسەر، لەوانە «شاسوار هەرشەمی»، دەڵێن حاجی قادر شاعیر نەبووە، شەڕی بە شیعر فرۆشتووە، بە پاساوی ئەوەی زۆر بایەخی بە وشەئارایی و هونەرەکانی ڕەوانبێژیی نەداوە و دەقە شیعرییەکانی بە وشەی قەبە و وشەی بێگانە، یان وشەکانی ناو فەرهەنگی دەوڵەمەندی ئایینی نەڕازاندۆتەوە، بەڵام ئەمە هەڵە تێگەیشتنە، شیعرناسەکان و ئەوانەی شارەزای هونەری شیعرن، حاجی قادر لە ڕیزی شاعیرە گەورە و هەڵکەوتووەکانی گەلەکەمان دادەنێن. جیاوازیی حاجی لە شاعیرە گەورەکان ئەوەیە لە قۆناغی ژیانی ئەستەنبوڵی، ئەوەندەی بایەخی بە ناوەرۆک و پەیامەکانی ناو شیعرەکانی دەدا، بەقەد ئەوە فۆرم و هونەرەکانی شیعر جێگەی بایەخ نەبوون لەلای، لەو قۆناغە شیعر لای حاجی لەوە تێپەڕی ئامانج بێت، بەڵکوو بوو بە ئامراز. سەبارەت بە بۆچوونی کاک شاسوار، سەیری: تەتەڵە، نووسینی: شاسوار هەرشەمی، ل٤٠٥- ٤٠٦ بکە.

٢١ پێشەکیی دیوانی حاجی قادر، سەردار میران و کەریم شارەزا، ل٢٥-٢٦.

٢٢ ڕەفیق حلمی: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، ل١٠١-١٠٢.

٢٣ بۆیە دەڵێم ئەگەر ئەحمەدی خانی جیابکەینەوە، چونکە «مەم و زین»ەکەی ئەویش شیعری وەک ئامرازێکی هزر و خەباتی سیاسی بەکار هێناوە.

٢٤ دەشێت لە شیعرەکانی نالی و سالم چەند بەیتێکی کەم دەست بکەوێت بە تەئویل، بگەینە ئەوەی بڵێین پەیامێکی هەڵگرتووە.



# مەستیزادە مەجید بەرقی
# لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا



**پ.ی.د. هێمن عومەر خۆشناو**
لەدایکبووی ١٩٨٣، دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی، خاوەنی ژمارەیەک کتێبی چاپکراو و چەندین وتار و توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە.

ئەم زانا و کەسایەتییە کوردە؛ کوڕی زانای گەورە ڕەسوول مەستی ئەفەندی (١٨٢٣-١٩٠٨) یە، تا ئێستا ئەوەی ئێمە پێی بزانین باسی لە هیچ سەرچاوەیەک نەهاتووە، بەهۆی ئەوەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە چەند شیعرێکیدا هەجووی ڕەسوول مەستی دەکات و لەنێو یەکێک لە شیعرەکانیدا هێرش دەکاتە سەر مەجیدی کوڕیی و ناوی دەهێنێ و بە دەربڕینی (حەققا کە «مەجیدی» کوڕی زۆر تەبعی جەوادە... ) (١) درێژەی پێ دەدات. ڕەسوول مەستی باپیر و «عەبدولمەجید(٢) مەستی» و «ڕەشید مەستی» یش خاڵی تۆفیق وەهبی بەگن. لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا زیاتر لە چل بەڵگەنامە دەرهەقی ئەم زاتە هەیە. بۆ ڕزگارکردنی ژیان و هەڵوێستەکانی ناوبراو و تۆمارکردنی لەنێو مێژووی کورددا، لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامەکان تیشک دەخەینە سەر چەند وێستگەیەکی ژیانی.

### کورتەژیانی لە تۆماری گشتیدا:

عەبدولمەجید بەرقی(٣) کوڕی ڕەسوول مەستی ئەفەندی بەڕێوەبەری مەعاریفی ویلایەتی مووسڵە و لە بەگەکانی کوردە و لە سولالەی چوتانلی یە. ساڵی (١٢٨٩ک/ ١٨٧٢-١٨٧٣ز) لە ویلایەتی موسڵ لەدایک بووە.

لە مەکتەبی ڕوشدییەی سلێمانی خوێندوویەتی و وانەکانی تەواوکردووە، بەڵام نەیتوانیوە بڕوانامە وەربگرێ. لە ویلایەتی موسڵ لە مەکتەبی دۆمینیکان و فرەنسییەکان خوێندوویەتی و عەرەبی، فارسی، تورکی و فەرەنسی بە قسەکردن و نووسین دەزانێ و زمانی کوردیش بەقسەکردن دەزانێ. لە ساڵی ١٣٠٥ی ڕۆمی چۆتە مەکتەبی فنوونی مولکییە و تا پۆلی سێ بەردەوام بووە و دواتر وازی هێناوە. وتاری لە ڕۆژنامەی موسلیمی شاری بۆمبای هیندستان بڵاوبۆتەوە.

لە (٢١ی شەوالی ١٣١٧ک / ١٩٠٠/٢/٢٢ز) بە ڕۆژانەی ٢٠ قرووش لە دیاربەکر بۆتە فەرمانبەر. دواتر بە مووچەی ١١٢٥ قرووش لە ویلایەتی وان، لە سەنجاقی هەکاری لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریرات دامەزراوە. لە (٩ی شەعبانی ١٣٢٥ک/ ١٩٠٧/٩/١٧ز) لە دیاربەکر دەستی لە کار هەڵگرتووە و ڕۆژی ٥ی ڕەمەزانی هەمان ساڵ لە هەکاری دەستبەکار بووە.

هەر لەبەر لێهاتوویی و خزمەتە باشەکانی لە کاری فەرمانبەریدا، لە هەریەکە لە ئەنجومەنی ویلایەتی دیاربەکر و ئەنجومەنی سەنجاقی هەکاری سوپاس و پێزانینی بۆ نێردراوە. لەبەر شارەزابوونی لە کاروباری سیاسیدا، حکومەتی مەشرووتییەی عوسمانی بە گونجاوی زانیوە ناوبراو لە شارەکانی خۆی و سەلماس بکاتە فەرمانبەری شابەندەر لە وەزارەتی دەرەوە(٤).

ناوبراو لە دوای خانەنشینبوونیشی لەبەر لێهاتوویی لە کارەکانیدا، ڕەزامەندی درا لە سنجاقی سینۆپ(٥) لە ٢٤ی تەممووزی ساڵی ١٣٢٩ی ڕۆمی لە ویلایەتی قەستەمونی دەستبەکاربێتەوە(٦). دوای ئەو مێژووە، تۆماری گشتیی فەرمانبەران شتێکی دیکەی ئەوتۆی لەبارەی ناوبراوەوە نەنووسیوە.

### عەبدولمەجید مەستی و باسێکی وتارەکەی لە ڕۆژنامەیەکی هیندستاندا:

لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، دۆسیەیەکی هەژدە لاپەڕەیی لەم بارەیەوە هەیە و مێژووی ١٣١٣/١٠/٩ی کۆچی لەسەرە. تێیدا هاتووە عەبدولمەجید ئەفەندی کوڕی مەستی ئەفەندیی بەڕێوەبەری مەعاریفی موسڵ لەبەر هۆکارێکی سیاسی، بە مانگانەی ٦٠٠ قرووشەوە بۆ موسڵ دوورخراوەتەوە، دواتر لەوێ لە خزمەتی سەربازی خۆی بەردەوام بووە و دیارە ڕقەبەرایەتی لەگەڵ ئەفسەری تابوور کردووە و بەوهۆیەوە بۆ شاری بۆمبای هیندستان دوورخراوەتەوە. لەوێ

عەبدولمەجید ئەفەندی لە رۆژنامەی (مسلم هرالد) بە زمانی فارسی وتارێکی لە دژی ئەمریکایی و ئەرمەنییەکان نووسیوە و بەهۆی ئەو وتارەوە لە بابی عالیی عوسمانییەوە بڕیاری لێبووردنی بۆ دەرچووە و گەڕێنراوەتەوە لای باوکی و مووچەکەی بۆ وەک جاران لێکراوەتەوە.

لەو دۆسیەیەدا ئەم فەرمانە ئیمزای وەزارەتی کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی پێوەیە(٧) ، لەگەڵ ئەوەشدا نووسراوی وەزیری زەبتییەش بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی (١ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣١٣ک/ ١٨٩٦/٢/١٥ز) تێدایە(٨).

دیارە پێشتر لە ٢٠ی مانگی رەجەبی ١٣١٣ی کۆچی محەمەد صاڵحی والی موسڵ نووسراوی بۆ وەزارەتی ناوخۆ کردووە و تێیدا ئەو بابەتەی باس کردووە کە عەبدولمەجید ئەفەندی دوای ئەوەی بۆ هیندستان دوورخراوەتەوە، لەوێ لە رۆژنامەیەک زۆر بەرگری لە عوسمانییەکان کردووە و ویلایەتی موسڵ وتارەکەی لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر تورکی و تێیدا ئەوەی باس کردووە کە ناوبراو لەنێو ئەدیباندا کەسێکی دیارە و کوڕی کەسێکی ناسراوە و هیوادەخوازن بگەڕێتەوە لای باوکی و ئەگەر هەر تاوانێکیشی لەسەر ساغ بۆوە؛ ئامادەن بۆ هەر لێپرسینەوەیەک و داوا دەکەن مووچەکەشی بۆ وەک جاران لێ بێتەوە(٩).

وادیارە وتارەکەی ناوبراو بە ناوی مەستیزادە عەبدولمەجید بەرقی نووسراوە و کە ویلایەتی موسڵیش وتارەکەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی بە هەمان شێوە نووسیویانە عەبدولمەجید بەرقی کوڕی مەستی ئەفەندی. لە نوسخەی رۆژنامەکەش واهاتووە.

وتارەکە لە رۆژنامەی THE MUSL□M HEARLD و لە ژمارە ٢٨٠ی رۆژی سێ شەممەی ٢٦ی نۆڤەمبەری ١٨٩٥ی زایینی بەرامبەر ٨ی جەمادی دووەمی ساڵی ١٣١٣ی کۆچی بە سەر ناوی (گمراهی روزنامهائی انگلستان) بڵاوکراوەتەوە و تێیدا پوختەکەی ئەمەیە:

لەم چەند رۆژانەدا لە رۆژنامەکانی ئینگلیز واتە رۆژنامەی تایمز و چەند رۆژنامەیەکی تر، بەبێ بیرکردنەوە، مەسەلەی پیسی ئەرمەنییەکان لەنێو گۆتەگۆت و قیل و قالاندا دەرهەق عوسمانییەکان وتاری دوورودرێژ و وەک مەکینەیەکی دوژمنکارانە ڕق و قینەی خۆیان دەخەنەگەڕ. بێگومان ئەو مەکینە دوژمنکارییە لە هەمبەری عوسمانییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ لەنێو مەحافیلی سیاسیدا فکر و هزری ئینگلیز پووچتر دەکاتەوە. هەر بۆ وێنە غلادستۆن ماوەیەک لەمەوبەر بێ لێکۆڵینەوە چەند شتێکی باس کردبوو، بێگومان ئەمە سزای خۆی هەیە و لە داهاتوودا بە زەرەری وڵاتەکەیان دەشکێتەوە.

ئەم رۆژنامانەی ئینگلیز لەکاتێکدا ئەم مەسەلەیە دەوروژێنن و دەیانەوێ مەسەلەی ئەرمەنییان دژ بە عوسمانییەکان زەق بکەنەوە، لەکاتێکدا دەوڵەتی ئینگلیز دەزانێت مسوڵمانانی هیندستان ئێستاش لە هەیەجاندان و هەمیشە بەهۆی ئایینەوە سوڵتان عەبدولحەمیدی خەلیفەی عوسمانی بە پاشا و پیرۆزی خۆیان دەزانن. دەوڵەتی ئینگلیزیش مسوڵمانان دەخاتە بن دەستی خۆی و ئەوجار داوای مافی ئەرمەنیانیش دەکات. بەهەرحاڵ فکر و رامانی سیاسییەکانی ئینگلیز دەرهەق بە مەسەلەی ئەرمەنییەکان فکر و رامانێکی پووچ و بێ مانایە و لەوبارەوە هەموو ئامانجیان تەنیا بازرگانییە و هیچی تر.

مەستیزادە عەبدولمەجید بەرقی(١٠)

## بۆچوونەکانی عەبدولمەجید مەستی و مەترسیی عوسمانییەکان:

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا کە مێژووی (١٣١٣/١٠/٢٤ک / ١٨٩٦/٤/٨ز) لەسەر نووسراوە و نووسراو بۆ وەزارەتی ناوخۆ کراوە، کە مەستیزادە عەبدولمەجید بەرقی، فیکر و بۆچوونەکانی خراپن و پێویستە لەسەر ئەو بۆچوونانەی بیوەستێنن،

وادیارە لەبارەی ئەو بۆچوونانەی ریسالەیەکی نووسیوە و هەر لەبەر ئەو بۆچوونانەش بووە نەیتوانیوە قوتابخانە تەواو بکات و هیچ پسپۆڕییەکیشی نییە و دیارە بە مەبەستی دەرکردنی رۆژنامەیەک نیازی هەیە بچێتە پاریس، بۆیە وا بە گونجاو دەزانرێ کە مەئموورییەتێکی گونجاوی لە بەیرووت یان لە موسڵ بۆ دابنرێت(١١).

لەم بەڵگەوە دەردەکەوێت دەوڵەتی عوسمانی لە فکر و رامان و هەڵسوکەوتەکانی عەبدولمەجید بە گومان بووە و ترسی لێ هەبووە، بۆیە ویستوویانە بەهۆی دامەزراندنی وەک فەرمانبەر رێگەچارەیەکی بۆ بدۆزنەوە هەتا دەست لە شتی تر هەڵنەقورتێنێ.

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە مێژووی ١٣١٠/١٢/٨ی کۆچی لەسەر نووسراوە، لە مەکتووبی قەلەمی تایبەتەوە نووسراو بۆ ویلایەتی موسڵ کراوە، ئاماژە بەوە دراوە، کە سلێمانیەلی عەبدولمەجید بەرقی ئەفەندی لە ئەستەنبوڵەوە فکری خراپی هەیە و وا باشترە بگەڕێنرێتەوە لای باوکی لە موسڵ، ئەو لە ئەستەنبوڵەوە نیازی هەبووە بچێتە ئەورووپا و لەگەڵ هاوڕێیەکی بەتەمابوون بە رێگەی ئەسکەندەروونەوە گەشت بکەن، بۆیە باشترین شت ئەوەیە بگەڕێنرێتەوە موسڵ(١٢).

## عەبدولمەجید مەستی و بەرهەمێکی:

لە نامەیەکدا کە مێژووی (١٥ی کانوونی دووەمی ١٣٠٩رۆمی / ١٨٩٤/١/٢٧ز) لەسەرە، نامەیەکی عەبدولمەجید مەستی تێدایە، کە بۆ خەلیفەی عوسمانی ناردووە و پوختەکەی ئەمەی خوارەوەیە:

سەردەمی عەبدولحەمید خانی دووەم، سەردەمی مەعاریف و پێشکەوتنی زانست و زانیارییە، هەر لە سایەی ئەمەوە بەرنامەیەکی نوێ بۆ خزمەتکردنی رۆڵەکانی نیشتمان دێتە ئاراوە. هەر لەو سۆنگەیەوە بۆ پۆلەکانی یەکەم و دووەمی مەکتەبی ئامادەیی کتێبێکم ئامادە کردووە لەبارەی قەواعیدی نەحوو و سەرف بەشێوەی پراکتیک، کە لە رستەگەلی بەسوود، گفتوگۆ و هەڵبژاردەی شیعران پێکهاتووە و بە عەرەبییەکەی ناوی (افصح الألسن)ە، ئەگەر چی من پیاوی ئەو مەیدانەش نیم، بەڵام ئەم نامیلکەیەم نووسیوە و پێشکەشی خاکی بەر پێی سەدارەتپەنای دەکەم. راستە ئەم نامیلکەیە کەم نرخە، بەڵام تا ئێستا بەرهەمێکی وا لە مەکتەبەکانی عوسمانی نییە کە بەوشێوە قەواعیدی بە پراکتیک ئامادە کردبێ، ئومێدی ئەوەم هەیە کە بۆ دەرسدانەوە جێی خۆی بگرێ. هەر بەو بۆنەشەوە مەکتەبەکانی ئامادەیی بۆ پۆلی یەکەم و پۆلی دووەم لە پای ئەو کارەم نووسراویان هاوپێچی سەدارەت کردووە بۆئەوەی سەدارەت لوتف و عەتای خۆی بەرامبەرم بنوێنێ. جا لە کۆتاییشدا ئەمر و فەرمان هەر هی حەزرەتی من لە الأمره.

١٥ی کانوونی دووەمی ١٣٠٩ی رۆمی
مەستیزادە ع. مەجید بەرقی(١٣)

دیارە ئەو کاتەی مەستیزادە ئەو داواکارییەی کردووە، ناوبراو لە دیاربەکر نیشتەجێ بووە، بۆیە لەگەڵ داواکارییەکەی ئەو والی دیاربەکریش نووسراوی خۆی هاوپێچ دەکات و ئەوە دەخاتە روو کە عەبدولمەجید بەرقی ئێستا لە دیاربەکر فەرمانبەر و خۆی خەڵکی موسڵە و ئەو نامیلکەیەی نووسیوە و داواکارییەکەی بۆ بابی عالی دەنێرین. نووسراوەکەش مێژووی ٣٠ی رەجەبی ١٣١١ی کۆچی بەسەرەوەیە(١٤).

هەر بۆ هەمان مەبەست وەزارەتی مەعاریفیش نووسراوی لە ١٣١١/١١/٢٥ی کۆچی کردووە و ئەوەی روونکردۆتەوە کە دەبێ لیژنەیەک پێکبهێنرێت بۆئەوەی بەو نامیلکەیەدا بچێتەوە و پاشان ئامادە بکرێ بۆ چاپ(١٥).

لە نووسراوێکی دیکەی فەرمانگەی کاروباری

**دەوڵەتی عوسمانی لە فکر و ڕامان و هەڵسوکەوتەکانی عەبدولمەجید بە گومان بووە و ترسی لێ هەبووە، بۆیە ویستوویانە بەهۆی دامەزراندنی وەك فەرمانبەر ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزنەوە هەتا دەست لە شتی تر هەڵنەقورتێنێ.**

ناوخۆ لە بابی عالی، کە مێژووی ١٣١٤/٧/٢٩ی کۆچی بەسەرەوەیە، ئاماژە بەوە دەدات کە عەبدولمەجید مەستی ئەفەندی خەڵکی موسڵ بۆ شاری دیاربەکر دوورخراوەتەوە و وەک فەرمانبەریش بۆ ئەو شارە کارەکەی گوازراوەتەوە(١٦).

لە نووسراوێکی دیکەی بەشی مەکتووبی قەڵەمی سەدارەت کە بۆ وەزارەتی ناوخۆ نێردراوە و مێژووی ١٣١٦/١/١٤ی کۆچی بەسەرەوەیە، هاتووە کە؛ عەبدولمەجید بەرقی مەستیزادە لە دیاربەکر نیشتەجێیە و ئێستا تووشی نەخۆشی قورحە بووە و ناوبراو خزمەتێکی زۆری سەربازی هەیە و شایانی ئەوەیە لوتفی بەرامبەر بکرێ و ڕۆژانەیەکی بیست قرووشی بۆ ببڕدرێتەوە، چونکە بێ حەد هەژار و نەدارە و زۆر پێویستی بەو پارە هەیە خانەوادەکەشی چەند کەسێکن و ئێستا هیچ کارێکی نییە(١٧). نووسراوەکە دوو لاپەڕەیە و بەگوێرەی بڕیار و یاساکان هەوڵی ئەوەی داوە کە شەرعییەت بەوە بدات کە پێویستە یارمەتی ناوبراو بدرێ.

هەر دەربارەی ئەم مەسەلە، لە نووسراوێکی دیکەدا کە مێژووی ١٣١٦/٣/٧ی کۆچی بەسەرەوەیە، ئاماژە بەوە دراوە کە عەبولمەجید بەرقی بەدەلی سەربازی خۆی داوە و بەوهۆیەوە عەلاوە هاتۆتە سەر ڕۆژانەکەی کە بیست قرووشە(١٨).

هەر بۆ ئەو زیادکردنە و جێگیربوونی ڕۆژانەکە نووسراوی لیژنەی باڵای چاکسازیی دارایی لە ١٣١٦/١/١٢ی کۆچی و نووسراوی وەزارەتی ناوخۆ ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەو بیست قرووشەی ڕۆژانەی عەبدولمەجید بەرقی لە بودجەی ساڵ بە ٧٣٠٠ قرووشی ساڵانە حسێبی بۆ کراوە(١٩). هەر سەبارەت بەم یارمەتییە بۆ عەبدولمەجید بەرقی لە هەمان ساڵدا چەند بەڵگەنامەیەکی تر هەن، بە پێویستمان نەزانی باسیان بکەین.

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا کە مێژووی ١٣٣٠/٣/٢٣ی کۆچی لەسەرە، نامەیەکی عەبدولمەجید بەرقی تێدایە بۆ سەدارەتی ناردووە و تێیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە شکایەتی لە سەرۆکی جەندرمەکان هەیە و دیارە شەو هاتوونە سەریی و دەرگا و پەنجەرەی ماڵیان شکاندووە(٢٠). جێی باسە ئەو کاتە عەبدولمەجید ئەفەندی موديری تەحریراتی شاری سینۆپ بووە و ناوی خۆی بە سلێمانیەلی بەرقی نووسیوە.

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا کە مێژووی ١٣٣٦/٨/١ی کۆچی بەسەرەوەیە، وەزارەتی

ناوخۆ لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی سینۆپ عەبدولمەجید بەرقی ئەفەندی بە مووچەی ١٢٥٠ قڕووش دادەمەزرێنێتەوە(٢١). دیارە پێشتر لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی ئورفا بووە و بەوبۆنەوە بەڵگەنامەیەک هەیە کە مێژووی (١٣٣٦/٦/٢٠ک/ ١٩١٨/٤/٢ز) بەسەرەوەیە، تێیدا ئاماژە بەوە دراوە عەبدولمەجید بەرقی ئەفەندی لە بەڕێوەبەرایەتی زۆر و ئورفا تەنیا دوو مانگی ماوە و دواتر تەنسیب دەبێت لە سینۆپ(٢٢).

بەرهەمێکی چاپنەکراوی:

لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ٨ی رەبیعی یەکەمی ١٣١٢ی کۆچی لەسەرە، والی موسڵ نووسراوی بۆ وەزارەتی مەعاریف کردووە و تێیدا ئاماژەی بەوە داوە عەبدولمەجید بەرقی مەستی ئەفەندی ئەم جارەیان نامیلکەیەکی بەناوی (ناش) نووسیوە و داوا دەکات چاپی بکات، ئەگەرچی لیژنەی مەعاریفی موسڵیش بینیویەتی و ڕاپۆرتەکەی ئەوانیش هاوپێچ دەکەین، ئەویش داوا دەکات ئەنجومەنی پشکنینی نێو وەزارەتی مەعاریف هاوکاری بکات.

لە لاپەڕەیەکی دیکەی نێو دۆسیەکەدا ئەوە دیاردەکەوێت کە وەزارەتی مەعاریف وەڵامی ویلایەتی موسڵی داوەتەوە و ئاماژەی بەوە داوە کە ئەو کتێبە لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەت ناگونجێ و مۆڵەتی چاپی پێ نادەن و دەیگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکەی(٢٣).

ئەوەی لەم بەڵگانە دەرکەوت، ئەوەیە عەبدولمەجید مەستی نووسەر و ئەدیبێکی لێهاتوو بووە و وەک باوکی بەهرە زیرەکییەی هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی باوەڕی پێی بووە دەریبڕیوە و خستویەتییە سەر کاغەز و لەوپێناوەشدا باجی بیروبۆچوونەکانی خۆی داوە. بەداخەوە زۆر گەڕاین ساڵی وەفاتیمان نەدۆزییەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە تا ساڵی ١٩١٨ واتە نزیک بە پەنجا ساڵی تەمەنی هەر لە ژیاندا بووە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١ دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ساغکردنەوە و شەرحی: شکور مستەفا، بڵاوکراوەی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٣١.

٢ لە بەڵگەنامەکاندا عەبدولمەجید، هەروەها مەجیدیش هاتووە.

٣ لە سەردەمی عوسمانییەکاندا زۆربەی هەرە زۆری کارمەندەکانی دەوڵەت نازناویان هەبووە، لە بەڵگەنامەکاندا (بەرقی) لەگەڵ ناوی عەبدولمەجید هاتووە و هی باوکیشی نازناوی (مەستی) لەگەڵ هاتووە.

٤ بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەمە، زۆر گەڕاین هیچ بەڵگەنامەیەکمان لەو بارەدا نەدۆزییەوە.

٥ شارێکە کەوتۆتە باکووری تورکیا نزیک دەریای ڕەش.

6 DH.SAİDd.00171
7 BEO.000755.056614.003
8 BEO.000755.056614.004
9 BEO.000755.056614.005
10 BEO.000755.056614.008
11 BEO.000198.014811.001
12 ZB.00450.00010.001
13 BEO.000417.031257.002
14 BEO.000417.031257.003
15 BEO.000417.031257.004
16 BEO.000890.066723.002
17 BEO.001136.085159.001
18 BEO.001165.087313.001
19 BEO.001170.087684.002
20 DH.İD.00159.1.00001.002
21 DH.ŞFR.00087.00120.001
22 DH.ŞFR.00086.00037.001
23 MF.MKT. 242 - 26



# ماموستا مەلاعەبدوڵڵای ئەحمەدییان

## (١٣١٢ ـ ١٣٨٣ی هەتاوی)



نووسینی:
محەمەدی ئەحمەدییان

پێش ئەوە وتارەکەم دامەزرێنم پێویستە بڵێم، ناساندنی هەر کەسایەتێک لەلایەن بنەماڵەی خۆی، ئەو گومانە ساز دەکا، بە هۆی نزیکایەتی ڕاستی بکەوێتە پەراوێز و لەمپەرێک سازبێ بۆ ناساندنی ڕاستەقینەی ئەو کەسایەتییە، بە پێویستی دەزانم تەمی ئەو گومانە بڕەوێنم، ئەوەندەی ئاگادارم لە سەر ژیان و چالاکی و تێکۆشانی خوداڵێخۆشبووی بابم، وەک خۆی بینووسم.

مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەدیان، کەسایەتی زانا و توانا و ئیسلامناس و بیرمەند و شوناس خواز و ڕووناکبیری کورد، ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی لە ئاوایی «دەرمان» لە ڕۆژهەڵاتی مەهاباد هاتۆتە دنیا، ژیانی مامۆستا بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

قۆناغی یەکەم: ساڵی ١٣١٨ لەلای مامۆستای ئاوایی «کانیڕەش» مەلا سەید هاشمی حوسێنی سەرەتای خوێندنی دەستپێکردووە، ساڵی ١٣٢٤ هاتۆتە مەهاباد، ئەو کاتە تەمەنی سیازدە ساڵ بووە لە مزگەوتی هەباساغا بۆتە فەقێ لەلای مامۆستا مەلاسادق ، ئەو ساڵە لە مەهاباد کۆماری کوردستان دامەزراوە، بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب بە زمانی کوردی تاقەی حوجرەی فەقێکانی مەهاباد دادەگرێت، بە بەر خوێندنی حوجرە، بڵاوکراوە کوردییەکان دەخوێنێتەوە، فەقێ عەبدوڵڵای تامەزرۆی خوێندن و خوێندنەوە لەو دەرفەتە بە باشی کەڵک وەردەگرێت، ئەو بارودۆخە شوێن لەسەر بیر و هەستی دادەنێت، دواتر ڕوو لە حوجرەکانی تری ناوچە دەکات، سەرەتا دەگەڕێتەوە کانیڕەش و دواتر لە تازەقەڵا و بۆکان و بالکی مەریوان و حەمامیان لەلای زانایانی ئەو کات، وەک: مامۆستا شێخ عیزەددینی حوسێنی لە کانیڕەش/ ساڵی ٢٨ تا ٢٩، لە لای مەلامحەممەدی وەلزی لە تازەقەڵا/ ساڵی ٣٠، لەلای مامۆستا مەلاعیسامەددینی شەفیعی لە بۆکان/ ساڵی ٣٠، لەلای مامۆستا مەلاباقر لە بالک/ ساڵی ٣١، لەلای مامۆستا مەلاعەلی وەلزی لە حەمامیان/ ساڵی ٣٢ بەرنامەکانی خوێندنی حوجرە وەک مەنتیق و بەیان و مەعانی و بەدیع و کەلام و فەلسەفە و ئوسوول و تەفسیر و هەیئەت و ئەستێرەناسی و ڕیازیات دەخوێنێ، تەنانەت زانستی ڕوبع و ئوستوڕلاب، کە ئەوکات کەمتر دەخوێندرا، ئەو زانستەش بە باشی فێر دەبێت. سەبارەت بە فێربوونی ئەو زانستە مامۆستا ئەحمەدیان نووسیویە: «در سال ١٣٣٢ قواعد استعمال جعبەی اسطرلاب و ربع را در محضر استاد عصر ملاعلی ولزی حمامیان یاد گرفتم» (احمدیان، عبدالله، قبلەی محمد، ١٨)

ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی «ساڵی موسەددیق» لە خزمەت مامۆستا «مەلاعەلی وەلزی» لە «حەمامیان» ئیجازەی ئیفتا و تەدریس وەردەگرێت، هەر ئەو ساڵە مامۆستا مەلاباقر ئیجازەنامەی تایبەتی بۆ دەنووسێت، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا سەفەری بەغدا دەکات، لە بەغدا دەچێتە خزمەت زانا و ڕووناکبیری ناوداری کورد مامۆستا «مەلامحەممەدی قزڵجی»، ماوەیەک لە زانستی ئەو زانایە کەڵک وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ موکریان.

قۆناغی دووەم: لە ساڵی ٣٢ تا ساڵی ٥١ی هەتاوی مامۆستا ئەحمەدیان لە گوندەکانی کوردستانی ئێران خەریکی تەدریس و ئەرکی مەلایەتی بووە، ماوەی بیست ساڵ بە هێز و توانایی و وزەی تەواو لە گوندەکانی «زەنبیل/ ٣٣، باغڵووجە/ ٣٤، شێخاڵی/ (جاری هەوەڵ) ٣٥ – ٣٧، قۆزلوێ گەورک / ٣٨- ٤٦، شێخاڵی/ (جاری دووەم ٤٦- ٥١) ئەرکی مەلایەتی و تەدریسی لە ئەستۆ بووە. پێویستە ئاماژە بەو خاڵە گرنگە بکەین، ئەو کاتە و ئەو سەردەمە مامۆستا ئەحمەدیان لەو گوند و دێهاتانە مودەڕڕیس بووە، بە «مەلا عەبدوڵڵای بۆکانی»و «مەلا عەبدوڵڵای ڕەهنوما» ناسراوە، ئەو ماوە مامۆستا ئەحمەدیان لە بواری تەدریسی ئەو زانستانەی ئەوکات مەلاکان دەیانخوێندن زۆر چالاک بووە و تەواو

خۆی ماندوو کردووە، زۆری شایی بە حوجرە و فەقێکانی بووە، لەو قۆناغەدا خۆی لە هەر ئیش و ئەرکێکی تر بواردووە، قورسایی ئەرکەکانی خستۆتە سەر تەدریس و تا ڕادەیەک تەئلیف، تەدریسی زانستە باڵاکان وەک ئوسووڵ و کەلام و فەلسەفە و حیکمەت و هەیئەت و تەفسیر. بیست ساڵ تەدریس هەر مەلایەکی ئاسایی ئاڵوگۆڕ دەکات، چ بگات بە مامۆستا ئەحمەدیان کە هەر لە سەردەمی فەقێیەتی زانایی و ئازایی و توانایی پێوە دیار بوو، بێ زیادەڕەوی لە بواری تەدریسی عولوومی دینی لە ناوچەی موکریانی ئەوکات هاوتای زۆر کەم بووە، دەسکەوتی ئەو بیست ساڵە بەرهەمهێنان و پێگەیاندن و ئیجازەدانی دەیان مەلای زانا و توانا و خۆپارێز وەک مەلا محەمەدی بانەیی، دوکتۆر محەممەدی فازیلی، مەلا محەمەدی شێخولئیسلامی (بانە) مەلا سەید سەلامی عەزیزی، مەلا عەزیزی داشبەندی (عەزیزپوور)، مەلا عەلائەددینی نەبی‌زادە، مەلا سەعیدی ڕەسوولی و مەلاعەبدوڕەحمانی ناسری بووە، ئەو ماوە لەگەڵ تەدریس توانی چەند بەرهەمی وەک «تاریخ مقدسات اسلام»، «تعیین اوقات شرعیه»، «اوزان الشرعیه و العرفیه»، «جدول مشکلات بیضاوی» بنووسێت.

قۆناغی سێیەم: لە ساڵی ٥١ تا ٨٣ی هەتاوی – مامۆستا ئەحمەدیان لەسەر داوا و ویستی «ئیدارەی ڕادیۆی تەلویزیۆنی مەهاباد» کە تازە دەستی بەکار کردبوو، بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەی ئایینی و ئەدەبی پاییزی ساڵی ٥١ی هەتاوی ماڵی هاتە مەهاباد، مامۆستا تا ئەو کاتە وەک مودەڕڕیس و دەرس‌وێژی حوجرەکان دەناسرا، لەوکاتەوە شێوەی ئیشوکاری مامۆستا ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی بەسەر داهات، ئەوجار بوو بە نووسەر لە ڕادیۆ لە بواری ئایینی و ئەدەبی بە زمانی کوردی، ئەو کات ڕادیۆ وەک میدیایەکی گشتی شوێنی تەواوی هەبوو لەسەر ژیانی ڕۆژانەی خەڵک. ماوەی هەشت ساڵ ئەو ئەرکەی بە شێوەیەکی پوخت و پاراو ئەنجامدا، هەموو ڕۆژێک لەکاتی دیاریکراو دەنگی مامۆستا لە ڕادیۆ مەهاباد بڵاو دەبۆوە.

هاوکات لەگەڵ ئەو ئەرکە ماوەی ٣٠ ساڵ مەلا و مودەڕڕیسی «مزگەوتی قیبلە»ی مەهاباد بوو، تا دوایین ساڵی ژیانی فەقێکان هەر لە دەورەی بوون. لە مزگەوتی قیبلە چەند فەقێی زانا و زیرەکی ئیجازەدا، لەگەڵ ئەو ئیش و ئەرکانە ماوەی ٢٥ ساڵ مامۆستای قوتابخانە ناوەندییەکانی مەهاباد بوو. پێ بەپێی ئەو ئەرکانە بۆ دەستخستنی بڕوانامەی بەرز هەوڵیدا، دوای ئەوە ساڵی ٥٦ی هەتاوی دیپلۆمی لە بەشی ئەدەب وەرگرت، ساڵی ٦٧ لە زانستگای تاران دوای چەند قۆناغ تاقیکاری «سەتحی سێی زانستی» بەرامبەری ـ دوکتورای ئیلاهیات-ـ ی وەرگرت، دوای ئەوە لە ساڵی ٧٢ تا ٨٢ لە زانستگای ئازادی مەهاباد مامۆستا بوو.

ئەوەی پێویستە لەبیر نەچێت، مامۆستا دوو ساڵ ٥٩ – ٦١ ئیمام جومعەی مەهاباد بوو دوای دوو ساڵ وازی لەو ئەرکە هێنا. مامۆستا هۆی وازهێنانی لەو چەند دێڕەدا بۆ هاوشاریانی ڕوونکردەوە: «... بدون اینکه از خود تعریف کنم در گول سالها تدریس و مطالعه، اندوختەی نسبتا مناسبی را در رابطه با تفسیر و شرح احادیث و تشریح مسایل دینی و دفاع از حریم مقدس اسلام ذخیره کردەام، اگر به جمع و تدوین و تحریر انها نپردازم مطمئنا سیل حوادث و فرارسیدن مرگ زحمات دهها سالەی من را بی‌فایده و اثر می‌گذارد، مصلحت این است که به این امر ضروری و فوتی بیشتر بیندیشم... ١٣٦١/٧/٢٠» بە دوای ئەو «استعفانامه»یە ماوەی دوو ساڵ (٦٢-٦٣) بۆ تاراوگەی دامغان دوورخرایەوە.

مامۆستا ئەحمەدیان هەر لەوکاتەوە لە تاراوگە بوو تا دوایین ڕۆژەکانی تەمەنی – بیست ساڵی تەواو- لە ساڵی ٦٢ تا ٨٢ی هەتاوی بە ورەو هێز و توانایی تەواو بۆ نووسین و کتێب دانان

و لێکۆڵینەوە شانی داخست، توانی لەو ماوەدا سی بەرهەمی بەپێز بنووسێت، هەریەک لەو بەرهەمانەی بۆ مەبەستی تایبەت ئامادەی چاپ کرد، تا ئێستا بیستوسێ بەرهەمی مامۆستا چاپ و بڵاوکراونەتەوە، زۆر لەو بەرهەمانە بە چاپی سێ و چوار و پێنج و تەنانەت چاپی هەشتەم گەیشتوون. جیا لەو بەرهەمانە، نزیک بە دووسەد وتاری ئەدەبی و لێکۆڵینەوەی مامۆستا بە زمانی فارسی و کوردی لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە. نووسەری ئەو وتارە بابەتێکی لەسەر ژیان و ئاسەواری مامۆستا لەژێر ناوی «زندگی و اثار علامە ملا عبدالله احمدیان» بە فارسی لە ١٥٩ لاپەڕەدا نووسیوە، هەروا لەلایەن بەڕێز «محمد کاوە بال‌نور» پایان‌نامەی فەوقی لیسانس لەژێر ناوی «شرح احوال و اثار استاد عبدالله احمدیان» لە ١٩٨ لاپەڕەدا نووسراوە و لەلایەن زانستگای ئازادی مەهاباد بڵاوکراوەتەوە. هەروەها بەهاری ١٣٩٥ی هەتاوی لەلایەن بەڕێز «ناسری عەلیار» لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بەناوی «تحلیلی بر افکار و اثار علامە ملا عبدالله احمدیان» لە (٣٠٢) لاپەڕە لەلایەن چاپەمەنی «ئاڵای ڕووناکی» بڵاوکراوەتەوە.

سەرئەنجام مامۆستا ئەحمەدیان دوای تەمەنێک ئەرک و تێکۆشان و ماندوو بوون لە ڕێی زانست و ئەدەب و ئەندیشە بەداخەوە لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ ئەم دنیایەی بەجێهێشت، لە گۆڕستانی بداغ سوڵتانی مەهاباد لە تەنیشت گڵکۆی دوو زانای پایەبەرزی مەهاباد مامۆستا مەلا حوسێنی مەجدی و مامۆستا مەلاکەریمی شاریکەندی ئەسپاردەی خاک کرا.

**تایبەتمەندی مامۆستا ئەحمەدیان:**

بەڕێز «ناسری عەلیار» نووسەر و لێکۆڵەری بواری ئایینی بابەتێکی لەسەر کەسایەتی و بەرهەمەکانی مامۆستا ئەحمەدیان وەک کتێب لەژێر ناوی «تحلیلی بر افکار و اثار علامە ملا عبدالله احمدیان» بڵاوکردووەتەوە، لێرەدا بە دەرفەتی دەزانین بەشێکی کورت لەو لێکۆڵینەوە بەربڵاوە بێنینە بەرچاوی خوێنەری ئەو بابەتە:

«با وجود مقالات و یادداشتها و پیامهای متنوع در مورد شخصیت استاد ملاعبدالله احمدیان و اثار پربار و پرشمار ایشان، هنوز بررسی جنبه‌های مختلف اثار و افکار نامبرده به ضرفیت واقعی خویش نزدیک نشده است، به ویژه بعد علمی و تحقیقی شخصیت ایشان دقیقا شناخته نشده است. کسی که متصف به چندین صف بودند: متفکر، فقیه، متکلم، مفسر، نویسنده به سه زبان (فارسی، کردی، عربی)، ادیب و خطاط و... متخصص در علوم اسلامی، یادکردن و جایگاه او را نشان دادن کار اسانی نیست، بلکه سزاوار اهتمام دانشی مردان غمخوار است به ویژه در ایران و بطور اخص در کردستان عزیز.

استاد احمدیان با سران و رهبران جریان دینی خرافات ستیز و به قولی «نوگرایان» در میان علمای کرد، اشنایی و تماس نزدیک داشت. کتابهای ایت‌الله مردوخ را که همه‌جا پراکنده بودند خواند، از شاگردان شێخ عزالدین حسینی بود، با ملا هادی افخم‌زاده نیز ملاقاتهایی داشت و تأثیراتی گرفته بود، به شوق تعلم در محضر چهره‌هایی از همین دست راهی بغداد شد تا در خدمت استاد ملا محمد قزلجی تلمذ نماید.

اشنایی استاد احمدیان با اثار دانشمندان اصلاح طلب عالم اسلام به ایام طلبگی او برمی‌گردد، از جمله اشنایی با اثاری چون تفسیرالمنار، تفسیرالمراغی و تفسیر فی ضلال و کتابهایی چون «حیات محمد» و «روح الدین الاسلامی» که در بین علمای کرد رواج پیدا کرده بودند، اما علاقەی استاد احمدیان به «رساله التوحید» اثر شیخ محمد عبده داستان دیگری دارد، حتی استاد ملا هادی افخم‌زاده که به کثرت مطالعه و تتبع شهرت داشت، نقل می‌کرد

اولین بار که با «رساله التوحید» اشنا شدم در منزل ملا عبدالله احمدیان بود.

استاد احمدیان در زمینەی جریان سنتی اهل تصوف دیدگاه ویژەای داشت، در ێن دوره بسیاری از اساتید علوم اسلامی خلیفه و مرید یا حداقل منسوب مشایخ و طریقتها بودند، اشهر و اعلم انها جناب ملا محمد باقر مدرس مریوانی مشهور به «ملا باقر بالک» بود که اتفاقا اخرین استاد استاد احمدیان بودند، استاد احمدیان به دلیل داشتن ذهن فعال و عقلانی و بر اساس مبنای معرفت دینیاش با این نحله میانەای نداشت، اما تا اواخر عمر به انحاو مختلف با گرفداران ان روش مدارا نمود، به جای ضدیت سخت و کوبیدن صرف، فهمیده بود انتقاداتش را از چه زاویەای متوجه انها سازد که در لابلای کتابها و رسالات و چکامەهایش بەچشم میخورد.

استاد احمدیان با اینکه جریانات فکری و حوادث سیاسی و اجتماعی بسیاری را از سر گذرانده بود، با نحلەی خرافاتستیزان بیش از همه همدلی نشان داد، اما در برابر هیچ جریانی مستقیما جبههگیری نکرد و به گفته مشهور نه پیشاهنگ نضم نوین بود، نه پاسدار نضم کهن.

استاد احمدیان برای انجام اهداف علمی و فرهنگی خود هم اخلاص داشت و هم از بسیاری از مزایا و جاهای گرم و نرم صرفنظر کرد. او حرمت عالمانەی خود را حفظ کرد و در کنار مردم ماند و با دست و زبان و قلم، با افکار پوچ و مظالم اجتماعی ستیز نمود. کسی چون استاد احمدیان که مدرسین و علمای درجه اول کرد از ملا عصام الدین شفیعی و ملا باقر بالک و ملا حسین مجدی و ملا محمد ولزی و ملا هادی افخمزاده و ملا شیخ عزالدین حسینی و ملا عبدالکریم شهریکندی و مدرسین بعد از انها، همه زبان به مدحش گشوده بودند، ایا همچون کسانی را میتوان با استاد احمدیان مقایسه کرد که نه تنها مردم کردستان، بلکه اهل سنت ایران بر خوان فضل او نشستەاند.»

لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لە پەنجا وتار و بابەت و لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ و پایاننامە لەسەر کەسایەتی و ئاسەواری مامۆستا ئەحمەدیان نووسراوە، بەڵام لەبەر فرە ڕەهەندی و چەند بوعدی بوونی کەسایەتی مامۆستا، ئێستاش زۆر لایەنی باس نەکراوە و زۆر باری وای هەیە ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە.

### بەرهەم و شوێنەواری مامۆستا ئەحمەدیان:

جیا لە ئەرک و چالاکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و تەدریس، سی بەرهەمی بە زمانی فارسی و کوردی و عەرەبی پێشکەش بە کۆمەڵگەی خۆی کرد، ئەو بەرهەمانە بیست و هەشت بەرهەمیان «تەئلیف» و دوو بەرهەمیان «رساله التوحید»ی شێخ محەممەد عەبدە و «مختصر علم القران»ی سیوتی وەرگێڕانە لە عەرەبییەوە بۆ فارسی، لەو سی بەرهەمە، هەژدە بەرهەمی بە زمانی فارسی، یازدە بەرهەمی بە زمانی کوردی، بەرهەمێکی زۆر بەپێزی بە عەرەبی نووسیوە. جیا لەو بەرهەمانە، دە بەرگ بەرنامەی ڕادیۆیی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە کە نزیک بە چوارسەد بەرنامەی ئایینی و ئەدەبی لەخۆ دەگرێت. مامۆستا لە چەند بواری جیاواز دەستی بۆ قەڵەم برد و دەسەڵاتی زانینی خۆی لەو بوارە دا ئاشکرا کرد بۆ وێنە:

- «الایضاح»ی بە زمانی عەرەبی لەسەر گرێ وگۆڵی تەفسیری بەیزاوی نووسی.
- تەفسیری سوورەی «فاتیحا» و «یاسین» و بەشێک لە «بەقەرە»ی جیاجیا بە زمانی کوردی.
- کتێبی «قرانشناسی» بە فارسی.
- «مختصر علم القران»ی سیوتی وەرگێڕاوەتە سەر فارسی.
- «تاریخ ضبط و ثبت احادیث» بە فارسی.
- «حدیثشناسی» بە فارسی.
- «رساله التوحید» نووسراوی شێخ محەمەد

عەبدەی لە عەرەبییەوە بۆ فارسی وەرگێڕا.

- «کلام اهل سنت» بە فارسی.
- «کلام جدید» بە فارسی.
- «درامدی بر خداشناسی» بە فارسی.
- لە بواری «تاریخ» کتێبی « مقدسات اسلام تاریخ اماکن متبرکه»، «سیمای صادق ابوبکر صدیق»، «سیمای صادق فاروق اعظم»، «تجزیه و تحلیل زندگی امام شافعی» بە فارسی نووسیوە، «سیمای صادق فاروق اعظم».
- لە بواری «فقه» کتێبی «تحقیقات» و «بسوی جهان جاویدان»ی بە فارسی.
- بەشی شیعر: «هەست و هاوار» بەرهەمی هەستی شاعیرانەی مامۆستا ئەحمەدیانە، بەشێک لە شیعرەکانی ـ نەک هەموویان ـ.
- بەشی پەخشانی کوردی: کتێبی «خەزێنە» سی وتاری ئەدەبی و مێژوویی، چاپ و بڵاوکراوەتەوە.
- بەشی «نثر مسجع کردی» لە توێی بەرهەمێک بەنێوی «موناجاتی مەلا عەبدوڵڵا» بڵاوکراوەتەوە.

جیا لەو بەرهەم و بابەتە سەربەخۆیانە، دووسەد وتاری ئایینی و ئەدەبی و مێژوویی و لێکۆڵینەوەی جیاجیا بە بۆنەی جۆراوجۆر بە کوردی و فارسی لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراوەتەوە. لەگەڵ ئەوانە خەزێنەیەکی تر لە دەنگی مامۆستا لە توێی سەد و شەست وهەشت وتاری ئایینی و ئەدەبی تۆمار کراو بە دەنگی بەهەست و سۆزی مامۆستا لەسەر «سی. دی» لەبەردەستدایە.

تەفسیر نووسینی مامۆستا ئەحمەدیان:

مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان وەک زانایەکی توانا لە بواری تەفسیر کە ڕای سەربەخۆ و جیاوازی بۆ شرۆڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هەبوو، ئاواتی ئەوە بوو قورئان بە زمانی کوردی تەفسیر بکات، ئەو ئاواتەی لە پێشەکی تەفسیری سوورەی فاتیحا بەوشێوە ڕەنگیداوەتەوە:

«لەبەر خودا دەپاڕێمەوە یارمەتیم بدا تەفسیری ئەو سوورەتە «فاتیحا» تەواو بکەم، دەپاڕێمەوە تەفسیری ئەو سوورەتە بکاتە پێشەکی بۆ تەفسیر کردنی تەواوی قورئان بە کوردی [بەو هیوایە] ئەو ڕۆژە بێ کە هەموو قورئان بە کوردی تەفسیر بکەم، دیارە لە کەرەمی خودا هەموو دوورێک نزیکە و هەموو گرانێک ئاسانە» (تەفسیری سوورەی فاتیحا، مامۆستا مەلاعەبدوڵڵا ئەحمەدیان، ل ٨، انتشارات رهرو، مەهاباد)

بەڵام زۆرجار خواستی خودا و ویستی ئێمە یەکتر ناگرنەوە، یان بڵێین تەقدیر، تەگبیر هەڵدەوەشێنێتەوە، دوای چەند جار دەستپێکردن و لێبڕان بۆ نووسینی ئەو تەفسیرە، بەداخەوە ئەو پڕۆژە هەر بە نیوەچڵی مایەوە، لەگەڵ ئەوە بۆ نووسینی زۆر چێ بوو، بەڵام ئەو ئاواتە بەتەواوی نەهاتە بەرهەم و نەهاتە بەرهەم! ئەرکی ڕۆژانە و ئیشی مەلایەتی و دەرسی فەقێ و تەدریسی قوتابخانە و زانستگا و نووسینی ئەو کتێب و ئەم وتار حەڤدە ساڵ، لە ساڵی ٦٥ تا ٨٢ درێژەی کێشا، وەک ئەوە «جەبر»ێک لەکار دابێ بۆ ئەوە پێنووسەکەی لێوەرگرێت و ئەو ئەرکە مەیسەر نەبێت، یان هەرچی نێوی بنێین هێزێک عەمدێک، قەدەرێک، قەزایەک، خێراخێرا قەڵەمەکەی پێ لەسەر تەفسیرەکە دادەنا و کارەکە نێوبڕ دەبوو. بەکورتی دوای حەڤدە ساڵ مامۆستا ئەحمەدیان توانی لەسەر نووسینی تەفسیری قورئان بە کوردی سێ قۆناغ ببڕێت:

قۆناغی یەکەم: پڕۆژەی «تەفسیری سوورەی یاسین» ساڵی ١٣٦٥ی هەتاوی لە (٢٣٧) لاپەڕەدا.

قۆناغی دووەم: نووسینی «تەفسیری سوورەی فاتیحا» ساڵی ١٣٧٣ی هەتاوی لە (٨٣) لاپەڕەدا.

قۆناغی سێیەم: نووسینی «تەفسیری فاتیحا» بە کورتی لەگەڵ نووسینی تەفسیری ١٧٧ ئایەتی سوورەی بەقەرە لەژێر ناوی «تەفسیری ڕۆژ» لە دووتوێی (٢٤٥) لاپەڕەدا. بەڵام تەمەن مەودای نەدا مامۆستا ئەو ئەرکە بە تەواوی بگەیەنێتە دوایین قۆناغ، بەداخەوە ئاواتی تەواوکردنی ئەو تەفسیرە نەگەیشتە ئەنجام.

**مامۆستا ئەحمەدیان و بواری شیعر:**

دەرس خوێندنی مامۆستا لە حوجرەکانی موکریان و فەقێ بوون و پەروەردە بوونی لە مەهاباد لەو کاتەدا «ساڵی ١٣٢٤» کە چەند رۆژنامە و گۆڤاری کوردی لەو شارەدا بڵاودەکراوە، هەروا خوێندنی ئەو زانستانەی پێوەندییان بە ئەدەب و شیعر هەیە وەک بەیان و بەدیع و عەرووز و قافیە و مەعانی، هەروەها خوێندن لە خزمەت مامۆستای وەک «مەلا عیسامەددین شەفیعی»، مەلا عیسامەددین جیا لە تەدریسی زانستی ئایینی، هەستیار و شاعیرێکی بە توانا بووە، دوای ئەوە دەیان جار تەدریسی کتێبی وەک «موختەسەر» و «موتەووەل»، هەروەها دۆستایەتی لەگەڵ شاعیرانی ناسراوی موکریان وەک «سەید کامل – ئاوات» و «عەبباسی حەقیقی» و «خالید ئاغا حیسامی – هێدی» و «محەمەدی نووری– عەتری گلۆڵانی» و نامە گۆڕینەوە لەگەڵ مامۆستا هەژار و هێمن و نزیکی مامۆستا لە کۆڕ و کۆمەڵی رۆشنبیری کورد و هاوبەشی لە کۆنگرە و سیمینار و کۆبوونەوە ئەدەبییەکان، هەمووی ئەوانە و هەست و خوستێکی سروشتی شاعیرانە، بوونە هۆی ئەوە کە مامۆستا ئەحمەدیان وەک کەسایەتییەکی هەستیار کۆمەڵێک شیعری جوان و رێکوپێک بخاتە نێو کتێبخانەی ئەدەبی کوردی، بەڵام لەگەڵ ئەوە خاڵێکی جێی تێبینی ئەوەیە، مامۆستا زۆرتر سەرقاڵی تەدریس و لێکۆڵینەوە بووە، وەک پێویست یان بڵێین وەک شاعیرێک راستەوخۆ نەیپەرژاوەتە سەر شیعر و شاعیری، لەبەرئەوە زۆر کەس لەو بوارە لە ئەرک و تێکۆشانی مامۆستا ئاگادار نییە، بۆیە بە پێویستم زانی ئاورێک لە بۆچوونەکانی مامۆستا سەبارەت بە شیعر و ئەدەب بدەمەوە، هەروا چەند وێنەیەک لە شیعری مامۆستا بخەمە پێش چاوی خوێنەر.

بەشێک لە شیعرەکانی مامۆستا ئەحمەدیان لە دیوانێکدا بهناوی «هەست و هاوار» لە چاپ دراون. لە پێشەکی ئەو بەرهەمە مامۆستا بابەتێکی چڕوپڕ لە سەر مەبەستی شیعر و جیاوازی شیعری کۆن و نوێ بە زمانێکی پاراو باس دەکات، ئەو قالبانەی مامۆستا شیعری لە سەر داناون، بریتین لە مەسنەوی و غەزەل و قەسیدە و دووبەیتی نوێ یان «چوارپارە»، زۆربەی غەزەلەکانی مامۆستا هەتا ئەم دواییانە بڵاو نەکراونەتەوە، نۆ غەزەلی مامۆستا لە گۆڤاری مەهاباد ژمارە (١٦٠) بڵاوکراونەتەوە، نیوەرۆکی شیعرەکانی مامۆستا زۆرتر پاڕانەوە و ئامۆژگاریی و باسی ئازادی و یەکگرتن و رەخنەی کۆمەڵایەتین.

مامۆستا ئەحمەدیان لەناو بەرهەمەکانی لە چەند جێگە باسی شیعر و شاعیری دێنێتە پێش، دیارە بۆچوون و رای تایبەتی مامۆستا سەبارەت بە شیعر دەستنیشان دەکەن، لە تەفسیری سوورەی یاسین کاتێک مامۆستا ئەو ئایەتە تەفسیر دەکا «**وَمَا عَلَّمْناهُ الشِّعرَ**» لە سەر بابەتی شیعر و شاعیری دەدوێ و زۆر بە وردی باسی هێزی شیعر و دەسەڵاتی شاعیر دەکا. لە وتارێکدا سەبارەت بە شیعر بەو چەشنەی نووسیوە:

«شیعر شعوورێکی بەرزترە لە شعووری ئاسایی و هەست و خوستێکی تیژتر و بە برست ترە لە هەست و خوستی تێکرایی، شیعر توانیویەتی لە دیمەنی هێزێکی زۆر بە گوڕم هەمیشە حوزوری خۆی لە مەیدانی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکان نیشان بدا...» (سروە، ١٩١، ل١٨، کۆڕی پرسەی مامۆستا هێمن)

مامۆستا ئەحمەدیان لە وتارێکدا نووسیویە:« بیری شاعیری ئێستا، ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە، شاعیری ئەورۆ لەباتی ئەوە ئاخ هەڵکێشێ و لەسەر شینکاڵی دم جۆگەیەک گلێنەیەک ئارەقی خەست هەڵقوڕێنێ و ببێتە خاکی بەرپێی شۆخێک، ئەوجار ئاواتی ئەوەیە کە هەورێک ژەهری هەلا بە قوڕقوڕۆچکەی ستەمکاران دا بکا و دەستی قەڵشیوو بە پەرۆ بەستراوی زەحمەتکێشان ماچ کا،

یان لەباتی ئەوە بە خاڵی ڕەشی دڵبەرێک هەڵبلێ، دەکڕوزێتەوە بۆ ئەو هەزار دڵانەی کە بوونە سووتووی ئاوری زۆر و زێفی دەسەڵاتدارەکان...» (خەزێنە، کۆمەڵە وتار، عەبدوڵڵا ئەحمەدیان، ل١٨٠)

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەو بابەتە بدەمە دەست شاعیر و هەستیارێکی ئاگادار لە تێکۆشانی ئەدەبی مامۆستا ئەحمەدیان واتە بەڕێز سەعیدی نەجاری «ئاسۆ». ئەو شاعیرە بەڕێزە لە وتارێکدا بە ناوی «شیعری حوجرە و چەند پێوەرێ لە هەست و هاوار» نووسیویە: «... مامۆستا ئەحمەدیان باشترین فاکت و نموونەیە بۆ شیعری حوجرەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر، واتە شیعری کلاسیکی کوردی، مامۆستا ئەحمەدیان لە سەر شیعرەکانی خۆی ئاوا دەفەرموێت: «ئەو شیعرانە کۆڵێک نین، بەڵکوو لوێچێکن، ئەویش بڕێکیان، چونکە لە تافی شلکی و لاوی دا کوتراون ڕەنگەکانیان ڕەنگی ئێستام کە گەیشتووم ناگرنەوە، هێندێکیان فەقێیانەن نەک شاعیرانە»، مامۆستا لە ترسی زمانی ئەوانەی پێیان وایە شیعر هەر دەبێ باسی شۆڕش و مەی و ئافرەت بکات، خۆی بە «فەقێ» دادەنێ نە شاعیر، لەکاتێکدا ئەو ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە، ئەو وەک زۆربەی شاعیرانی پێشووی کورد «فەقێیەکی شاعیرە». ئەوە چۆنیەتی داڕشتنی شاعیرانەی شاعیرە، کە مەبەستەکە دەکاتە شێعرێکی بەرز و بڵند یان نزم و نەوی، بێ تەعاروف شیعری مامۆستا لە بەرامبەر شیعری شاعیرانی سەردەمی موکریان جێگەیان لای سەرەوەیە و بۆنی تازەگەریشیان لێ دێ.

قاڵبێکی تازە داهاتوو هەیە بەنێوی «دوو بەیتی نوێ» لەنێو فارسەکانیشدا قاڵبێکی تازە داهاتووە و نزیکترین قاڵبە بە شیعری نیمایی و ئەمڕۆ؛ مامۆستا ئەحمەدیان دوو شیعری بە قووەتی لەو قاڵبەدا هەیە کە سەلمێنەری ڕوحی تازەگەری لە شیعر و بیری مامۆستان، ئەو دوو شیعرە لە «هەست و هاوار»دا چاپکراون، «منداڵی باب خنکاو» و «بەرەبەیانی ئاوات»، مامۆستا هەوڵیداوە لە بواری قاڵب و ناوەڕۆکەوە تازەگەری لە شیعری حوجرەدا بێنیتە ئارا، شیعری «منداڵی باب خنکاو» بۆنی قەسیدە حەماسییەکەی «مەهدی حەمیدی» لێ دێ «مغرب سینەمالان قرص خورشید...» بڕوانە سەرەتای منداڵی باب خنکاو چۆن دەستپێدەکات:

**منداڵی باب خنکاو**

**ڕۆژ بە غەزرینی قینی میرغەزەبێ**
**خۆی کوتا ژێر نیقابی هەوری ڕەش**
**دەسیکردە گوڕین و لێقرمان**
**لێی دەبۆوە لە چاوی پۆلووی گەش**
**ماتەمات و لەپڕ دەسی پێکرد**
**تیرەبارانی عەرزی بەستەزمان**
**ڕژنە تیرێکی پڕ بە پێستی زەوی**
**بە هەراوی زەوی هەتا عاسمان**
**چەشنە تیرێکی پاشی ئەنگاوتن**
**نامرێت و لە کار ناوێستێ**
**بەڵکوو هێزیان دەکەونەوە یەک**
**تاکە لافاوی خوێنی سوورهەستێ...**

(هەستوهاوار، ل٩)

مامۆستا ئەحمەدیان دێتە سەر بابەتی شیعری بەرەنگاریی و موقاوەمەت، کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی گەلانی ئێران، لە ڕێبەندانی ساڵی ٥٧ی هەتاوی، لە قاڵبی غەزەل ئەو شیعر پاراوە دەخولقێنێت:

**ڕۆژی ئازادی**

**ڕۆژی ئازادی بە گرفە هەر لەسەر ئاسۆ هەڵات**
**دێوی دیلی کەوتە لرفە و تێیتەقاند و بۆی هەڵات**
**ئەی وڵاتم ئاوەکانت ڕوحی مەن دەبزوونەوە**
**خاکەکەت ئیکسیری ژینە هەر وەکوو زێڕ و تەڵات**
**داری ئازادی چ شینی تۆ بە خوێنی سووری مە**
**لاپەڕی پەرتووکی شۆڕشگێڕە سەر پاکی گەڵات**
**با بڕۆن ئەو کلکە نەفتینانە تۆویان پاوە بێ**
**چارەنووسی گەل بە گەل بێ، بێتە دەس خۆی دەستەڵات...**

(هەست وهاوار، ل١٣)

قەسیدە یەکێک لەو قاڵبە سەخت و دژوارانەیە کە شاعیرانی بە قودرەت و بە دەسەڵات نەبێ، کەم شاعیر لە عۆدەی دژواری تەنگ و چەڵەمەی وەزن و قافیەکانی دێنە دەرێ، دەبینین مامۆستا ئەحمەدیان وەستایانە شانی وەبەر ئەو قاڵبە سەخت و دژوارە داوە و سروشتی بەهەشت ئاسای کوردستان دێنێتە بەرچاو، بڕوانە چەند بەیتی هەڵبژاردەی ئەو قەسیدە:

**بەهار و راپەڕین**

**پیرە شەماڵێ! بە زریانێ بێژە وەرە**
**دوو قۆڵ بڵێن بە هەموو توێژو هۆزو بەرە**
**ئەو چاخە لاچوو کڕ و ماتی زاڵ ببوو**
**ئەورۆ هەرایە قرمەیە رووخانی سەنگەرە**
**ئەو خول بەسەرچوو کە سەرما پشووی بڕی**
**هەڵڵایە گرمەیە راوی ستەمگەرە**
**ڕازاوە کێو و تروسکەی دەدا لە دوور**
**داوێنی پڕ گوڵە هەوری لەسەر سەرە**
**زێڕی گزینگی فێسە بە تیلاگی سەریەوە**
**تیسماڵی بەفری سپی بۆتە کەمبەرە**
**پیرۆزە رایەڵ و پۆی سکڵی سوور گوڵی**
**میلی ئەوەندە وردە وەکوو خاڵی دڵبەرە**
**هاژاوە چۆم کە لە دەوری بگێڕێ خۆی**
**بەرپێلەقانیدا، هەچی پێشگیرو لەمپەرە**
**جنگڵ دەدا لە چەشنی هوروژانی هەژدیها**
**مەمنا ئەویش سوڕێکی ئەوینی لەبن سەرە**
**قومریش بە تووتەک و بولبول بە باڵەبان**
**زاخاو دەدەن بە هەموو لایە حەنجەرە**
**کێوی دەبێ کەویش کە بدرکێنێ رازی دڵ**
**دەشزانێ خوێندن و خوێنی بەرابەرە**
**راوچیش چ بێ خولایە، گەلی ناسکی ئەوین**
**دەیکاتە دەرفەت و ناڵێ قەڵەندەرە**
**ئەو داوە تاڵی دەواری رەشی ستەم**
**نەقڵی درێژە ئەوی نەیبێ جەمسەرە**
**پیرۆز بێ ئەو بەهارە کە زیندوو دەکاتەوە**
**توێژێکی مردەڵۆخە کە ژین بۆوی بێبەرە**

(هەست و هاوار، ل ٢٠-٢٢)

هەروەک پارچە هەڵبەستی «ئامۆژگاری» یەکێک لە شیعرە پاراوەکانی «مامۆستا ئەحمەدیان»ە:

**ئامۆژگاری**

**کوڕی ژیرم بەیانە هەستە لە خەو**
**جوێ کە ڕۆژی سپی لەگەڵ ڕەشی شەو**
**تۆ کە سەر دەرنەکەی لە ڕەش لە سپی**
**خوێندت مەرگە چەشنی خوێندنی کەو**
**بۆ تەرەققی لە عیلم و سەنعەتی خۆت**
**نەقدی جوانیت هەمووی بنێ لە گرە و**
**نوچکەکانی بڵندی عیلم و هونەر**
**بیخە بەرچاو بە عیلمی کۆن و بە نەو**
**پێش هەموو شتێک بزانە عەبدی خودای**
**شەرتی عەبدیت بکە بە سوجدە پتەو**
**پیاوی خوێڕی کە هیچ بە هیچ ناکا**
**سُنَّةُ اللهِ فی الذین خَلَوا**
**تۆ بە قووڵی زەوی بڕۆ خوارێ**
**هێندی خەڵکی دەڕۆنە خاریجی جەو**
**دەربخە زێڕی ڕەش بە دەستی خۆت**
**پیترۆشیمیت لە پاشە بیخە جلەو**
**تۆ لە پێشبڕکەکانی سەحنەی ژین**
**خەڵکی هێندە وەدوا دە، بیکە جدەو**
**دەس بدە دەس کوڕانی هاو وەتەنت**
**چەند بەرابەر پتوونە، هێز و قەوەو**
**کۆڕی ئەستێرەکان بگرنە نەزەر**
**سەربخەن کۆڵ و باروبنە و**
**لەو بڵندی بەقا تەمەننا کەن**
**بۆ گەل و نیشتمان و هۆز و بەرەو**

(تاریخ فرهنگ و ادب مکریان، ج٢، ص ١٨٨، ابراهیم افخمی)

مامۆستا ئەحمەدیان یەکگرتن و پێکەوەبوونی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بە پێویست دەزانێت، دووبەرەکی

بە نەهامەت وماڵوێرانی دەژمێرێت، ئەو بابەتە لەژێر سەردێڕی «دووبەرەکی» بەو چەشنە دەڕازێنێتەوە:

**دووبەرەکی**
**دە کەس، بەڕێیەک دا هاتن**
**لە پڕ دوو کەس تووشیان هاتن**
**ئەو دوو کەسە هەڵمەتیان برد**
**دەیەکانیان زۆر زوو چەک کرد**
**بە ڕووتی هاتنەوە ماڵان**
**خزمان لە دەورەیان هاڵان**
**وەبەر تیر و تانە دران**
**هەموو وەبەر پرسیار خران**
**بۆچی ئێوە تەسلیم دەبوون؟**
**خۆوان دوو بوون، ئێوە دە بوون!**
**یەکیان لەبن نەدامەتی**
**سەری هێنا دەرێ کوتی:**
**ئەوان دوو بوون، هەردوویان یەک**
**ئێمە دەبووین، هەموو یەک یەک**
**ئەی هۆزی من لێم ببیستن**
**گەر خاوەنی هەست و ویستن**
**هەرگیز مەڵێن: ئێمە چەندین**
**هێندە ئازا و مەرد و ڕەندین**
**بێژن: لەگەڵ یەکتر چۆنن**
**ڕووخۆشن یا لێکتر مۆنن**
**هەزار مەردی بێ وێنە بن**
**بێت و لەگەڵ یەکتر نەبن**
**پاڵ ڕێک دەدەن چەند نامەردان**
**دەتانکەنە تۆزی هەردان**
**خوا فەرموویە: إعتَصِموا**
**بِحَبلِ الله بگرن هەموو**
**پەیمانی خوا، بڵاو مەبن**
**بە یەکگرتن ڕزگار دەبن**

(هەست و هاوار، ل٨)

**هونەری خۆشنووسی مامۆستا ئەحمەدیان:**

سەبارەت بە هونەری خۆشنووسی و دەست و پەنجەی ڕەنگین و جوان نووسینی مامۆستا ئەحمەدیان پێویستە بڵێم، لە مەودای ئیش و ئەرکەکانی جاروبار ئاوڕی دەدا سەر جوان نووسین و خۆشنووسی واتە «خەتتاتی»، وەک ئیشێک لە پەنای ئیشێکی تر دەپرژا سەر ئەو هونەرە. مامۆستا ئەحمەدیان هەر لەوکاتەوە بۆ خوێندن لە بنەماڵە دوور ببۆوە، هەواڵی خۆی لە ڕێی نامە و نامیلکەی جوان و ڕێکوپێک ڕادەگەیاند، هەر لەوکاتەوە جوانییەتی و ڕازاوەیی و جموجووڵی جوان نووسین لە خەت و نووسراوەکانی بەرچاو بوو، جوانی لە ناخ و دەروونی ئەو وشە و ڕستانەی مامۆستا دەینووسین هەڵدەڕژا، هەستی هەر هەستیارێکی وەجووڵە دەخست.

مامۆستا ئەحمەدیان بە یارمەتی کەرەسەی زۆر ئاسایی وەک قامیش و دارنووک و جەوهەری دەستکرد لە سەر لاپەڕەیەک زیاتر لە سەد جار پیتێک یان وشەیەکی بە دووی یەکدا شەتەک دەدا و لە چەشنی یەک دەینووسینەوە و لاپەڕەی ڕەش هەڵدەگێڕا، ئەو مەشق و ڕاهێنانە دەگەیشتە ڕادەیەک چاوی خوێنەر لە سەر ئەو لاپەڕە تەنیا ڕەشکە و پێشکەیەکی دەدی ، ئەو نووسراو و تۆمار و بەیازانەی کە بە شێوەی نەستەعلیق نووسرابوون وەک سەرمەشق کەڵکی لێوەردەگرتن لەسەر لێنووس ڕاستە و پاستەی دەکردن و لە ڕووی دەنووسینەوە، وادەچووە نێو هەناوی وشە و پیتەکان و پێیان سەرقاڵ دەبوو، جاری وابوو کات و ساتی حەسانەوە و خواردنی لەبیر دەچووەوە، تەنانەت پاراستنی شمەک و لیباسەکانی لە پەڵەی ڕەش و شینی جەوهەر بۆ نەدەپارێزرا، لەگەڵ ئەوە سووتووی سیغار و چەرە دووکەڵی جغارە هەور و هەڵا و چەرچەمانێکی سەیری پێکدەهێنا، وەتاغی کارەکەی شپرزەتر دەکرد، ئەو چەرە چەمانە و چەند قوتوو جەوهەر و مەرەککەب و دەیان قەڵەمی قامیش، درێژ و کورت و باریک و ئەستوور، لە پەنای سەدان کتێبی کۆن

و نوێ، قۆریی و فلاکسی چا و ڕادیۆی فیلیپس، کەشوهەوایەکی جیاواز و تایبەتی و جیددی و لە هەمانکاتدا ڕۆمانتیک و ئاڵۆزی پێکدەهێنا، لەسەر ئەو ئاڵۆزیی و شپرزەییە، کەس زاتی نەدەکرد ئەو کەرەسە و کتێب و ئامرازانە هەڵوەژێرێ؟!

بەرهەمی ئەو ماندووبوون و ڕاهێنان و مەشقکردنە ئەوە بوو، مامۆستا ئەحمەدیان خەتێکی زۆر جوان و ڕازاوە و دڵگر و ڕێکوپێکی کردە موڵکی خۆی، لە خوارەکە و پێچەکەی وشەکان و فیگۆڕ و کەوانەی پیتەکان و چەرخ و خولی پێنووس، هاڕمونی و سەمایەکی زۆر جوانی لە وشە و ڕستەکان پێکدەهێنا، بەرهەمی ئەو ماندووبوونە پێکهێنانی ئەلبومی دەستنووسەکانی مامۆستایە کە ئێستا لەبەر دەستی مندایە، لە توێی وەڵامی نامە بۆ نووسەران و هەستیاران وەک ڕوقعە خەت و وێنە خەت نووسراون.

**خووخدەی مامۆستا ئەحمەدیان:**

بەڕێز «ناسری عەلیار» لە وتارێکی تایبەت، بەوچەشنە باسی مامۆستا دەکات: «مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەدیان کەسایەتێکی ڕاست و دروست و یەک ڕەنگ و دڵسۆز و قەدرزان و لەبەر دڵان و بێ ڕیا و بە ئەمەک بوو، لەگەڵ ئەوە کەسایەتێکی ئایینی بوو، لە سۆنگەی کاری ئەدەبی لەگەڵ زۆربەی شاعیران و هونەرمەندان و لێکۆڵەران دۆستایەتی هەبوو، تەنانەت گرێ و گۆڵی زەینییان سەبارەت بە ئایین بە ڕاشکاوی لەلا باس دەکرد. حورمەتی عالمانەی خۆی وەک زانا و عالمێک ڕاگرت، بۆ ماڵ و سامان ئەو قورساییەی نەشکاند، لە پەنای خەڵکدا ماوە، ئەوەندەی بۆی کرا و لە دەستی هات بەدەست و زیاتر بە قەڵەم و قسە بەربەرەکانی لەگەڵ چەوتی کرد، بە مووچە و داهاتی موعەللیمی لە ماڵێکی ئاسایی بێمنەت گوزەراندی، هەر لەو ماڵەدا دۆستان و لایەنگرانی لێی دەهاڵان، هەر لەو ماڵەدا نووسینەکانی هێنا بەرهەم، هەر لەو ماڵەدا میوانی بەڕێ دەکرد، سەرئەنجام هەر لەو ماڵەدا ئاوای دنیای هەرمان بوو.

مامۆستا تا دوایین ساڵی ژیانی لە پێش نوێژی وەک ئەرکێکی ئایینی کۆتایی نەکرد، ئەوەندەی توانی دەرسی فەقێی گوتەوە، مامۆستا لەباری مەعنەوییەوە هەتا هات بەرەوژوورتر ڕۆیی، موناجاتەکانی لەو ساڵانەی دواییدا لە شەوانی ڕەمەزان، بە ئاشکرا تۆ بەو ڕاچڵەکانی پێوە دیار بوو، لە مەلایەکی بە توانای جەدەلی و دڵ بە دنیا و شایی بەخۆ، گەیشتە شوێنی پوختەیی و خۆ بەکەم گری و قەدرناسی، خەم و پەشێوی دواڕۆژەکانی تەمەنی ئەوە بوو، بۆ نەیتوانیوە ئەرکەکانی تەواو بە ئەنجام بگەیەنێت، مامۆستا بەش بە حاڵی خۆی بزوتنەوەیەکی فەرهەنگی و عیلمی لە وڵات وەڕێخست، سەرەڕای سەرکەوتن بۆ بەرزاییەکانی ئەخلاقی و دەروونی، ڕچەشکێنی و ڕابەری لە بواری شیکاری ئایینی و عیلمی بۆ مسۆگەر کرد، لەنێو هاوچەرخانی خۆی لە کوردەواریدا بە ڕاستی تاقانە بوو.» (سیروان ماه، ژمارە ٣٢٢، ڕەشەمەی ٨٣، ناسر عەلیار)

مامۆستا«ئەحمەدی قازی» لە وتارێکدا بەو چەشنە باسی مامۆستا دەکات: «... مامۆستا ئەحمەدیان لە هەر کۆڕ و مەجلیسێکدا قسەی کردبا هەموو کەس بەبێ دەنگی، بە تەواوی حەواسەوە ئامادە بوو ئەو واژە و ئەو زاراوە جوانانەی ئەو لە کاری دەهێنا بیقۆزێتەوە و کەڵکی لێوەرگرێ، سەرەڕای هەموو ئەوانە، مامۆستا پیاوی چاک بوو، سەرفینەزەر لە ئیستیعداد و توانایی و قەڵەمی بەپێز و بەرەکەتی، ئینسانێکی باش بوو، کوردێکی دڵسۆز بوو، کوردێکی کە بە بێ تەزاهور بۆ کوردایەتی تێدەکۆشا، بە قەڵەم بەکردەوە بە ئایین بە قسە جوان و ڕازاوەکانی، بەو دڵسۆزییەی کە لەوی چاوەڕوان دەکرا...» (خەزێنە، کۆمەڵە وتار، عەللامە مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان، ل١٥)

لە دوایی ئەو بابەتە ڕاو بۆچوونی «دوکتۆر

جەلالی جەلالی‌زادە» مامۆستای ئیلاهیات لە زانستگای تاران، سەبارەت بە کەسایەتی مامۆستا ئەحمەدیان دێنینە بەرچاوی خوێنەری بەڕێزی ئەو بابەتە:

«علامه استاد ملا عبدالله احمدیان در سراسر عمر ارزشمند خود دمی نیاسود و عمر خود را وقف خدمت به جامعه، ملت و مذهب خویش کرد. اثار گران‌سنگ ایشان در زمینه‌های مختلف اعم از دینی و ملی دلیلی ڕوشن بر جایگاه و منزلت ایشان در میان مردم است. یکی از ویژگی‌های فراموش‌ناشدنی ایشان درک نیاز و ضرورت جامعه‌ی کتاب‌خوان و قشر تحصیل کرده بود که در هر موضوعی احساس نیاز می‌کرد اثری ڕا تدوین می‌نمود، در مسایل فقهی، کلامی، تاریخ و معرفی شخصیت‌ها و مسایل کلامی جدید، انچه را که در توان داشت به رشته‌ی تحریر در اورد، او زنده است؛ زیرا با اثار جاویدان و احساس مسئولیت، نه تنها حیات خود را جاودان کرد، بلکه با اگاهی‌بخشی و ایمان به راه خود و عشق به خدمت توانست رسالت و تعهد خود را در ابلاغ پیام دین ایفا نماید.

او هم مسجد و هم دانشگاه را می‌شناخت و حامی فرهنگ ملی و مدافع ارزشهای دینی بود. به همین دلیل در میان اقشار مختلف از احترامی خاصی برخوردار بود. ایشان از ذوق ادبی بهره‌مند و با فصاحت و بلاغت خود گیرایی ویژه‌ای را ایجاد کرده بود. استاد احمدیان تلاش کرد تا اسلام را به عنوان مکتب تعقل و تدبر و تفکر بشناساند و دینی بر اساس تحقیق معرفی کند و شبهه‌ها را از ذهن و مغز جوانان بزداید و با طرح مسایل فکری مخاطبانش را به اندیشیدن وا دارد و با تشویق اندیشه‌ورزی به حل مشکلات جامعه اهتمام نماید. او توانست در احساس، فکر و شعور مردم انگیزه ایجاد کند و استعدادها را به شکوفایی وادارد....هتد»

**فهرست مجموعه آثار علامه ملاعبدالله احمدیان**
**(آثار چاپ شده و آماده چاپ/ به ترتیب زمان تألیف)**

١- تاریخ اماکن متبرکه/ تاریخ مقدسات اسلام (١٩٠ص/ ١٣٣٦)، آماده چاپ، موضوع: تاریخ مکه مکرمه، مدینة النبی، مسجد الاقصی

٢- تعیین اوقات شرعیه، سال (١٣٤٥)، چاپ اول، چاپ زرین، ١٣٤٥، موضوع: (طومار ساعت)

٣- ئایین و کۆمەڵ، (٧١٠ص/ ١٣٥٧)، چاپ اول، انتشارات کردستان، ١٣٩٦، موضوع: صد برنامه‌ی دینی پخش‌شده از رادیو به زبان کردی.

٤- بەرەبەیان (٥٠٠ص/ ١٣٥٧)، آماده چاپ، موضوع: مجموعه‌ای از برنامه‌ی طنزی پخش‌شده از رادیو.

٥- ئیسلامناسی، (١٢٠٠ص/ ٥١- ٥٨)، آماده‌ی چاپ، موضوع: شناخت ابعاد و زوایای دین اسلام.

٦- سیمای صادق ابوبکر صدیق، (١٨١ص/ ١٣٦٢)، چاپ اول، ناشر: نشر احسان، ١٣٨٨، موضوع: تجزیه و تحلیل زندگی خلیفه‌ی اول.

٧- تەفسیری سوورەی یاسین، (٢٤٤ص/ ١٣٦٤)، چاپ اول، انتشارات کردستان، ١٣٩٦، تفسیر سوره‌ی یاسین به زبان کردی.

٨- تحقیقات (٩٩ص/ ١٣٦٥)، چاپ اول، ناشر: رهرو، ١٣٧٦، موضوع: مناظره درباره‌ی طلاق، جدال اشاعره و متعزله، حلول ماه رمضان و عیدفطر.

٩- بسوی جهان جاویدان، (٥٤ص/ ١٣٦٥)، چاپ اول، ناشر محمدی، ١٣٧٧، موضوع: بحث فقهی در رابطه با وداع و بدرقه‌ی مسافران جهان آخرت

١٠- مختصر علم‌القرآن، (٤٠ص/ ١٣٦٦)، آماده‌ی چاپ، ترجمه‌ی فارسی «مختصرالقرآن ابن‌کثیر از شیخ سیوطی».

١١- درآمدی بر خداشناسی، (١٦٥ص/ ١٣٦٦)، چاپ اول، انتشارات کردستان، ١٣٩٠، موضوع: مباحثی در رابطه با خداشناسی استدلالی.

١٢- سیمای صادق فاروق اعظم، (٧٣١ص/ ١٣٦٨)، چاپ هشتم، ناشر: محمدی، چاپ اول، ١٣٧٠، موضوع: تحلیل جامعی بر زندگی خلیفه‌ی بزرگ اسلام عمر

فاروق.

۱۳- هەست و هاوار، (۵۰ص/ ۱۳٦۸)، چاپ اول، ناشر: نشر احسان، ۱۳۷۰، موضوع: چند برگی از اشعار کردی استاد احمدیان همراه تحلیلی بر شعر کلاسیک و نو.

۱٤- گەلحۆ، (۱۳۷ص/ ۱۳٦۸)، چاپ اول، ناشر: نشراحسان، ۱۳۷۰، موضوع: طنزی در دوازده قسمت در رابطه با هنجارهای نادرست جامعەی سنتی کردستان

۱۵- الایضاح، (۲۲۰ص/ ٦۹)، چاپ اول، ناشر: نشراحسان، ۱۳۸۲، موضوع: حل مشکلات تفسیر بیضاوی به زبان عربی.

۱٦- ترجمەی رسالة التوحید، (۲۸۲ص/ ۱۳۷۰)، چاپ اول، ناشر: محمدی، ۱۳۷٤، موضوع: ترجمەی ارزندەترین اثر شیخ محمد عبده در ڕابطه با شبهات ڕوشنفکران.

۱۷- کلید حدیث‌شناسی، (۹۲ص/ ۱۳۷۰)، چاپ پنجم، ناشر: نشراحسان، چاپ اول، ۱۳۷۲، موضوع: اثری در رابطه با انواع حدیث (علم‌الحدیث).

۱۸- تجزیه و تحلیل زندگانی امام شافعی، (۳۳۵ص/ ۱۳۷۲)، چاپ دوم، ناشر: نشراحسان، ۱۳۷٤، موضوع: تجزیه و تحلیل جامعی از زندگی امام شافعی ڕحمة الله علیه.

۱۹- تەفسیری سوورەی فاتیحا، (۸۳ص/ ۱۳۷۳)، چاپ اول، ناشر: رهرو، ۱۳۷۹، موضوع: تفسیری مفصل از سورەی فاتحه.

۲۰- اسلام پژوهی، (۱۸۷ص/ ٦۲- ۷۳)، آمادەی چاپ، موضوع: مجموع چهار مقالەی علمی پژوهشی: نقش قلم، سیر اجتهاد، سنت از دیدگاه اهل سنت، کتابسوزی.

۲۱- روش تبلیغ، (۸۰ص/ ۱۳٦۲). آمادەی چاپ، موضوع: روش و شیوەهای دعوت و تبلیغ.

۲۲- قبلەی محمد، (٤٦ص)، سال(۱۳۷٤)، چاپ اول، ناشر: محمدی، ۱۳۷۸، موضوع: محاسبات ڕیاضی جهت تعیین قبلەی مناطق کردنشین.

۲۳- قرآن‌شناسی، (٤۲۹ص/ ۱۳۷۷)، چاپ پنجم، ناشر: نشراحسان، چاپ اول، ۱۳۷۹، موضوع: مباحث



تحقیقی دربارەی شناخت قرآن.

۲٤- سیر کلام اهل سنت، (٦۷٤ص/ ۱۳۷۹)، ناشر: نشراحسان، چاپ ششم، چاپ اول، ۱۳۸۱، موضوع: مباحث فکری و جدلی مذاهب کلامی اشاعره و معتزله و جبر و اختیار.

۲۵- بەرنامەی سەحەری، ( ۳۰۰ص/ ۱۳۷۹)، آمادەی چاپ، موضوع: تعداد ۹۰ برنامەی ڕادیویی پخش شده در فاصله سه سال.

۲٦- موناجاتی مەلاعەبدوڵلا، (۹٦ص/ ۱۳۸۱)، چاپ اول، نشر احسان، ۱۳۸۹، موضوع: نثر مسجع کردی، به شیوەی مناجات خواجەعبدالله انصاری.

۲۷- خەزێنه، (۳۰۹ص/ ۸۳-۷۰)، چاپ اول، ناشر: نشراحسان، ۱۳۷۸، موضوع: مجموعه مقالات ادبی تحقیقی منتشر شده در مطبوعات کردی.

۲۸- کلام جدید، (۲٤۵ص/ ۱۳۸۱)، چاپ اول، ناشر: ڕهرو، ۱۳۸۲، موضوع: مباحث جدید کلام، پلورالیسم، فیهینیسم، پست مدرنیسم.

۲۹- تاریخ ضبط و ثبت احادیث، (۱۷۲ص/ ۱۳۸۲)، چاپ اول، ناشر: نشراحسان، ۱۳۸۳، موضوع: تاریخ کتابت حدیث و محدثین اهل سنت.

۳۰- تەفسیری ڕۆژ، (۲۸٤ص/ ۱۳۸۲)، آمادەی چاپ، موضوع: تفسیر سورەی بقره به زبان کردی تا آیەی (۱۷۷).

## پەراوێزەکان

١. مەلا سەید هاشمی حوسێنی (١٢٧١- ١٣٨٠ی هەتاوی) هەوەڵین مامۆستای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەدیان بووە، ئەو مامۆستایە زانا و ماقوڵە لە گوندی «عیساکەند» هاتبووە دنیا، لە حوجرەکانی «تورجان و حەمامیان و شێخلەر و عەنبار» دەرسی خوێندبوو، دواتر چووبووە سلێمانی لە خزمەت مامۆستا شێخ عومەری ئیبنوقەرەداغی (١٢٦٥- ١٣١٥ی هەتاوی) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبوو، سەرەتا لە ناوچەی سەردەشت لە «ڕەبەت» ببووە مەلا، ساڵی ١٣١٧ی هەتاوی دێتە ناوچەی موکریان لە گوندی «کانیڕەش» دەبێتە مەلا و مودەڕڕیس. ئەوکاتە عەلیاغای عەلیار (١٢٦٢- ١٣٢٨ی هەتاوی) ناسراو بە «ئەمیرئەسعەد» دەسەڵاتداری موکریان و باوەڕپێکراوی ڕەزا شا، خاوەن ملکی کانیڕەش بوو، مەلا سەید هاشم لەژێر چاوەدێری عەلیاغا ئەرکی مەلایەتی و تەدریسی حوجرەی فەقێکانی کانیڕەش بەڕێوە دەبات، ساڵی ١٣١٨ی هەتاوی مامۆستا ئەحمەدیان سەرەتای خوێندن لە خزمەت مەلا سەید هاشم دەستپێدەکات، لە ماوەی سێ ساڵ سیپارە و قورئان و عەوامیل و عیززی و گوڵستان لە خزمەت مامۆستا دەخوێنێت. دوای شەش ساڵ مەلا سەید هاشم لەگەڵ عەلیاغا کێشەی بۆ پەیدا دەبێت، ساڵی ١٣٢٣ دێتە مەهاباد و دەبێتە ئیمامی جەماعەتی خانەقای شێخی حیسامەددین، هاوکات لە ساڵی ١٣٣١ تا ١٣٥١ مامۆستای قوتابخانە دەوڵەتییەکانی مەهاباد بووە، ساڵی ١٣٨٠ دوای سەدونۆ ساڵ تەمەن لە مەهاباد کۆچی دوایی دەکات.

خاڵی گرنگ ئەوەیە من نووسەری ئەو چەند دێڕە، ساڵی ١٣٥١- ١٣٥٢ لە دەبیرستانی محەممەدڕەزاشای مەهاباد قوتابی پۆلی دووی ناوەندی بووم، مامۆستا مەلا سەید هاشمی حوسێنی لەو قوتابخانەیە مامۆستا بوو، بە هەڵکەوت بوومە قوتابی ئەو مامۆستایە کە سیوسێ ساڵ پێشتر مامۆستای سەرەتای خوێندنی بابم بوو.

٢- گەورک: ناوی هۆزێکە لە ناوچەی «گەورکان» یان «گەورکایەتی» دەژین، ناوچەی گەورک یەکێک لەو چوار ناوچە جیاوازەیە کە تێکڕا هەرێمی سابڵاغ (مەهاباد) پێکدەهێنن (شارویران، محاڵ، مەنگوڕان، گەورکان). ناوچەی گەورک لە باشووری مەنگوڕایەتی، باکووری بانە، ڕۆژئاوای سەقز، ڕۆژهەڵاتی نەڵین هەڵکەوتووە. ناوچەیەکی کوێستان و بەفرگر و ئەستەمە و هەندێک لاپەڕە، هۆزی گەورک پێش هۆزی «مەنگوڕ» لەلای ڕۆژئاوای ئێران پەڕیوەی ئێران بوون.

٣- تحلیلی بر افکار و اثار علامه ملا عبدالله احمدیان، ناصر علیار، ناشر: (ئاڵای ڕووناکی)، ١٣٩٥، ص٤٠- ٧٣.

٤- یەکێک لەم غەزەلە دڵگر و پاراوانە لەلایەن بەڕێز قاسم موئەییدزادە (هەڵۆ) شرۆڤەی لەسەر کراوە و لە گۆڤاری(رامان)، ژ(٢٢٩)، بڵاوکراوەتەوە.

٥- اندیشەی اصلاح، ماهنامەی فرهنگی، اجتماعی، سال اول، شماره اول، تیرماه ١٣٩٤، استاد عبدالله احمدیان از چند زاویه، ص٧٢- ٧٥.



## بیرەوەرییەکانی
## مەولود باوەمراد

بەشی سێیەم

# ئاسۆی شەرعیەت و
# سەرەتای میحنەت

زۆر بەکورتی گوشراوی، مامۆستا مەلا ئەحمەدی شافیعی و مامۆستا محەمەد ڕەئوف، هەردووکیان لە کۆلێجی شەریعەی بەغدا دەیانخوێند، پێکەوە لە مزگەوتەکەی مامۆستا سەید ئەحمەد بوون، کە ئیمامی مزگەوتی(عوتەیفیە) بوو لە بەغدا، لە ڕێگەی مامۆستا سەیدەوە هێڵێکی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمینی عێراقیان لە بەغدا دۆزییەوە، بەرپرسی ئەم ڕێکخستنە کەسێک بوو بەناوی(د. عبدالمجید السامرائی) ناسراو بە «ئەبو زەڕ» پزیشکی دەروونی بوو لە بواری منالاندا.

د.عەبدولمەجید سامەڕایی، ئەم ساڵ لە ڕۆژی ٣٠/٣/ ٢٠٢٠دا، پاش چەند ساڵێک تووشبوونی بە نەخۆشی، لە گەرمەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆرۆنا، لە شاری لەندەن کۆچی دوایی کرد، خوای پەروەردگار بیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیی و لە ڕیزی ئەنبیا و شەهیدان و ساڵحاندا حەشری بکات.

لەو پرسەنامانەی لەلایەن حزبی ئیسلامیی و جەماعەتی عەدل و ئیحسانی عێراق و ژمارەیەک لە کۆمەڵە ئیخوانییەکان و دۆستانی بۆی نووسرابوو، هەندێ زانیاری کەم بەڵام نەزانراو و گرنگ بەنسبەت بەندەوە پەردەی لەسەر لادرا، زۆر دەمێک بوو دەمویست بگەمە ڕاستی ئەوەی کە کێیە ئەو کەسەی جورئەتی ئەوەی بە خۆیداوە، لە عێراقدا و لەگەڵ بوونی د.عەبدولکەریم زەیداندا، پاش بڕیاری هەڵوەشانەوەی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین لە ساڵی ١٩٧١دا، سەرلەنوێ کاری ڕێکخستنی کۆمەڵەکەی دەستپێکردووەتەوە، یان وەک د.عەبدولمەجید دەیووت درێژەمان بەکاری ڕێکخستنداوە.

لەو نووسینانەدا ئاماژە بەوەکراوە، کە پاش ڕاگرتنی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ئیخوان لە عێراقدا، کۆمەڵێک گەنجی سەر بەو کۆمەڵەیە بە ڕێبەرایەتی (ئەیاد سامەڕایی) سەرکردایەتی کاری ڕێکخستنی ئیخوانیان گرتووەتە دەست و د.عەبدولمەجید وەک یاریدەدەر و دەستەڕاستی ئەیاد سامەڕایی بووە، تا ساڵی ١٩٨٠، لەبەر کەشفبوون و ڕاوەدوونانی لەلایەن حزبی بەعسەوە لەو ساڵەدا ئەیاد سامەڕایی عێراقی بەرەو دەرەوە بەجێهێشتووە، ئەرکی بەرپرسیارێتی ڕێکخستنەکەی سپاردووە بە د.عەبدولمەجید سامەڕایی، پاش زۆربوونی ئەندامانی ئەو ڕێکخستنە و فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی لە سەرتاسەری عێرقدا - ئاماژە بە کوردستانیش دەکەن- ڕێکخستنەکە لە ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن حزبی بەعسەوە کەشف دەکرێت، و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی دیار و ناسراوی ڕێکخستن دەگیرێن و فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەرکرێت، یەکێک لەوانە بەڕێز مامۆستا حەسەن شەمێرانی بوو، پاشان لە ڕێگەی هەوڵی سەرکردە و کەسایەتییە ئیسلامییەکانی تورکیا و سودان و ئەردەنەوە، حوکمەکانیان بۆ سوک دەکرێت بە زیندانی هەتاهەتایی، ژمارەیەکیشیان فریای هەڵاتن و دوورکەوتنەوە لە عێراق دەکەون، ئەم ڕێکخستنەی ئیخوانی عێراقیان هەر بەهەمان ناوی ساڵی کەشفبوونەوە ناوزەدکردوە «ڕێکخستنی ١٩٨٧».

د.عەدنان دلێمی لە کتێبی یادەوەریەکانیدا بەناوی( صفحات من تاريخ الاخوان المسلمين فی العراق) (ص٢٣٩-٢٤١)، لەژێر ناونیشانی (پاش هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستن) لەگەڵ ئاماژەکردن بەو کێشە و گرفتانەی لەو بڕیارە کەوتوونەتەوە، کاریگەرییەکانی لەسەر ڕیزەکانی کۆمەڵەکە، لە ساردبوونەوە و وازهێنان و دورکەوتنەوە، هەمان بۆچوونی سەرەوە لەسەر بەردەوامی کاری ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لەلایەن ئەیاد سامەڕایی و د.عەبدولمەجید سامەڕایی - یەوە پشتڕاست دەکاتەوە، ئەڵێت، کە ئەمانە لەسەر کاری ڕێکخستن بەردوامبوون و پابەندنەبوون بە بڕیاری هەڵوەشاندنەوە.

پاش دۆزینەوەی ئەم بەرپرسەی هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق وەک گوتم لەلایەن

مامۆستا سەید ئەحمەد و برایان کاک محەمەد ڕەئوف و مامۆستا مەلا ئەحمەدی شافیعییەوە، بەیەکگەشتن و کۆبوونەوەی لەگەڵ مامۆستا صدیق بۆ ڕێکخرا و لە هەڵەبجە و سلێمانی چەند کۆبوونەوە و دیدارێکیان کرد. لە ئەنجامی ئەو دیدار و گفتوگۆیانەدا کە پرسی چۆنیەتیی و جۆری پەیوەندی تێدا باسکرا بوو، بە سرووشتی ڕێکخستن و ئینتما بۆ کاری ئیخوانی، بابەتی بەیعەت خاڵی سەنتەرە لە هەر پەیوەندییەکی لە مجۆرەدا.

لە سەروبەندی ئەم پرۆسەیەدا، لە نێوان ماوەی پەیوەستکردنی کاری هەردوولای ئیخوانی عەرەبی و کۆمەڵەی ئێمە لە کوردستان و بەیعەتداندا، بەندە لە زانکۆی موسڵ بووم، دووجار لەگەڵ مامۆستا صدیق کۆبوومەوە، مامۆستا زۆر پێداگریی لەسەر ئەوەبوو، دەبێت ئەم پەیوەندیی و بەیعەتدانە بە کۆمەڵە بە مەرجێکی دیاریکراوەوە بێت، خوا ئەزانێت ڕووداوەکان بەرەو کوێ دەڕۆن، دەبێ زەمانەتێک بۆ کاری خۆمان بکەین، بەتایبەتی گووتی: بەو مەرجە بەیعەتمداوە کە هێڵی ئێمە لە داهاتووی ئەمکارەدا بەرپرسی کاری ئیخوان بێت لە کوردستاندا. ئەو دوورتر دەیروانی چەندین گرفتی لێکترازان و دابەشبوونی لەنێو کۆمەڵەی ئیخوانی عێراقدا ئەزموون کردبوو،-هەروەک عەدنان دلێمی لە یادەوەرییەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات.

ئێمەش بەو گەنجی و کەم ئەزموونییە، چاومان لە کێشە و دەست و یەخەگیرەکەی ڕۆژانەی کاری خۆمانبوو، دەمانویست لەگەا ئەو هێڵی ڕێکخستنە پەیوەست بین و گرێی شەرعییەتی کاری ڕێکخستنی ئیخوانی لەناو هێڵی ئێمەدا بکرێتەوە؟ لەڕاستیدا بەم پەیوەندییە گرێی شەرعیەت بۆ هێڵی ئێمە لە ڕووی دەروونییەوە کرایەوە، بەڵام لە ڕووی عەمەلییەوە بۆ برایانی تری دژی کاری ڕێکخستن هەروەک خۆی مایەوە، واتێدەگەم ئەوان پەیوەندی ناوە ناوەیان لەگەڵ د.عەبدولکەریم زەیدان وەک ڕابەری شەرعی کۆمەڵەکە هەبوویێت، لەسەر بەردەوامی بڕیاری پابەندی بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستن تەئکیدی کردبێتەوە بۆیان، بوونی هەر جۆرە هەوڵ و کارێکی لەو جۆرەی بە ناشەرعی لەقەڵەمدابێت لە هەموو عێراقدا.

لە سەرەتای دەوامی قۆناغی سێیەمی کۆلێژی کارگێڕیی و ئابوریدا بووم لە زانکۆی موسڵ( ١٩٨٥-١٩٨٦)، هەر لەو مانگەدا ژیانی هاوسەریم پێکهێنابوو خێزاندار بووم، لە ڕۆژێکی پێنج شەممەی مانگی ئەیلولی ١٩٨٥دا مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز، هاتە شاری موسڵ و لە ماڵی د.موستەفا پێنجوێنی لە ڕێگەی د.عەبدولمەجیدەوە، بەیعەتی بەم هێڵەی ڕێکخستن و کاری نوێی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقدا.

بەم بەیعەتە مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان بوویە ڕابەری هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان، واتە ڕابەری ئەم هێڵە نوێیەی کاری ڕێکخستن و بوژانەوەی ڕێکخستن، لە ڕووی کردەییەوە مامۆستا صدیق وەک سەرۆک یان سکرتێر کاروباری کۆمەڵەکەی بەڕێوەدەبرد، بەمەش گرێی بەکارهێنانی کارتی شەرعیەت و ناشەرعیەت لەسەر هێڵی ئێمە کرایەوە.

دواتر بیستم، نازانم چەندە ڕاستە؟ دەبێت ئەو برایانەی ئاگادارن پشتڕاستی بکەنەوە، کە د.عبدالمجید پێش پەیوەندیکردن لەگەڵ هێڵی ئێمە پەیوەندی بە برایانی تری ناکۆک لەگەڵ کاری ڕێکخستن کردووە و هەمان پرۆژەی خستوونەتە بەردەست، بەڵام ئەوان ئەو پەیوەندییەیان ڕەتکردووەتەوە و جوابیان کردووە.

پاش جێگیربوونی ئەم پەیوەندییە بڕیاردرا ئەندامی هەرلایەکمان کە لە ئاستێکی دیاریکراودایە لە هەر شارێکی عێراقدا پەیوەندی بکات بە ڕێکخستنی ئەو شارەوە، بەندە کە قوتابی قۆناغی سێیەمی کۆلێژی کارگێڕیی و ئابووری بووم لە زانکۆی موسڵ، مامۆستایەکی پەیمانگای تەکنیکی

موسڵ پەیوەندی پێوەکردم بەناوی محەمەد ئیبراهیم عەزیز ناسراو بە (ابو ئیمان)، جارجارە لە مزگەوتی نەبی یونس، لە مزگەوتی نەبی شیت، لە ماڵی خۆیان یەکترمان دەبینی، بەندە لە زانکۆ دوو ئوسرەم هەبوون، لە قوتابیانی کۆلێژە جیاجیاکان، ڕیشێکی درێژم هێشتبووەوە، لەگەڵ چەند قوتابیەکی کۆلێژەکەمان کە(٨) کەسبووین( دوو تورکمانی کەرکوک، دوو عەرەب، یەکێکیان گەنجێکی خەڵکی بەغدا و ئەوی دیکەیان جبوری خەڵکی دەوری موسڵ، دوو هەولێری، دوو هەڵەبجەیی)، لە گەڕەکی (وادی حجر) ژورێکمان گرتبوو، هەفتانە یان زیاتر شەوانە دەرسێکی تەفسیرمان دەخوێند.

جارێکیان لە جومعە و پێنج شەممەدا، سەفەرمان کرد بوو، حامد گەنجە عەرەبە بەغدادیەکە، ماڵیان لە گەڕەکی عەدلی بەغدا بوو، درەنگانێکی شەوی پێشتر بە شەمەندەفەر گەڕابوویەوە، خۆی تەنها لە شووقەکە مابوویەوە، کە دوای عیشا من گەیشتمە شوقەکە، پاش کەمێک دانیشتن، گووتی: أخ مولود؟ گووتم: نعم، گووتی: تدری الشقه مسکونه؟ گووتم مەبەستت چیە؟ بۆ مەگەر تەنها ئێمەی تیانییە؟ گووتی نا نا، دیارە تۆ نازانی مسکونه لە قسەکردنی عەرەبی دارجی خەڵکدا یانی چی؟ گووتم نەخێر؟ گووتی: یانی جنۆکەی تیایە؟ گووتم: هیچت دیوە؟ گووتی نەخێر، بەڵام بۆری ئاوەکانی شوقەکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەنگ و بۆڕەبۆڕێکی سەیرێکی لێدێت؟ گووتم: ئەوە من وەک ئەمیری شوقە لێرەم ئەگەر پیاوە بابێت؟ دواتر بابەتەکەم کردە شۆخی نێوانمان و شتەکەی لا ئاسایی بوویەوە، دواتر بیستم پاش تەواوکردنی زانکۆ ڕۆشتبووە ئەفغانستان و لەوێ شەهید ببوو-بەڕەحمەت بێت.

لەم قۆناغەدا ژمارەیەک قوتابی ئیخوانی وڵاتانی تری عەرەبیم ناسی، فەلەستینی، سودانی، کوەیتی، یەمەنی،...هتد.

گەرمەی شەڕی عێراق - ئێران بوو لەلایەکی ترەوە گەرمەی جیهادی ئەفغانیش بوو، لە دانیشتنێکدا برادەرە فەلەستینییەکان کە خەڵکی شاری غەززە بوون، گووتیان ئێمە هیچ دەربارەی جیهادی ئەفغانی و جەماعەتەکانی نازانین؟؟؟ منیش کە گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە ئەلبومێکی وێنەی حزبی ئیسلامی حیکمەتیارم دەسکەوتبوو، نزیکەی (١٥-٢٠) وێنەی جۆراوجۆری حیکمەتیار و جەماعەتەکەی لەکاتی جیهادا تێدا بوو، وێنەکانم لکاند بە پشتەوەی فەروی قەمسەڵەکەمدا و دایکی ڕەحمەتیم بۆی دوریمەوە، گەیاندمە دەستی برادەرانی فەلەستینی لە زانکۆی موسڵ، دنیایەک پێی دڵخۆشبوون.

ئێستە تا ئەوکات لەبیرم نییە بابەتەکانی باسکردنمان لەگەڵ (ابو ئیمان) چی بوون، بەڵام ئەکاتانەی کە دەگەڕامەوە بۆ هەڵەبجە ئەگەر ڕێکەوتی گەڕانەوەی مامۆستا مەلا ئەحمەد و مامۆستا محەمەد ڕەئوفی بکردایە کۆبوونەوەی چوارقۆڵیمان چەند جارێک دەبەست، ئەگەر هەرخۆشم بوومایە لەگەڵ مامۆستا کۆبوونەوەی بەردەوامان دەبوو.

### ئاشکرابوون و کۆچکردن:

ئەم خۆشییەی ئێمە زۆری نەخایاند، تازە گەڕابوومەوە بۆ زانکۆ، قۆناغی چوارەم (١٩٨٦-١٩٨٧)، لەبەر بەشداری نەکردنم لە مەشقی هاوینەی جەیشی شەعبی، لە کولییە ناوم لە ڕیزی فەسڵکراوەکاندا لە ئیستعلامات هەڵواسرابوو، من ژمارە(١٥)ی فەسڵکراوەکانی کولییەکەمان بووم، دواتر حکومەت پاش زیاتر لە دوو ساڵ لە ١٩٨٨/٩/١٤ بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ قوتابییە کوردە فەسڵکراوەکان لە خوێندن بەهۆی بەشداری نەکردن لە مەشقی سەربازی جەیشی شەعبی دەکرد، بەندە ژمارە(٥٧) بووم لەسەر ئاستی زانکۆی موسڵ.

مەسەلەی فەسڵکردنم بەجددیی و بەهەند نەگرتبوو، پێموابوو تەنها بۆ هەڕەشە و ترساندنە، خەریکی گەڕانبووم بەشوێن جێگەدا، لە بەشی ناوخۆییەکانی تایبەت بە قوتابیانی کولییەکەی خۆمان، تا ناوەکەم لە ژورێکی موناسبدا تۆمار بکەم، بەڵام لەولاشەوە لەگەڵ (ابو ئیمان) گفتوگۆمان کردبوو لەسەرئەوەی من ماڵم بهێنمە موسڵ و خانوویەکی دووقات بگرم، خوارەوەی بۆ من و خێزانم و قاتی سەرەوەشی بۆ ژمارەیەک لە ئەفسەری پلەداری ئیخوانی کە لە بەرەکانی جەنگی عێراق ـ ئێران هەڵاتبوون، تا خۆیانی تیادا حەشاردەن و دواتر لە دەرفەتێکدا، ڕەوانەی تورکیا یان جێگەیەکی تریان دەکەن.

لە سەروبەندی گەڕانی من بەدوای تۆمارکردنی ناوی خۆم لە ژووری بەشە ناوخۆییدا، بۆئەوەی دواتر ئەمنی ناو یەکێتی قوتابیانی کولییەکەمان، بەدوامدا نەگەڕێن بزانن لە کوێ دەژیم، ئێوارەیەک (ابو ئیمان) هەموو ئەو شوێنانەی کە گومانی بردبوو ڕەنگە منی لێبم بەدوامدا گەڕابوو، ئاخری لە ساحە بچوکەکەی بەردەم مزگەوتی نەبی یونس، بە سەیارەکەی لە تەنشتم ڕاوەستاو گووتی: سەرکەوە، یەکسەر گووتی: کەلوپەل و جانتات لە کوێیە؟ گووتم: لە بەشە ناوخۆیی کۆلێژی زانستە لای چەند برادرێک دامناوە، بەرەو بەشەناوخۆیی ڕۆشتین، دەستی بە قسەکردن کرد و گووتی: ئەمن ژمارەیەک لە برایانی گرتووە و ڕەنگە هەموومان بگرن، خەبەرێکم لە تۆش هەیە، دەبێت فریاکەویت بەپەلە بگەڕێیتەوە بۆ هەڵەبجە؟ جانتامان هێناو چووینەوە ماڵی خۆیان، بەر لە هەرشتێک گووتی: برۆ ئەو حەمامە پاک ڕیشت بتاشە، پاش نانخواردنێکی سادە، گووتی: بەیانی زوو خۆم دەتبەم بۆ نەقلیات بەدەستی خاڵی بگەڕێرەوە، ئەگەرچی ناوچەی ئێوە ئەمین ترە، بەڵام بە مامۆستا و برایانی تر بڵێ: ئاگایان لە خۆیان بێت، نەک بەعس نیەتی هەڵمەتێکی ڕەشبگیری هەموو ئەم هێڵی ڕێکخستنەی ئیخوانی هەبێت.

کە گەڕامەوە لە هەڵەبجە هیچ دەنگوباس و قسەیەک لەوبارەوە نەبوو، تا سەرەتای مانگی شوبات ١٩٨٧، مەفرەزەیەکی ئەمنی هەڵەبجە چووبوونە سەر ماڵی مامۆستا صدیق و داوای مامۆستایان کردبوو، بەڵام قەدەری خوا مامۆستا لە ماڵ نەببوو، لەهەمانکاتدا هەڵیانکوتابوویە سەر مامۆستا حەسەن شەمێرانی، ئەویش لە ماڵی خزمەکانی خۆی حەشاردابوو، بە هەر فێڵ و وەعدێکی درۆ مامۆستایان دەستگیریان کرد، هەرچەندە گەنجان و قوتابیانی ئیسلامی ڕژانە دەوروبەری دائیرەی ئەمن و قائیمقامیەتی شارەکە، هەرچەندە کەسانی بە نفوز و قسەڕۆیشتووی وەک مەرحومی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز هەوڵیاندا بێ سوود بوو، سەرەنجام گەیاندیانە زیندانی (ابو غریب)، لەوێ لەگەڵ ئیخوانە گیراوەکانی تر یەکیانگرتەوە.

شێوە کۆدەنگیەک هەیە لەسەرئەوەی زانیارییەکانی ئەم هێڵی کاری ڕێکخستنەی ئیخوان موسلیمینی عێراق لە گرتن و دانپیانانەکانی خوالێخۆشبوو د.عصام کازم درکێنراون، کە مامۆستای جیۆلۆجی بوو لە زانکۆی سەلاحەدینی هەولێر، ناوبراو لە ڕۆژی ٢٠٠٦/١٠/٣٠ لە بەغدا تیرۆر کرا، بەڵام کێ خەبەری لەوداوە، قسەش لەسەر ئەوە هەیە، بەڵام زۆر ڕوو نییە؟

دواتر من چوومە خزمەت باوکی ڕەحمەتیم و عەرزم کرد ئەمنی حکومەت بەدوامانداە دەگەڕێن، چەند ڕۆژێک لە ماڵ دوور دەکەومەوە لەگەڵ چەند کەسێک(مامۆستا صدیق، مەلا ئەحمەدی شافیعی، مامۆستا محەمەد ڕەئوف، خالیدی کوڕی مامۆستا صدیق) خۆمان پەنادەدەین، پاش چەند ڕۆژێک خۆحەشاردان لە ماڵی چەند ناسیاوێک لە گەڕەکی شێخ سمایل، پاشان جێگەکانمان گۆڕی و من لە ماڵی مامۆستا عەبدولڕەزاق و ڕووناکی خوشکم مامەوە.

تەرتیبی سەفەر بەرەو ئێران کرا، سەعات(٢) ی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢/٧/ ١٩٨٧ لە ڕێگەی ناوچەی نەورۆڵییەوە بە جێبەکەی ڕەحمەتی کاک ئەمیری محەمەد عزیز کەوتینەڕێ تا گەشتینە دەشتی هەڵامەت، کەشوهەوای شەو سایەقە و مانگەشەوێکی زۆر سارد بوو، دوو هاوڕێی شارەزای ڕێگەمان لەگەڵدا بوو، کاک ئازادی دانساز و د.محەمەد ناوێک لە ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئیسلامیی ئێران بوو، کلاشینکۆف و تاقمێکی باشی لەخۆی بەستبوو، لە پێدەشتی هەڵامەتەوە بەپێ بە شاخی باڵامبۆدا هەڵگەڕاین، تا کەناری دەربەند زەنگی لەسەر ڕوباری سیروان، کە بەرامبەرە لەگەڵ سنوری کۆماری ئیسلامیی ئێراندا، قایەغێکی لە قامیش دروستکراوی پەرپووت لەسەر ڕووبارەکە بوو، مامۆستا مەلا ئەحمەدی شافیعی و کاک ئازاد هەرچۆن بێت پەڕینەوە، تا خەبەر بە بنکەیەکی هێزە ئێرانیەکانی ئەو سنورە بدەن، بێن بەدەمانەوە، سەعات ١٢ی شەو تیمێکی سوپای پاسداران کە زۆربەیان قەڵخانی بوون لە ڕووباری سیروانەوە پەڕاندینیانەوە بۆ ناو خاکی ئێران، کاک محەمەد بێ چەک و فیشەک لەگەڵمان هات تا لای قایەغی ئەو دوو پاسدارەی هاتبوون بۆ پەڕینەوەمان کە تەوقەیان لەگەڵ ئێمە کرد، تەوقەشیان لەگەڵ ئەوکرد و بوویە ئەو شوێنەی کە دەڵێن گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە.

قۆناغ بە قۆناغ تا پاش چەند ڕۆژمانەوە لە بنکەی سوپای دڕۆڵە و جوانڕۆ و کرماشان، لە هەر جێگەیەک مەلەفێکی پرسیار و وەڵامیان بۆ دروست دەکردین، کرماشان بەردەوام فڕۆکەی عێراقی بەسەرەوە بوو، تاوە ناتاوە زەنگی مەترسی لێدەدرا، شارەکە تەواو چۆڵکرابوو، بە سەیارەی ئەو بنکەیەی سوپا کە ئێمەی لێبووین هەموو شاری کرماشان و وێرانییەکانیان نیشاندراین.

دواجار براینە باڵاخانەیەکی چەند نهۆمی بنکەیەکی سوپای پاسدارانی نزیک تاقبوستانی شاری کرماشان، کە خێزان و خەڵکی کورد و عێراقی لێبوون، پاش هەفتەیەک گەیەنراینە نوسینگەی بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کوردستان لە چوارڕیانی شوهەدای شاری سنە، ئەم بینایە بەشێکی بارەگای قیادەی تیپی ٢٥ی زەفەری سوپای پاسداران بوو، بەشێکی نووسینگەی نوێنەرایەتی ئایەتوڵڵا مونتەزەری بوو، بەشێکیشی بارەگای نووسینگەی بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی بوو.

**ڕۆژنامەکانی ئێران بەتایبەت عەرەبییەکان خەبەری هەڵمەتی دەستگیرکردن و ڕاوەدوونانی ئیخوانەکانی عێراقیان لەلایەن حزبی بەعسەوە بڵاودەکردەوە.**

وەک وەفایەک دەبێ بڵێم برایانی بزوتنەوەی پەویەندی ئیسلامی هەر لە کاک کامیل حاجی علی، و مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی و مامۆستا شێخ عەبدولەتیفەوە بگرە تا هەموویان زۆر بەدەمانەوەبوون و کارئاسانی زۆریان بۆ کردین.

ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق- بەرابەرایەتی «حوجەتولئیسلام محەمەدباقر الحکیم» یەکێک لە هێزە خاوەن پێگە و ناسراوەکانی عێراق بوو لە کۆماری ئیسلامیی ئێران، لەوپەڕی گەشەکردن و توانایدابوو، باڵی سەربازی هەبوو بەناوی «فەیلەقی بەدر»، زۆربەی حیزب و ڕێکخراوە شیعیەکانی لەخۆی کۆکردبۆوە، لە هەر حیزب و کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی تر ژمارەیەک کەسی کردبووە ئەندامی ئەنجومەنەکەی، وەک کورد و تورکمان، بەو حیسابەی تا نوێنەرایەتی هەموو هێزە ئیسلامییە جیهادییەکانی عێراق بکات، جارێکیان بەندە و مامۆستا محەمەد ڕەئوف لە ماڵی مامۆستا شیخ محەمەد بەرزنجی بووین، لەکاتی گفتوگۆ و قسەکردن لەسەر ئیسلامییەکان و دۆخی عێراق و کێشەکانی ئێمە لەودیو، مامۆستا گووتی: ئەگەر مامۆستا صدیق ئەم دووانەتانم بداتێ

ناوتان بدەمە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق، زۆرێک لەو کێشانەتان چارەسەر دەبێت و پێویستیش بە چەکداربوون ناکات؟ ئێمەش سوپاسمان کرد و گووتمان باوەڕ ناکەین مامۆستا بەوە قایل بێت. بەڕێزی لە دڵسۆزی خۆی بابەتەکەی بۆ پێشنیاز کردین، بەڵام خواهەڵناگرێت هەردووکمان لە دڵەوە زۆرمان پێناخۆشبوو.

پەیوەندییەکی نوێ و هەڵوێستی خۆڵەمێشی:

لە شاری سنە خانوویەکمان گرت، ئەوکات مامۆستا سەلاحەدین بەرپرسی کاروباری ئێخوانە عێراقییەکانی تاراوگەی-وڵاتی ئێران بوو، هەموو عێراقییەکان (کورد، عەرەب، تورکمان) کە لە ئۆردووگاکان و شارەکانی ئێراندا بڵاوببوونەوە.

مامۆستا سەلاح سەردانی مامۆستا صدیقی کردبوو بۆ بەخێرهێنان، دواتر خەبەری ناردبوو مامۆستا صدیق و یەکێک لەو برایانەی هاوڕێی سەردانم بکەن لە کرماشان، مامۆستا صدیق و مامۆستا مەلا ئەحمەد سەردانیان کرد.

بەکورتی پەیام و قسەی مامۆستا سەلاح ئەوەبوو کە لێرە کاری ڕێکخستنی ئیخوانی مۆڵەت پێدراوی ڕێکخستن لەلایەن قیادەی دەرەوەی عێراقەوە-(قیادە الخارج) هەیە، بەندە بەرپرسی ئەو کارەم لەم وڵاتەدا، ئەگەر دەتانەوێت کاروچالاکییەک بکەن فەرموون «پابەندبن بە کار و قیادەی ئێرەوە»، با پێکەوە کار بکەین؟ قسەی مامۆستا صدیقیش ئەوەبوو جارێ نیەتی هیچمان نیە، چاوەڕوانی وەزعەکە دەکەین بزانین ئەم گرتن و ڕاونانە بەکوێ دەگات، ئەگەر بکرێت نیەتی گەڕانەوەمان هەیە، خەڵک و گەنجێکی زۆرمان لەودیو بەجێهێشتووە.

ڕوداوەکانی خۆپیشاندانی ١٩٨٧/٥/١٣خەڵکی شاری هەڵەبجە و تەقاندنەوەی ماڵەکانی گەڕەکی کانی عاشقان، بووبە هۆی کۆچکردنی مامۆستایان (مامۆستا مەلاعوسمان، مامۆستا مەلا عەلی، مامۆستا مەلا عومەر) و ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی تر و خەڵکی شارەکە بۆ وڵاتی ئێران، ئەوانە لە ئۆردووگای سەریاسی نزیک شاری پاوە جێگیر کران، لەنێو کۆچکردووەکاندا خێزانەکانی ئێمە(مامۆستا صدیق، مامۆستا محەمەد ڕەئوف، بەندە) و ژمارەیەکی بەرچاو لە خوشک و برایانی هێڵی ئێمەشیان تێدابوو.

مامۆستایانی کۆچکرد و هەم لەلایەن بەرپرسانی کۆماری ئیسلامیی ئێران و هەم لەلایەن زانایان و سەرکردەکانی بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کە هێزێکی چەکدار بوون، لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٤ وە بە ڕابەرایەتی مەرحومی مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی دامەزرابوو، لەکاتی ئەم کۆچکردنەدا، مامۆستا مەلا عبدولەتیف واژەیی ڕابەری بزوتنەوەی پەیوەندی بوو، زۆر بە گەرمیی و خۆشحاڵی و ڕێز و نرخاندنەوە پێشوازیان لێکرا.

هەرزوو مامۆستا مەلاعوسمان فەتوای(جیهاد و چەک هەڵگرتنی) دەرکرد، بەدڵنیاییەوە زانایان و مەلاکانی هاوڕێی و خەڵکی لێقەوماوی دڵگەرمی کۆچکردوو، هەروەها مەلاکان و سەرکردەکانی بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کاریگەریی یەکلاکەرەوەیان لەسەر وەرگرتنی ئەم بڕیارەی مامۆستا هەبوو.

پاش ماوەیەکی کورت لە گەیشتنە ئۆردووگای سەریاس مامۆستا مەلاعوسمان لەگەڵ وەفدێک لە زانایان سەردانی مەقامات و بەرپرسانی باڵای کۆماری ئیسلامیی ئێرانیان لە تاران کرد، مامۆستا محەمەد ڕەئوفیش وەک سکرتێری مامۆستا لەگەڵ وەفدەکە ڕۆیشت، بەڵێنی هاوکاریی و پشتیوانی سەربازیی و مادی زۆریان پێدرابوو.

من ئاگاداری ئەوەنیم کە مامۆستا مەلاعوسمان لەگەڵ مامۆستا صدیق چ قسە و باسێک چووەتە نێوانیانەوە دەبارەی فەتوای جیهاد و چەک هەڵگرن لەلایەن مامۆستا مەلا عوسمانەوە، چونکە ئەگەر لە ڕووی تیۆریشەوە بێت وەک ئاماژەم پێکرد، مامۆستا مەلاعوسمان بەیعەتی بەهێڵی ڕێکخستنی

ئیخوان موسلیمینی عێراق دابوو، وەک ڕابەری ئەم هێڵەی ڕێکخستن لە کوردستاندا کاربکات، وەک دواتر لە نامەکەی (د.نعمان سامەڕائی) دا بە ئاشکرا ئاماژە بەوەکراوە، لانیکەم دەبوو مامۆستا شتێکی لەوبارەوە بکردایە یان شتێکی بە مامۆستا صدیق بووتایە و بگەیشتایەتە لای ئێمە؟ تا هەڵوێستی خۆمان لەم نێوانەدا ڕۆشن کەینەوە؟ لەگەڵ فەتوای مامۆستا بڕۆین؟ یان پابەندی کاری ڕێکخستن و هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق بین لەگەڵ مامۆستا صلاح؟ بەڵام بانگ و هاواری (حی علی الجهاد) و تۆڵە لە بەعسی کافر و مەلعون، هێنانەوەی تەفسیری ئایەتەکانی جیهاد و قیتال و گوشاری مەلاکان ڕێگەی کەمترین هەناسەی گفتوگۆی لەوبارەوە بڕی بوو، تا ئەو ڕادەی لە وتار و خوتبە و گفتوگۆکاندا دەگوترا هەرکەس لەگەڵ ئەم جیهادە نییە، بە(قاعد) و نەیار سەیر دەکرێت، جۆرەها تانە و تەشەر و سوکایەتی و هەڕەشەی لە دژ دەکرا، تا گەیشتە هەڕەشەی دەرکردن لە ئۆردووگا و بڕینی زەخیرەی خۆراک....هتد.

زانایان و ئەندامانی بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کوردستان بەیعەتیان لەسەر جیهاد و چەک هەڵگرتن بە مامۆستا مەلا عوسماندا، هەموو لە چوارچێوەیەکی نوێدا بەناوی بزوتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق خۆیان ڕێکخست، لە حوزەیرانی ١٩٨٧دا لە شاری سنە بەڕابەرایەتی مامۆستا مەلاعوسمان بزووتنەوەکە ڕاگەیەنرا، دەستکرا بەداڕشتنی پەیڕەو و پرۆگرامی قەوارەیەکی جیهادیی نوێ، زۆربەی مامۆستایان و-مەلاکان-بوونە بەرپرسی مەکتەبەکانی بزوتنەوە، سەرگەرمی ڕێکخستنی سەربازیی و ئامادەکردنی مەفرەزەی جیهادی بوون، بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق بە ماوەیەکی پێوانەیی بەواقیعی هاتە بوون.

سەرلەبەری ئەم دۆخە بۆ ئێمەی هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق وابەستەبوو بەهێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقەوە، بۆیە بۆ ئێمە چاوەڕوان نەکراوبوو، هەروەک ئەم پێشهات و ڕەوشە نوێیە ئێمەی لەگەڵ مامۆستا سەلاح وەک بەرپرسی ڕێکخستنی ئیخوان لە ئێران خستە بەردەم دۆخێکی نوێی نالەبارەوە.

ئەوەی من لە گێژاوی ئەو گۆڕانکارییە خێرا و پێشهاتە چاوەڕون نەکراوانەدا لە جوڵە و کاری مامۆستا صدیقدا دەمبینی و دەمزانی، ئەم زاتە کۆمەڵێک بیر و بۆچوون و تێگەشتن مێشک و هەستی داگیرکردبوو، کە هەندێک جار ناکۆک و هاودژ دەردەکەوتن:

١-نە یدەتوانی و دڵی نەدەهات و بۆی نەدەکرا لە مامۆستا مەلاعوسمان دوورکەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەی هاوڕای فەتوای جیهاد و چەک هەڵگرتنەکەی نەبوو.

٢-بەرگەی توڕەبوون و نیگەرانی مامۆستا مەلا عەلی نەدەگرت، ئەگەر پێشنیازێکی تری جگە لە جیهاد و چەکهەڵگرتنی بۆ مامۆستا مەلا عوسمان بکردایە.

٣-زۆر و کەم متمانەی بەوەنەبوو کە ئەم کۆمەڵە مەلایە بتوانن وەک پێویست ئەم بزوتنەوەیە بکەنە هێزێکی  کاریگەر و بگەیەننە دوا وێستگەی ئامانجەکانی.

٤-ئەو ماوەیەی لە ئێران بووین وێنە ڕەنگاڵەییە دورەکانی ئەم وڵاتەی زۆر لەبەرچاو کاڵبووبوونەوە.

٥-لە قوڵایی دڵ و ویژدانیدا بڕوا و متمانەیەکی لە ڕادەبەدەری بە مەنهەج و تواناو هێز و کاریگەریی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین هەبوو، هیچ شتێکی وەک بەدیلی ئەوان بۆ کاری ئیسلامیی بەلاوە پەسەند نەبوو.

٦-بە هیچ جۆرێک و بە هیچ نرخێک ئامادەنەبوو ئەو کۆمەڵە گەنجەی کە زیاتر لە دە ساڵە بە ئامادەکردن و کۆکردنەوە و ڕێکخستنیانەوە ماندوو بووە، تەسلیم بە کەس بکات، نە بە بزووتنەوەی

ئیسلامیی مامۆستا مەلا عوسمان، نە بە ڕێکخستنی ئیخوانی تاراوگەی مامۆستا سەلاحەدین، بەتایبەت بزوتنەوەی ئیسلامی لەو سەردەمەی دروستکردنیدا. لەسەر هەمان بۆچوون داوای لە هەموو ئەندامانی هێڵی ئێمە کرد کە چاوەڕوانبن و خۆدووربگرن لە بەشداری بزوتنەوە.

نامەیەکی جەنجاڵ خێز:

قیادە چوار قۆڵییەکە (مامۆستا صدیق، مامۆستا ئەحمەدی شافیعی، بەندە، مامۆستا محەمەد ڕەئوف) جۆرێک لێکدابڕان و پێکەوەیی شوێنمان بۆ دروست ببوو، مامۆستا صدیق ئەگەرچیماڵیان لە شاری سنە بوو، بە زۆری لە پاوە و سەریاس لە نزیک مامۆستا مەلا عوسمان دەمایەوە، مامۆستا مەلا ئەحمەد شافیعی لە دەوروبەری شاری بانە بوو لای ماڵی باوکی، بەندە ماڵم لە شاری سنە بوو، مامۆستا محەمەدڕەئوف لە ئۆردوگای سەریاس نیشتەجێبوو.

مامۆستا صدیق هەموو هەوڵی خۆی خستەگەڕ بەڵکو ڕێگەیەک، بوارێک، کەلەبەرێک پەیدا بکات بۆ دەستگەیاندنە بەرپرسێک، کەسێکی خاوەن بڕیاری ئیخوانی عێراقی، یان ئیخوانی دەولی بەمەبەستی وەرگرتنی ڕەزامەندیان لەسەر ئەم فەتوا و بڕیارەی مەرحومی مامۆستا مەلاعوسمان، هۆکارەکانی پشت ئەم هەوڵەی مامۆستا صدیق بریتی بوون لە:

١- بۆئەوەی مامۆستا مەلاعوسمان لە ئیخوان نەپچڕێ و هاوکاری و پشتیوانیان بەدەستبهێنێت.

٢-بۆئەوەی هاوکاریی هێڵی ڕێکخستنی ئێمە بۆ بزوتنەوەی ئیسلامیی چەکدار ڕەوایەتی هەبێت و بێ گرفت بێت، نەک تێکەڵاوبوون و دەمج بوون لەگەڵیان.

٣-بۆئەوەی کۆتایی بە سەرئێشەی پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقی تاراوگە لە ئێران بهێنێت، بەڵام هەوڵەکانی بێ ئەنجام مایەوە، تەنانەت مامۆستا مەلا محەمەدی کوڕی مامۆستا مەلا عومەری برازای ڕەوانەی حەج کرد، بەوهیوایەی لەوێ چاوی بە کەسانێکی بەرپرسی ئیخوانی عێراقی یان مەکتەب ئیرشادی ئیخوان بکەوێت و ئەم واقیعەیان پێ بگەیەنێت و قەناعەتیان پێ بکات لەسەر بڕیارێک و هەڵوێستێک لەسەر ئەم دۆخەی هێڵی ئێمە و ڕابەرایەتی مامۆستا مەلا عوسمان بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی.

مامۆستا مەلاعوسمان نەک هەربایەخی بەم هەوڵ و بیرکردنەوانەی مامۆستا صدیق نەدەدا، بەڵکو هەرکەسێک باسی مۆڵەت و موافەقەتی ئیخوانی بکردایە دەربارەی فەتوای جیهاد و چەک هەڵگرتن، بەڕادەیەک تورە دەبوو، سپی هەڵدەگەڕا، دەیگووت: ئەمە فەرمانی خوایە، مۆڵەتی قورئانە، خەڵکێک، میللەتێک، لەلایەن ڕژێمێکی تاغووتی کافرەوە، لە ماڵ و نیشتمانی خۆیان بێتاوان دەرکرابن و ماڵیان وێرانکرابێت، چی لەمە ڕۆشنترە بۆ جیهاد و ڕووبەڕوبوونەوەی ئەو زوڵم و زاڵمە؟

مامۆستا سەلاحیش لە نێوان دوو قەیراندا بوو، لەلایەک کەسایەتییەکی ناسراوی ئیخوانی لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق فەتوای جیهاد و چەک هەڵگرتنی داوە، لەلایەکی ترەوە خەڵکێکی وابەستە بە هێڵی مامۆستا صدیقەوە باس لە بەیعەت و پابەندی بە ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقەوە دەکەن و هێشتا پابەند نەبوون بەکاری ڕێکخستنی ئیخوانی تاراوگە لە ئێران؟ دەبێت هەڵوێستی خۆی یەکلایی کاتەوە، ئەوەی کارپێکراوە لە ڕووبەڕوبوونەوەی ئەمجۆرە دۆخانەدا بە تەقلیدی کارکردنی حیزب و ڕێکخراوە و کۆمەڵەکان، بڕیار و هەڵوێست بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ و لائیحەی کار وەردەگیرێت، لێرەدا و لەمکاتەدا هیچ یەکێک لەمانە لەبەردەستدا نییە؟ ئەوەی هەیە بڕیاری ئیخوانی عێراقی دەرەوەیە سەبارەت بەو ئیخوانانەی دەچنە دەرەوەی عێراق و پابەندبوونیان بە قیادەی ئەو کار و ڕێکخستنەی لەو وڵاتانەدا دەسنیشانکراوە.

مامۆستا سەلاح ئەم بابەتەی لەگەڵ قیادەی

ئیخوانی عێراق لە دەرەوە-(قیادە الخارج) خستبووە بەر گفتوگۆ، نامەیەکی تایبەتی لە (قیادەی ئیخوانی عێراق/ ڕێکخستنی دەرەوە) بۆ مامۆستا مەلاعوسمان هێنا، ئەوەندەی لە بیرم بێت-کەسێ جار نامەکەم خوێندبۆوە بە پاندانی مرەکەبی شین لەسەر وەرەقەی زەرد نووسرابوو، ئەم شتانەی تیادا هاتبوو کە من بە خاڵ دەینووسم:-

١-وەسف و مەدح و تەقدیرێکی زۆری مەرحومی مامۆستا وەک زانایەکی پایەبەرز و موجاهید و موجتەهید و خۆشەویستی هەمووان، دەربڕینی هاوخەمی میحنەتەکان و دوعای خێر و سەبر و ئارامی بۆ زانایان و ئەو خەڵکەی کۆچی کردووە لەگەڵ مامۆستا، بەناوی هەموو قیادەی ئیخوانی عێراق/ ڕێکخستنی دەرەوە.

٢-ئێمە ئاگادارین کە لە باکووری خۆشەویست-(شمالنا الحبیب)- لەلایەن جەماوەری گەنجانەوە بە فەرمانی ناوەند بەیعەتتان پێدراوە،-مەبەست هێڵی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمینی ناوەوەیە وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، زانایانی ناوداری تاراوگە ئەمەیان پیرۆز کردووە.

٣-پێمانگەیشتووە کە بڕیاری هەستان بە ئینکاری مونکەرت داوە، انشاالله پاداشتی ئیجتهادەکەت هەیە و پێکاوتانە لەو سنورەی کە دەیزانن و دەیبینن، ئەم هەنگاوە مەترسیدارە، پێویستی بە ڕاوێژکردن و بەکارهێنانی کەناڵەکانی ڕێکخستنی شەرعی هەیە، ئێستاش دەتوانن پلان و کاروبارەکان بەگوێرەی ڕێککەوتنەکان بگۆڕن.

٤-ڕێککەوتن لەگەڵ قیادەی کۆنی جەماعەت لە ناوخۆ کراوە، لەسەر دروستکردنی ڕێکخستن لە دەرەوە، ئەوە چەند ساڵە برایەک وەک بەرپرسی ئەم کارە دەسنیشان کراوە،-واتە قیادەی ڕێکخستنی ئیخوان موسلیمینی عێراق لە دەرەوەی وڵات هەرکەسێکی ئیخوانی بەهەر هۆیەک لە دەرەوە بێت سەرلەبەری فەرمان و ئاڕاستەی ئەو دەبێت، ڕێکخستنی ئیخوانی دەولی ئاگادارکراوەتەوە، بەشداریی بەیعەتدانمان بە بەڕێز ڕابەری گشتی ئیخوان موسلمین کردووە.

٥-لە هەر وڵاتێکی دەرەوەی عێراق کە کۆمەڵێک ئیخوانی عێراقی لێیە بەرپرسێکی بۆ هەڵبژێراوە، پەیوەستە بەسەرکردایەتییەوە، کۆبوونەوە و ڕاوێژ و لێپرسینەوە هەیە و بەردەوامە، ئەوە چەند ساڵە (أبو پیام)-ـ مەبەست مامۆستا سەلاحەدین محەمەد بەهائەدینە ـ- بۆ ئەم ئەرکە لەو وڵاتە هەڵبژێراوە مافی گوێڕایەڵی هەیە بەسەر ئیخوانە عێراقییەکانی تاراوگە لە ئێراندا، ئەو بەیعەتانەی لە ناوخۆدا دراون بە«دابڕاو» دێنە هەژمارکردن بۆئەوەی ئیزدواجیەتی سەرکردایەتی و ئاڕاستەکردن و فرەبەرپرسی لە یەک وڵاتدا دروست نەبێت، ئێوە-ـ مەبەست مامۆستا مەلاعوسمانە ـ بە جیهاد و خۆڕاگریتان لە هەموو ئەمانە گەورەترن و خۆشەویستی و ڕێزتان لە سەرووی هەموو ئەمانەوەیە، بەڵام مافی دەعوەیە بەسەر هەموومانەوە کە پابەندبین بە پەیڕەوەکانییەوە.

٦-ڕێکخستنی ئیخوانی نێودەوڵەتی پابەندی کردووین بە دوو خاڵ:

١-مادەیەکی یاسای بنەڕەتی هەیە کە دەڵێت: نابێت بەبێ مۆڵەتی ئەوان ئەم(٣) کارانەی خوارەوە ئەنجام بدرێت:

أ- چەک هەڵگرتن یان شۆڕشکردن دژی هەر دەوڵەتێک.

ب-بەشداریی لە حکومەت و وەزارەت.

ج-هاوپەیمانی لەگەڵ حزبی غەیری ئیسلامیدا.

٢-مەکتەبی ئیرشاد بەرامبەر بە ئێران ڕێگای بێلایەنی هەڵبژاردووە، نە پیاهەڵدان و نە ناشیرینی پێگوتن، نە هاوکاریی و نە دژایەتیکردن لە هیچ شتێکدا، لە سەردەمی ئەم دوو ڕژێمەدا-ـ واتە ڕژێمی بەعس و حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران ـ بەشداریی برایان لە مەسەلەی چەکداریی و جەنگدا لە شتە قەدەغەکراوەکانە.

٧- ئەگەرچی ئەزانین بۆ ئێوە قورسە بەپەلە

لە سەرکردایەتی ئەم زانایانە دورکەویتەوە، بەڵام وردە وردە لێی بکشێرەوە، کارەکە بسپێرە بە (ابو محمد) -ـ مەبەست مەرحومی مامۆستا مەلا عەلییە -ـ بیگرێتە ئەستۆی.

نامەکە گەیشتە دەست مامۆستا مەلاعوسمان، کە وابڕیارە شەخسی و نهێنی بێت، ناوەڕۆکی پەیوەستە بە بڕیار و ڕای تاکەکەسی مەرحومییەوە، کە چی دروست بەپێچەوانەوە دەرهات، وەک بۆمبێک بەناو هەموو مەلاکان و موجاهیدان و هەموو خەڵکی ئۆردووگا و هەموو ئیخوانییە عێراقییەکاندا تەقییەوە، بوویە باسی ناوخێمە و ماڵان، تەوژمێکی توندی غەیبەت و ناوزڕاندن و تانە و لۆمە و بگرە سوکایەتی پێکردنی بەدوای خۆیدا هێنا، مەلاکان و گەنجان و پیاوی خوێندەوار و نەخوێندەوار و تەنانەت ژنی ماڵەوەشی گرتبۆوە، هەرلایەک بە غەرەز و مەبەستێک.

بەینی خۆم و خوا بەندە لە هەموو قۆناغەکانی ئەم چەلەحانێ و مشتومڕ و غەیبەت و زەمکردن و تانە وتەشهیرەدا، بە هەموو توانام هەوڵمداوە کە زمانی خۆم بگرم و پێنەخەمە ناو زەلکاوی غەیبەت و یەکتر شکاندن، کەسێکی ئارامبم، هەر لە سەرەتاوە پێموابوو ئەمە بەریەککەوتنی بەرەی دوو ئایدیۆلۆجیای جیاوازی هاودژ، یان دووڕەوتی ئەزموونی دینداریی سەلەفیەت و ئیخوان، یان ناکۆکی دوو مەزهەبی جیا نییە؟؟ هەر پاساو و تەفسیرێکی بۆ بکرێت لە دواجاردا لایەنی دەروونی و هەست و ئیحساسی کەسەکان بەرامبەر یەکتری پشکی گەورەی هەیە؟

سەبارەت بە نامەکە، زۆرکەس هەبوون ئەو کات و دواتریش لە دیمانە و بەرنامەی تەلفزیۆنیدا وەک نیشاندانی حەقانیەت و پێداگری مامۆستا مەلاعوسمان لەسەر جیهاد و بەرگریکردن لە مەزڵومیەتی گەلی کورد، دەیانگووت: مامۆستا مەلا عوسمان (بسم الله)کەی لە نامەکە کردووەتەوە و نامەکەی خستووەتە ژێرپێی، لەڕاستیدا ئەو قسەیە ناڕاست و بێ بنەمایە، ڕاستییەکە ئەوەیە، پاش عەسرێکی دەمەو مەغریب مامۆستا صدیق هات بۆ ماڵمان لە شاری سنە و نامەیەکی دایەدەستم و گووتی سبەی ئەم نامەیە بگەیەنەرە دەستی مامۆستا سەلاح لە کرماشان، ئەمانەتە، داوای کردبوو پاش خوێندنەوەی بۆمی بگێڕنەوە، نامەکە سەری دانەخرابوو، شەو دووسێ جار خوێندمەوە، بەیانی بردم بۆ کرماشان و تەسلیمی مامۆستا سەلاحم کرد، سەیرێکی کردم و گووتی: کۆپیت نەکردووە، گووتم: نەخێر، بەڵام خوێندوومەتەوە.

ئیتر نازانم چیرۆکی ئەم ژێرپێخستنەی نامەکە، کە لە کەسایەتییەکی مامۆستا مەلا عوسمان نەدەوەشایەوە، لەکوێوە هاتووە.

ڕێکخستنی ئیخوانە عێراقییەکان لە ئێران بە سەرکردایەتی مامۆستا سەلاح لەلایەک کەم نەبوون، لەلایەکی ترەوە لە نەتەوەی جیاوازی کورد و عەرەب و تورکمان بوون، تێکڕایان تا سەرئێسقان عێراقچی بوون، تەواو نیگەران و وەڕەسبوون لە ڕەفتاری مەزهەبیگەرایی حکومەتی ئێران، دیارە کە عەرەبی ئیسلامیش لە هەر جێگەیەکی دنیا بێت هەڵگری ڕۆحی عوروبەیە. بەدڵنیاییەوە هەموو ئەم دید و تێگەیشتنانە فەزایەکی ئەستووری دژایەتیکردنی هەر هێز و جوڵانەوەیەکی سیاسی/ چەکداری لە پەنای کۆماری ئیسلامی ئێراندا لە ناوخۆی خۆیاندا دروست کردبوو.




# گەشتێك
# بۆ كوردستانی باشوور



**نووسینی: ویتۆڵد ڕاژكۆوسكی**
**وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: ڕەوەند سەباح ئەحمەد**

لەدایكبووی ١٩٧٧، شەقڵاوە، ماستەر لە زمانی ئینگلیزی، مامۆستا لە وەزارەتی پەروەردە و وانەبێژ لە بەشی زمانی زانكۆی تیشكی نێودەوڵەتی لە هەولێر.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوکەوە دەستمان بە گەشتەکە کرد، لە پێشەوەی تەکسی لەگەڵ دۆستێکی بازرگانی قەڵەوی ناوچەکە دانیشتبووم. لە ڕووبارە وشک بووەکە پەڕینەوە، ڕووبارەکە شارەکەی دەکردە دوو بەش. قەڵایەکی کۆن بەسەر بازاڕەکەی دەڕوانی، ئەو قەڵایە بە کۆنترین گەڕەکی شارەکە دادەنرێت. کۆمەڵە خانوویەک لەسەر تەپۆڵکەی قەڵا ڕەنگ خۆڵەمێشییەکە هەبوون. لە دوورییەوە منارە لێژ و مەیلانەکەی تەکییەی تاڵەبانی دەبینرا، بەسەر گەڕەکێکی تری دەڕوانی. هەر کە لە شارەکە دەرچووین، زنجیرە پۆپەیەکی خڕی درێژ لە بەردەممان بەدرێژایی تەواوی ئاسۆیەکە بەرچاو دەکەوتن. ڕێگاکەمان هێدی هێدی بەرەو بەرزی دەچۆوە، گەیشتینە ڕێیەکی بەرزی نێوان چەند گردێک، ئەمبەر و ئەوبەری لێژایی گردەکە بە گیای وشک داپۆشرابوو. دیمەنی گرد و گردۆڵکەکان، شەق و درز و کەلێنی نێوانیان و بە ڕەنگی زەرد و ژەنگاوی دیدی چاوەکانی تێر تێر دەکردین. لە پشت ئێمەوە، لوتکەی ئەو تەپۆڵکانەی بەجێمان هێشتن، بڵێسەی دوو ئاگر و دووکەڵەکەیان پاڵاوگەی نەوتی باباگوڕگوڕیان تەنی بوو. پاش ماوەیەک کەوتینە نێو چەند تەپۆڵکەیەک، بەتەنیشت گوندێکی بچووک ڕەت بووین بەناوی قەرەهەنجیر١. کۆمەڵە کابینە و کۆخێکی نزمی لێ بوو، میچە تەخت و پانەکەیان لە قوڕ و لق و پەلی دار دروستکرا بوو. بۆ ماوەیەک لەگەڵ ڕێچکەی ڕووبارەکە و دۆڵە پڕ سەوزاییەکە و نێوان دارچنارەکان ڕۆیشتین.

پاش سەعاتێک لێخوڕین لە جادەی پێچاوپێچ و بەرز و نزم، گەیشتینە چەمچەماڵ. لە شارۆچکەکە لە نزیک چایخانەیەک لامان دا، چەند کوردێک بە جامانە و مێزەری ڕەش لەسەر چەند کورسییەک دانیشتبوون، خەنجەریان لەناو کەمەر گیر کردبوو. خەڵکی ئەو ناوچەیە سەر بە عەشیرەتی هەمەوەندن، ئێستا جووتیاری بێ کێشە و گیروگرفتن، بەڵام جاران بە چەتە و شەڕکەر ناسرابوون. ناو چایخانەکە بە دووکەڵ و تەنی ڕەش هەڵگەڕابوو، تەنیا شتێک، کە بەخاوێنی مابۆوە و بریسکەی دەدا لە گۆشەیەکی ژوورەکە، سەماوەرە مسییە زەردە گەورەکە بوو. لە ژوورەوە، لە بەرامبەرمان گردێکی هێلکەیی سەیر دەبینرا، تەنیا پاشماوەی قەڵایەکی کۆنی تورکی بوو لەو ناوە.

چایخانەمان بەجێهێشت، نەچووینە ناو چەمچەماڵ، پاش ماوەیەک، گەیشتینە نێو ناوچەیەکی ئاڵۆز و چڕ و پڕ لە شاخی بەرز و چاڵ و کەندەڵان و لێژایی سەخت و عاسی. لووتکەی گردەکان بە پووش و گیای وشکەوەبوو داپۆشرابوو، هەمووی پووشەڵان بوو، بەڵام لێژاییەکان ڕووت بوون، وەک ڕەنگی خشت خۆیان دەنواند. لەو شوێنانەی زۆر لێژایی بوون وەک دیوارێکی سوور وابوو لەسەر چاڵ و کەلەبەری تەنگدا.

ئێستا لەو هەردە بانان و چۆڵ و بیابانە هاتینە دەر بەرەو دەشتاییەکی فراوان و پان بەڕێ کەوتین. وردە وردە بەرەو خاکێکی بەرز و زنجیرە چیایەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی، کە ئاسۆی ئەو ناوەی پڕاوپڕ کردبوو دەڕۆیشتین. هەرکە لەو زنجیرە چیایە نزیک کەوتینەوە، ئەو زنجیرە چیایەی ڕووی لە ئێمە بوو، چەند پارچە شاخێکی گەورە لە ڕووی چیاکە داڕمابوون. ددان و ڕۆخە تیژەکانی ڕوو لە ئاسمان بوون. دۆڵێکی قووڵ زنجیرە شاخ و داخەکەی بەردەمی ئێمەی دەکردە دوو لەت، وەک دەرچەیەکی گەورەی لێکردبوو، ددان و کەڵبە شاخی هەر لایەک لەو داخانە بە قیت و قنجی وەستا بوون. پێشووتر ئەو دەروازە بە دیوار داخرابوو، تەنیا چەند پارچەیەکی کەمی دیوارە تێکشکاوەکە لەو شوێنە مابوونەوە.

ئەو دەروازەیەش، بە ڕێگا بەناوبانگەکەی دەربەندی بازیان ناسرابوو، قوڵغەیەکی پۆلیس، کە تاوەرێکی لەسەر بوو، لە گۆڕەپانی نزیک دەروازەکە هەبوو. لە بەردەمی تێپەڕین، بەنێو دەروازە

سروشتییەکەدا ڕۆیشتین. هەرچەندە لێژاییەکانی بەرز و سەختن و پڕ تاشەبەردبوون، بەڵام بە گژوگیا داپۆشرابوون. بەردێکی سپی گەورە لە دووری ٢٠٠ یارد لە سەرووی ڕێگاکە سەرنجی ڕاکێشام، چونکە ئەو شوێنە بوو، کە هێزەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٨ شێخ مەحموودیان تیادا دەستگیر کرد. لەو لای دەربەندی بازیان، بنکەیەکی تری پۆلیسی لێ بوو.

پاش کەمێک ڕۆیشتن لەنێو ئەو ڕێگا گرداویانەی کە پڕ لە هەڵبەز و دابەز و پێچاوپێچ بوون، ڕوومان کردە باکوور، بەنێو ڕێگای دووەم گوزەرمان کرد، لە ڕێگای یەکەم نزمتر بوو. لە لووتکە دەمان ڕوانییە خوارەوەی بنە تەخت و پانەکەی دۆڵێکی گەورە، کە سێبەری زنجیرە شاخێکی دووری بەسەردا دەشکایەوە. ئەو زنجیرە چیایە لە بەری چەپی ئێمە بە لوتکەیەکی شێوە سێگۆشەیەک کۆتایی پێ دەهات، کە بە پیرەمەگرون ناسرابوو. چەند دوورییەک لە بەری ڕاستمان شاری سلێمانی وەک پەڵەزەوییەکی سپی دەرکەوت.




بە قەدبڕی لە دۆڵەکە بەنێو چەند کێڵگەیەکی قامیش تێپەڕین، پاشان لە چەمی وشکەوەبوو و پڕ لە چەو و بەردی ئۆبارا (Obara) و لە نێوان باخی دارچنار کە ئەملاو ئەولای کەناری ڕووبارەکەی سەوزپۆش کردبوو، پەڕینەوە. لە بەردەم ئێمە، جادەی سەرەکی سلێمانی هەبوو، جادەیەکی گەورە بوو، بە باشی قیرتاو کرابوو، لە تەنیشت جادەکە چەند خانوویەکی یەک نهۆمی دروست کرابوون. لە کۆتایی، گەیشتینە گۆڕەپانێکی گەورە، چوارڕیانێک بوو، لەبەری باکووری، سەرای لێ بوو، لەگەڵ بارەگا و چەند فەرمانگەیەکی دەسەڵاتی خۆجێیی، هەروەها باڵەخانەیەکی گەورەی لێ بوو، لەبەرد دروست کرابوو، لە شوێنی ئەو باڵەخانەیە جاران کۆشکە کۆنەکەی میری بابانەکان قیت وەستابوو. لە بەرامبەر گۆڕەپانەکەدا دوو چایخانە هەبوون، لە قەرەباڵغی جمەیان دەهات.

شەوێک لە سلێمانی مانەوە، جێ و ڕێیان لە باشترین هۆتێل بۆ کردمەوە، هۆتێلەکە سەرخانێکی کۆن بوو، لە ناوەڕاستیدا حەوشەیەکی لێ بوو، بە چەند باڵکۆنییەکی درێژ دەورە درابوو، خەڵکانێکیش لەسەریان دانیشتبوون، جگەرەیان دەکێشا و چایەیان دەخواردەوە.

کاتێک لە سلێمانی بووم، دەرفەتم بۆ ڕەخسا، دوو کەسایەتی ڕۆشنبیریی شارەکە ببینم. یەکێکیان سەید ڕەفیق حلمی بوو، بەناوبانگترین نووسەری کورد بوو، بەڕێوەبەری پەروەردەی ناوچەکە بوو. ئەوەی تریان حاجی تۆفیق بوو، زیاتر بە پیرەمێرد ناسرابوو. پیرەمێرد نەک تەنیا شاعیر بوو، بەڵکو هەم نووسەر بوو، هەمیش سەرنووسەری هەفتەنامەی ژین بوو، بە یارمەتی کەسێکی تر لە چاپخانەیەکی بچووک لە چاپیان دەدا. ڕاستە نەیتوانی زیاتر لە چوارسەد دانەی لێ لە چاپ بدا، بەڵام ئەوەش بەهۆی کورتهێنان بووە لە برِی کاغەزدا. سلێمانی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کوردییە، لە ڕابردوودا زۆربەی کتێبەکانی بە زمانی کوردی لێرە سەرچاوەیان دەگرت. هەرچەندە لەو سەردەمە لەو باوەڕەدام، لە کتێبی قوتابخانە بترازێ هیچی تر لێ چاپ نەکردووە.

ناوی ٢مێجەرسۆن (Major Soane)، یاخود ڕاستتر بڵێین غولام حوسێن (Ghulam Hussain)،

ئێستاشی لەگەڵ بێت لەسەر زاری خەڵکی دەبیسترێت، تا ئێستاش نازناو و شوێن پێی ئەو کەسایەتییە دیارە لە گوێی خەڵکەکە دەزرینگێتەوە. لە سوچێکی بازاڕ نافوورەیەکیان نیشاندام، مێجەرسۆن لەژێر ئەو نافوورەیە نوێژی دەکرد. خودی بازاڕەکەش لەلایەن ئەو پێشکەش بە خەڵکی سلێمانی کراوە، دوای ئەوەی شەوێک کاولە باڵەخانە کۆنەکەی بازاڕی تێکداوە و ئاگری بەرداوەتە بەر. هەتا چاپخانەکەی پیرەمێردیش لەلایەن ئەو دامەزراوە.

بازاڕی ئەو ناوە هێندە هەمەچەشن نییە، بەلای من هێندەی بازاڕی کەرکوک خۆش و دڵگیر نەبوو. بازاڕەکە لە شەقامی تەنگ و قەرەباڵغ پێکهاتبوو، پشێوی پێوە دیار بوو. هەندێک لە دوکانەکان بە میچ بوون، هەندێکی تر بێ میچ بوون. دوکانەکان بچووک بوون، بە تەک یەکەوە کەلوپەلی هاوەردە و بەروبوومی خۆماڵییان دەفرۆشت. لە سلێمانی چاوم بە کڵاوی ڕەنگاوڕەنگ و درەوشاوە و گۆرەوی لە خوری دروستکراوی سپی و سۆڵی نەخشێندراو و کڵاشی هەورامی کەوت. لە بازاڕەکە خەنجەر فرۆشیش بەرچاوان دەکەوتن، خەنجەری گەورە و چەماوەیان لە پشتێن و کەمەر گیر کردبوو، کە بەشێکی دانەبڕاو بوو، لە جلوبەرگی نەتەوەیی کوردی. خەڵکی ناوچەکە جیا لەو خەڵکەی لە دوور لە باکوور دەژی، بە زۆری جلی درێژ دەپۆشن، ئەگەرچی شەرواڵەکانیان فش و فۆڵن، لەگەڵ ئەوەش زۆر باون. لێرەش، وەک هەر شوێنێکی تر، سەرپێچەکانیان جامانەی گەورە و بەریشوو و مشکیین. ئافرەتەکان کراسی لۆکەیی گوڵداری بنەچە ئەورووپی دەپۆشن، هەندێکیشیان، هەرچەندە ڕووخساریان داناپۆشن پەچە و سەرپۆشی سپی سادە لە سەر دەکەن. دیاربوو، لەناو ئاپۆراکە دەروێشی قادری لێ بوون، بە ڕیشی تەنک و قژی درێژ، کە بە زۆری کەزی پرچیان لە دەوری کڵاوە قوچەکییەکەیان دەئاڵاند و دایان دەپۆشی.

جگە لەو دوو جادە سەرەکییەی سلێمانی، زۆربەی جادەکانی سلێمانی کوچە و کۆڵانی تەنگەبەر و داخراو بوون. خانووەکانیان یەک نهۆمی بوون، سەربانی خانووەکان تەخت و پان بوون، دیواری خانووەکانیان بە گڵ و قوڕی زەرد سواغ درابوون. لەناو زۆربەی خانوەکان حەوشەی گەورە و فراوان هەبوون. تۆزێک بە لای باشووری ڕۆژهەڵاتی شارەکە، گردێکی درێژی بەردانی و بەردەلانی لێ بوو، گومەزی قەبرەکان بریقەی دەهات لە نێوان دارتووەکان. لێرەش، بەهەمان شێوە، چەند گلکۆیەکی سپی لەناو زەوییەکی زیخ و چەوی سوور قیت کرابوونەوە، بە نەخش و نیگاری چڕ و پڕ هەڵکۆڵرابوون، هەندێکی ترشیان بە پارچەی بچووکی شوشەی شکاو و گڵێنە ڕازێنرابوونەوە.

زۆر لە سلێمانی نەمامەوە، دوای عەسر بەڕێکەوتم. سواری لۆرییەک بووم، بەرەو هەڵەبجە ڕۆیشتین. لە دەوربەری سلێمانی لە دوورەوە زنجیرە چیای بەرز و نزم هەن. تەواوی ناوچەکە پووش و پەلاش بوو و زەرد دەبریسکایەوە. لە ڕێگا لە چایخانەیەک لاماندا و وەستاین، ئەو چەند دارەی لە وێ چاندرابوون، دیمەنێکی سەوزایی دڵگیری پێ دابوو. دووبارە لە بنکەی پۆلیسی ماوان (Mawan) ڕاوەستاین، دارمان لە لۆرییەکە بارکردن.

نزیک شەش حەوت میل لە پشت ماوان گردێکی کۆن و دێرین لە بەری ڕاستی ئێمە هاتە بەرچاوان، وەکوو هەمان ئەو گردە دێرین و کۆنانەی کەرکوک و هەولێر وابوو، لە نێوان ئێمە و گردەکە زۆنگاوێکی گەورە و فراوان هەبوو، ڕێگەکەمان لە دەوری ئەو زۆنگاوە پێچی دەکردەوە. ئەوەندەی پێنەچوو، لە خوار گوندێکی بچووک وەستاین. ئافرەتان بە تەنەکە ئاویان لە پەنگاوە وەستاو و بۆگەنەکە دەگواستەوە، کە لە مێش و مەگەز تێکرژا بوو (مەلاریا ئەو تاعوونە بەربڵاوەیە کە سەرتاپا ناوچە شاخاوییەکانی عێراقی تەنی بوو).

پاش ماوەیەکی کەم، گەیشتینە ناو دەشتە کاکی بەکاکییەکەی شارەزوور، لە ڕۆژهەڵات لەگەڵ زنجیرە شاخە گەردن کەشەکانی هەورامان هاوسنوور بوو. لێرە و لەوێ کۆمەڵە خێوەت و ڕەشماڵ هەڵدرابوون. لە دوورەوە هەندێک ناوچەی سەوزایی و شینایی و بێستان و باخەکانی هەڵەبجە وەدیار دەکەوتن. لە جادەی سەرەکی چوینە ناو شارەکە، لە ناوەڕاستی شارەکە لە گۆڕەپانێکی بچووک تێپەڕین، لە ناو حەوشەیەک وەستاین.

لەو ماوەیەی لە هەڵەبجە بووم، میوانی حامید بەگی جاف بووم، پیاوماقوڵێکی ناوچەکە بوو، خانوویەکی گەورە و دوو نهۆمی لە خوارووی شارۆچکەکە هەبوو، نامەیەکم لە کوڕەکەی، کە لە بەغدا قوتابی بوو پێ بوو. لە دەرەوە کۆشکەکەی وەک قولغە و قەڵایەک وابوو، بەڵام لە ناوەوە هەرسێ لای خانووەکە بە باخچە دەورە درابوو. کۆشکەکە ڕووی لە باکوور بوو، بەسەر ناوچە دەشتاییەکانی شارەزووری دەڕوانی، لە دوورەوەش دیمەنە سەرسوڕهێن و ناوازەکانی چیاکانی هەورامانت دەدیت. لەگەڵ ئاستی نهۆمی سەرەوەی خانوەکە، ڕاڕەوێکی درێژ بە دەوری دیوارەکە دەسووڕایەوە. لەناو خانووەکە ژووری گەورە هەبوون، کەلوپەلی ناوماڵ بە شێوازی ئەورووپی سازکرا بوو. هەر لە دوای گەیشتنم، لەناو یەکێک لەو ژوورانەدا. لە یەکێک لە بانگهێشتەکان زۆر چێژم لە خواردنی ژەمە خۆراکێکی زۆر و زەوەند و دەستبڵاوی کوردەواری وەرگرت. لە ژوورێکی تر جێگای خەوتنم بە چەرچەف و سەرجێگای خاوێن لەگەڵ چەندین نوێن و پێخەفی تر لە ژوورەکە ساز و ئامادە کرابوو. ئێوارە لەگەڵ حامید بەگ سەردانی یانەی فەرمانبەرانمان کرد، ئەو یانەیە تازە بۆ فەرمانبەرانی خۆجێی میری کرابووەوە، ئەو یانەیە لە دوو ژووری بچووکی قەرەباڵغ پێکهاتبوو. لە ژوورە گەورەکە، لەنێو دووکەڵی جگارە قوماریان دەکرد، لە ژوورەکەی تر ئارەقیان دەخواردەوە.

لێرە، لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی پلەوپایە بەرزی ناوچەکە یەکترمان ناسی، لەوانە مودیری ناوچەکە، یەکێکی تریان کارمەندێکی پزیشکی بوو. زۆربەیان کەسی بەرز و دیاربوون، هەندێکی تریشیان پۆشاکی کوردەواری گرانبەهایان لەبەردابوو.

بۆ ڕۆژی دواتر سەرێکم لە بازاڕی ناوچەکەدا، کۆمەڵێک جووتیار سەودای کڕین و فرۆشتنی سەوزە و میوە و قوماش و کەلوپەلی ناندین بوون. بازاڕەکە باڵەخانەیەکی لە بەرد دروستکراوی لاکێشەیی بوو، سەربانەکەی گومەزێک بوو. لەمبەر و لەوبەر، دوکانی بچووک لە ڕاڕەوەکە هەبوون، بازرگانەکانیش لەسەر کورسی دانیشتبوون، لە سەر مێزەکە ملپێچی ڕەنگاوڕەنگ و کراسی ئافرەتان و کڵاو و گۆرەوەی لە خوری چنراوو و لەگەڵ چەند شتومەکێکی تر دانرابوون.

زۆربەی باڵەخانە و کۆشکە گەورەکان لە شارەکە دەکەونە ئەوبەری شەقامی سەرەکی. خانووی دەوڵەمەندەکان و فەرمانگە حکومییەکان و بەندیخانە و نەخۆشخانە، هەموویان لێرە، لەنێو باخچە و باخە پڕ سێبەرەکان بوون.

هەروەک پێشبینیم کردبوو، زۆربەی حاڵەتی نەخۆشەکان لە نەخۆشخانە، حاڵەتی تووشبوون بوو بە پەتای مەلاریا. کێڵگەکانی چاندنی تووتن کەوتبوونە پشت شارۆچکەکە.

لە خانەخوێکەم، حامید بەگ و ئامۆزاکەی حەسەن بەگ، هەندێک بەڵگە و ڕاستیم لەسەر عەشیرەتی جاف کۆکردەوە. حەسەن بەگ کۆمەڵێک سەرچاوە و کتێبی تورکی و فارسی و عەرەبی لەبەردەستدا هەبوو، زۆربەی کتێبەکان سەرچاوەی مێژوویی بوون، هەربۆیە زۆر حەز و خولیای هاوبەشمان هەبوو تاکو گەنگەشە و گفتوگۆی لەسەر بکەین. لە کتێبی (شەرەفنامە) باسی عەشیرەتی جاف نەکراوە، هەرچەندە باسی عەشیرەتەکانی باشوور دەکات. شەرەفنامە، سەرچاوەیەکی مەزن و گەورەی مێژووی کوردە،

شەرەفخانی بەدلیسی ئامادەی کردوە. لەوانەیە سەرکردە و گەورەکانیان بەناوی والی ئەردەڵان کاریان کردبێت، سەر بە ئەوان بوون، تاکو کارەکانیان بخرێتە پاڵ ئەوان. یەکەم سەرکردەی جافەکان، کە مێژووەکەی تۆمارکرا بێت، زاهیر بەگ بووە. زاهیر بەگ لەلایەن یەکێک لە حاکمەکانی بابانەکان لە سلێمانی بانگهێشت دەکرێت، تاکو واز لە ئەردەڵانییەکان بێنێت و بێتە پاڵ بابانییەکان لە سلێمانی، لە شارەزوور نیشتەجێ بێت و ببێتە بەرپرسیاری بەرگریکردن لە شارەزوور. زاهیر بەگیش ئەو داوایەی حاکمەکەی بابانەکان قبوڵ دەکات، لەگەڵ خۆی بەشێکی گەورەی عەشیرەتی جاف دێنێت، پەیوەندی بە بابانەکانەوە دەکەن، لە ناوچەی دیزیایش (Diziaish) نیشتەجێ دەبن. بەم کارە والی ئەردەڵان زۆر توورە دەبێت، بڕیار دەدات، سزای سەرکردەی جافەکان بدات. واپێدەچێت، دواتر، گەشتێک بۆ کەربەلا دەکات بە مەبەستی حەجکردن. لە ڕێگە، لەگەڵ دەست و پێوەندەکەی لە شوێنێک بەناوی پێباز (Paibaz) لەسەر ڕووباری دیالە دەوەستێت، هەر لەو شوێنە بانگهێشتی زاهیر بەگ دەکات، بۆئەوەی چاوی پێ بکەوێت. زاهیر بەگ، بەبێ ئەوەی هەست بکات، کە ئەمە خیانەتە و دەستدرێژییە، خۆی و داورودەستەیەکی کەم بەڕێ دەکەون، ڕاستەوخۆ دەستگیردەکرێت و دەکوژرێت. نەوەکەی کەیخەسرەو بەگ (Kai Khosrow Beg) دەبێتە مێوانی س.ج. ڕیچ (C.J. Rich)، نیشتەجێی بەریتانی لە بەغدا لە ساڵی ١٨٢٠. سەرەڕای ئەو ستەمەش، عەشیرەتەکەی لەژێر فەرمانڕەوایی میرەکانی بابانەکان دەمێننەوە. لەگەڵ ئەوەش بەردەوام هاوینان سەردانی وڵاتی فارس دەکەن، چونکە لەوەڕ و پاوانیان لە دەوروبەری شاری سنە هەبوو.

لەڕاستیدا، ئەوان هەتا ئەم دواییانەش، هەموو ساڵێک لەو کارەیان بەردەوام بوون، بەهۆی ئاستەنگەکانی حکومەتی فارس، بەشێوەیەکی کاتی دەستیان لەو کارە هەڵگرتوە. چەند تیرەیەکی سەر بە عەشیرەتی جاف، وەکوو: وەڵەد بەگی (Waladbagi)، قوبادی (Qobadi)، بابەجانی (Babajani) لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی وڵاتی فارس ماونەتەوە. هەر لە دێرزەمانەوە، عەشیرەتی جاف، خێڵێکی کۆچەریی و ڕەوەندی بوون، بەڵام لەو چەند ساڵەی دوایی، خۆیان جێگیر کردووە و دامەزراون. پاش ماوەیەکی کەم، هەندێک لە خانەدان و بەگزادە و ئەندامانی بنەماڵەی دەسترۆیی (بەگزادەکانی جاف) عەشیرەتی جاف دەوڵەمەند بوون، بوونەتە خاوەن موڵک و زەوی و زار. لەنێو ئەو سەرکردانەی عەشیرەتی جاف، کە لە ناوچەکانی عێراق نیشتەجێن، کەریم بەگ لە هەموویان دەسترۆیشتوو و باڵادەست ترە.

هەروەک دەمویست گەشتێکیش بۆ چیاکانی هەورامان بکەم، بڕیارمدا سەردانی گوندی بیارە بکەم، کە خانەقای گەورەی شێخ عەلائەددینی لێ بوو، شێخ عەلائەددین پێشەوای ئایینی هەردوو تەریقەتی قادریی و نەقشەبەندییە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئەو سەرکردە ئایینیانە کاریگەرییان لەسەر خەڵک ماوە، ئەگەرچی گومانی تێدا نییە وا پەیتا پەیتا بەرەو کاڵبوونەوە دەچێت، هەروەها پێوەندی خێڵەکی زۆر لە پێوەندیی و ملکەچبوونی ئایینیی بە هێزترە.

لەسەر ویست و خواستی قائیمقام دەورییەک لە دوو پۆلیسی سوارە پێکهاتبوو، یاوەرییان دەکردم. چەند هێستریان ئامادەکرد و پێیان سپاردم، بەڵام کە یەکێک لە پۆلیسەکان زانی بێزار و پەشۆکاوم، ئەسپەکەی خۆی ڕادەست کردم تا بە سوارییەکی چاک بچم بۆ دێیەکە. هەر لە هەڵەبجە ڕۆیشتین، ئەسپسوارێکی تر کارەکەی گرتە ئەستۆ، ئەسپسوارەکە کوردێک بوو، ئەسپێکی سپی پێ بوو، زینی کردبوو، لغاوەکەی بە پەڕە و ڕیش ڕازاندبۆوە. سوارەکە جلی کوردی لەبەرکردبوو،

جامانەیەکی ڕەش و سوور و سەوزی لەسەر سەر ئالاندبوو. لەنێو پیاوانی خێڵ، خەسڵەت و تایبەتمەندییەکان ئەو سوارە زۆر باو بوون، لەم ڕووەوە زیاتر لە فارسەکان دەچوون نەک کورد. جگە لەوەش، هەوراmییەکان دیالێکتی تایبەت بە خۆیان هەبوو.

بەهێواشی لەو ناوچە پڕ گرد و لێژاییانە هەنگاومان بەرەو چیاکان دەنا. لە شیوەلۆکەیەک گەیشتینە ناوچەیەکی پڕاوپڕ لە داروبار و باغ و بێستان. جوتیارەکان لە تەک تانکەری ئاوەکان ڕاوەستا بوون. هەندێکی تریان لە دەوری بەرخێکی تازە سەربڕاو گرد ببوونەوە و پێستەکەیان کەوڵ دەکرد. پێش ئەوەی بگەینە دۆڵێکی تر، کە چەندین دارتووی گەورەی لێ بوو، بە ناوچەیەک تێپەڕین، بە هەمان شێوە، وەکوو ناوچەکانی تر ڕەنگ خۆڵەمێشی و بۆر و وشک بوو. لە نشێوەکە چایخانەیەکی بچووک دروست کرابوو، ژوورێکی بچووکی ڕەشهەڵگەڕاو بوو، لە ژوورەکە ڕیزێک لە قوڕی کوتراو و پانکراوە وەک کورسی دروست کرابوو. لە قولایی دۆڵەکە بەناو تاریکایی درەختگەلێکی تێکئالاو و هەڵواسراو ڕۆیشتین. لەولا بەنێو زنجیرە سەر شاخێک تێپەڕین، لە دوورەوە لەنێو کۆمەڵە دار بەڕووەکانی زەردەپەڕی ئاوابوونی خۆر، چیاکانی بەردەممان وەک تۆپەڵێکی چڕ و بەرز و بڵند خۆیان دەنواند.

لە کۆتایی گەیشتینە یەکەم لوتکەی شاخەکانی هەورامان. لە دواوە لە دەشتاییەکان چەند گوندێکی بچووک لەنێو سەوزایی دارودەوەنەکان دەبینران. زۆری پێنەچوو، گەیشتینە شیو و دەرەیەکی چڕ و پڕ لە دار و درەخت، لێوانلێو لە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو و خەزانی گەڵا وەریوەکانی دارگوێز و فەریکە گوێز. لە خوارەوە خوڕەی ڕووبار دەبیسترا، لە سەرووشمان لووتکەی شاخە سەرکەشەکانی هەورامان قیت وەستابوون.

زۆری نەخایەند، گوندی (بیارە)مان لێ بەدەرکەوت. خانووی بەردین و ڕەنگ خۆڵەمێشی، بە بانی تەخت و پان و پەنجەرەی دارین لە تەک یەک و لەسەر یەک ڕیزکرابوون، کۆڵانەکان خوار و خێچ و پێچا و پێچ بوون. لێرە پۆلیسەکان منیان بەجێهێشت، تاکو بچمە بنکەکەیان، لە کەناری چیاکە، کە بەسەر گوندەکەی دەڕوانی. سەرەتا بانگی مێرمنداڵێکیان کرد، تاکو بۆ لای شێخ یاوەریم بکات. کوڕەکە ملی ڕێی گرتەبەر، منیش لە دوای ڕۆیشتم، بەنێو کۆڵانە پێچ وپلوچ و تەنگەبەر و ڕەق و تەق و بەردەڵانییەکان چووینە خوارەوە، هەتا گەیشتینە نزیکترین خانوو لەوبەری ڕووبارەکە. لە بەر دەرگای ماڵی شێخ چەند کەسێک وەستابوون تا پێشوازیم بکەن و بەخێرهاتنم بکەن. لە حوجرەکە منیان بردە ژوورەوە، ساتمەیەکم لە بەردەم ڕێزی سۆڵ و پێڵاوەکان کرد. دیواری ژوورەکە بە ئاستەم سواغ درابوون، ژوورەکە بە مافوور و ڕایەخی سووری دڕاو و پینە و پەڕۆ سازکرابوو. چەند کەسێک لە پاڵ دیوارەکە وەستابوون. لەسەر دۆشەکێکی گۆشەی ژوورەکە شێخ هەستایە سەرپێ و بەخێرهاتنی کردم. شێخ مرۆڤێکی قەد و باڵا کورت و قەمبوور بوو، ڕیشە سپی و درێژەکەی بە هەردوولا شۆڕ ببووەوە. جامانەیەکی سپی لەسەر کردبوو، کراسێکی خۆڵەمێشی پۆشی بوو. بە زمانی عەرەبی بەخێرهاتنی کردم، بەپەلە دۆشەکێکیان لە تەنیشت ڕاخست، ئەویش داوای لێ کردم، لەوێ دابنیشم. دانیشتین و قسەمان کرد، هەتا ئەو کاتەی چوو نوێژەکانی بکات. وا پێدەچوو سەرەتا متمانەی بە هۆکاری گەشتەکەم نەبێ، بەڵام دواتر لە میانەی گفتوگۆکانمان دڵنیابووەوە، کە من سەرسامم بە سیاسەتەکانی ژیانی و دابونەریتی کۆمەڵگاکەی.

شەو چەند جارێک بە دەنگی هەرا و زەنا و هایوهووی خانووەکەی ئەوبەری ڕووبارەکە بەخەبەر هاتم. کە ڕۆژی کردەوە، درەنگ لە خەو هەڵسام. سەردانی خانووەکەم کرد، حەزم دەکرد

بزانم چی بووە، دیتم ئەوە خانەقایە، خانوویەکی گەورەی لە بەرد دروستکراو بوو، حەوشێکی گەورە لە ناوەڕاستی خانووەکە هەبوو. هەرکە چوومە ژوورەوە، چەند پیاوێک تەرمی کەسێکی مردوویان لەناو دارەبازێک هەڵگرتبوو، گومانی تێدانییە نەریتە ئاینییەکان منیان بە ئاگاهێنابۆوە. تۆزێک سەرووتر لە گردەکە، دەنگی مۆلیدەی کارەبای لەگەڵ خوڕەخوڕی ڕووبارەکە تێکەڵ دەبوو. ئەم مۆلیدە لەلایەن شێخ عەلائەددین بۆ دابینکردنی کارەبا بۆ گوندی بیارە دابینکراوە.

لەبەرئەوەی نیازم وابوو، هەمان ڕۆژ بۆ هەڵەبجە بگەڕێمەوە، سەرێکم لە بنکەی پۆلیسەکەدا، کە لە قەراغ چیاکە بوو. لە کوچە و کۆڵانی قوڕاویی و بەردەڵان بەسەرکەوتم و چوومە بنکە پۆلیسیەکە. ئاڵای عێراق لەسەر بنکەکە دەشەکایەوە. لە قەراغی چیاکە، لە خوارەوە دێیەکە دیمەنێکی جوانی هەبوو، بەهۆی دارەکانەوە نیوەی سەکۆی سەربانەکانی دەبینران. لە دۆڵەکە باغی دارگوێزەکان، وێنە کەمەرێکی سەوز و مەیلەو زەرد و سووری لە دەوری کەناری چیاکە دەکێشا.

عەریفی بەرپرسی بنکەکە زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، لەگەڵیشمدا گەڕایەوە بۆ گوندەکە. دووبارە لە هەمان ڕێگا لێژ و پڕ لە پێچ و پەناکان شۆڕبووینەوە. بەتەنیشت دیوارەکانی خانەقا تێپەڕین، لە نزیک چایخانەیەک ڕاوەستاین، دارگوێزێکی گەورەی لێ بوو، وەکوو قۆناغێک وابوو، بۆ ڕێبواران و گوندنشینان تا لەژێر سێبەرەکەی بحەسێنەوە و پاڵبدەنەوە. لێرە دەرفەتم لەبەردەستدا بوو، تا زیاتر بە قووڵی جلی نەتەوەیی کوردی هەڵبسەنگێنم. ئەو جلە کوردییەی لێرە خەڵک دەیپۆشێ هاوشێوەی جلی کوردی ناوچەکانی تری کوردستان بوو، ئەگەرچی کەمێک جیاوازی هەبوو. جلەکانیان لە کراسی لۆکەیی و سپی قۆڵدرێژ و شەڕواڵەکانیان فشو فۆڵ و چاکەتەکانیان توندوتۆڵ بوون، تا گەردەن بە دوگمە دادەخران، لەسەر هەمان چاکەت، چاکەتێکی تر بە کراوەیی لەبەر دەکرێت، بە پشتێن دەبەسترێت. هەروەها لە قوماشێکی ڕەنگ قاوەیی ئاچووغ، کورتەک شەرواڵی کر (ڕانک و چۆغە)ی خۆماڵی لێ دروست دەکرێت، باشترین جۆریان ئەوەیە، کە بەتەواوی لە مووی بزنی مەرەز دروست کرابێت. بەگشتی خەڵکی ناوچەکە پەستەکی (لبادە) لەبەردەکەن؛ جۆرە کاڵایەکە وەک سوخمەی بێ قۆڵ لە مەرەز یا کورک دروست دەکرێت و لەسەر هەموو کاڵایەکەوە لەبەر دەکرێت. جگەلەوەش، لە ڕۆژە ساردەکان، عەبا و شاڵێکی گەورەیان (ئەویش بەهەمان شێوە لە لباد دروست دەکرا) دەخستە سەر شانەکانیان. سەرپێچی پیاوەکانیش، کڵاوێکە، جامانەیەکی گەورەی لێ دەورە دراوە.

بەیاوەری چەند گوندنشینێک چوومەوە ماڵی شێخ، بەچاوی خۆم مەراسیمێکی بچووکم دیت. هەرکە دەچووینە ژوورەوە لای شێخ، عەریف پێشی هەموویان کەوتبوو، پاشان یەکە بە یەکە دەچوونە پێش، لە سەر ئەژنۆ، دەست و قاچی شێخیان ماچ دەکرد، دواتر لە تەنیشت شێخ ڕادەوەستان و دەستەکانیان دەنووشتاندەوە و سەریان شۆڕ دەکرد لە بەردەم ئەو. لە ژوورەوە مەجلیسێکی گەورەیان بەستبوو، بەدەنگی نزم قسەیان دەکرد. شێخ ڕووی کردە من، بۆی ڕوون کردمەوە، کە دوژمنی ئەو (مەحمود خانی دزڵی)یە، سەرۆکی هەورامییەکانی وڵاتی فارس. هەر لە درێژەی باسەکەدا، گوتی مەحمود خان دەستی بەسەر موڵک و ماڵی ئەودا گرتووە و جوتیارەکانیشی لە خاکەکانیان دوورخستووەتەوە.

لە کۆتایی، بە سواری یەکێک لە ئەسپەکانی شێخ، بیارەم بەجێهێشت. یەکێک لە پیاوەکانی عەریف یاوەری دەکردم، کە ڕووخسارێکی تووڕە و مۆن و ڕەقی هەبوو، تفەنگێکی (بێرسیەر)ی بەسەر شان هەڵواسی بوو. خەمبارم، کە ئەو خەڵکە دڵسۆز و خۆشەویستە بەجێدەهێڵم و گەشت دەکەم و بەرەو ماڵەوە بە سواری ئەسپ هەنگاو دەنێم.



چیاکانی هەورامان



ئەسپسوارێک لە دەشتی شارەزوور



بازاڕی هەڵەبجە



هەورامییەکانی بیارە



شێخ عەلائەددین



بیارە

**سەرچاوە:**

The Geographical Journal, (Mar. – Apr., 1946), pp. 128–134

١. ناوەکانی دەق و نەخشەکە لە فەرمانگەی شەڕ وەرگیراون. ناوەکانی نێو کەوانەش، نوسەرەکە لە زاری خەڵکی ناوچەکە وەریگێڕاون.

٢. ی.ب. سوان، «بەرەو میزۆپۆتامیا و کوردستان لە شاراوەییەدا.» لەندەن، ١٩١٢.


















# ڕەخنەی زانستی یان شکاندنی شکۆ و کەسێتی ئەکادیمی؟!

## وەڵامێك بۆ ئارام عەلی سەعید



**پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد**
لەدایکبووی ١٩٧٩، چەمچەماڵ، خاوەنی (١٣)کتێب و (١٠) توێژینەوەی زانستی بڵاوکراوەیە، مامۆستایە لە بەشی میدیای زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی.

**دەستپێك:**

لە ژمارەی ڕابردووی گۆڤارەکەتاندا (خاڵ)، ژمارە (٢٨)ی مانگی ئاياری ٢٠٢٠. لە لاپەڕە (١٦٤-١٧٦)دا لەلایەن نووسەر (ئارام عەلی سەعید)ەوە بابەتێکی لەسەر بەندە و کتێبێکم، کە بەم دواییانە چاپکراوە بەناوونیشانی کتێبی (دەربارەی میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان..نووسینی زانستی یان سەرابی ئەکادیمی؟!) نووسیوە.

نووسەری بابەتەکە لە پاڵ ڕەخنەگرتن لە بەرهەمەکەم، بەداخەوە هەڵسەنگاندنێکی بێویژدانانە و بێ بنەمای بۆ هەندێ لە زانیارییەکانی نێو کتێبەکەم کردووە. بەداخەوە زیادەڕۆیی زۆری لە نووسینی بابەتەکەیدا کردووە؟! بەمەش نەوەستاوە و دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە، بەڵکو پەڵ و پەلی زۆری هاویشتووە بۆ باسکردنی هەندێ بابەتی شەخسی و لابەلا و تۆمەت و گومان دروستکردن لای خوێنەران لەسەر کتێب و بەرهەم و تەنانەت توێژینەوە و بڕوانامەکانی زانکۆییم و ئاستی ئەکادیمی و پیشەکەم؟!

هەروەها لە پاڵ ڕەخنەگرتندا هەوڵی ناوزڕاندنی کەسێتی مەعنەویی و ئەکادیمی بەندە و بێنرخکردنی نووسین و بەرهەم و کتێبەکانمی داوە لای خوێنەران، بۆیە وەک مافی یاسایی خۆم و مافی وەڵامدانەوە (حق الرد) بە پێویستم زانی لێرەوە وەڵامی ورد و دروستی بابەتەکەی بدەمەوە.

هەرچەندە دەشتوانم وەک (رد الإعتبار) لە دادگا سکاڵای یاسایی لەسەر تۆمار بکەم، چونکە بەدوای سەرە دەرزیدا گەڕاوە و مافی برایەتیی و هاوڕێیەتی لە خۆڕایی پێشێل کردووە؟! بەڵام لەسەر داوای سەرۆکی دەزگاکە و سەرنووسەری گۆڤارەکە دانم بەخۆمدا گرتووە و تووڕەیی خۆمم خواردۆتەوە!

سەرەتا پێم خۆش بوو وەکو نیازپاکی(حسن النية)ی ئەو برادەرە تەلەفۆنی بۆ بکردایەم یان سەرنج و ڕەخنە و تێبینییەکانی بە نووسین بۆم بناردایە، تاوەکو لە چاپی نوێدا بە سوپاسەوە سوودم لێوەربگرتایە، بەڵام ئاساییە لێرەش بڵاویکردووەتەوە، کە دەکرا بە زمانێکی نەرم و شێوازێکی جوان! ڕەخنەی دڵسۆزانە و بابەتییانەی لە تەنها ئەم بەرهەمە بگرتایە، هەروەک لە مانشێتی بابەتەکەی ناو و وێنەی کتێبەکەی داناوە. نەک ئەوەی کە ئەو نووسیویەتی نزیکەی ٤-٥ لاپەڕەی بابەتەکەی باسی بەندە و فەلسەفە لێدانی خۆی لەبارەی زانکۆ و زانست و مەعریفەی کردووە؟!

نووسەر لە خۆیەوە ئەم کتێبەی بە توێژینەوە داناوە! لەکاتێکدا کتێبێکی ئاسایی و سادەیە لە سادەترین کتێبەکانمە بۆ خوێنەرانی کورد بەگشتیی و خوێنەرانی ئیسلامی بەتایبەتی، بەئامانجی ئاشناکردنیان بە میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان.

لە چەندین شوێنی تری ناو بابەتەکەی بە زمانی گاڵتەجاڕی و توانج و پلار لەسەر بەندە دواوە! بەکورتی نەیتوانیوە بێلایەنی و بابەتیبوون و هاوسەنگی لە بابەتەکەیدا بپارێزێت، باسی کەسێتی بەندە و ڕا و بۆچوونی شەخسی خۆی تێکەڵ بە ڕەخنەگرتن لە کتێب و بەرهەمەکە کردووە؟! تەنانەت لە باسکردنی بابەتەکە و، ڕەخنەگرتن لە کتێبەکەشدا کەوتووەتە هەڵە، هەوڵی چەواشەکردنی خوێنەرانی داوە بە تێکەڵاوکردنی ناوی هەندێ گۆڤار و بڵاوکراوە و زانیارییەکان!

هەموو ئەو هەڵە و کەموکورتیانەی کە ئەو باسی کردوون قەبە و گەورەی کردوون، نزیکەی (١٪) کتێبەکەیە، خۆ (٩٩٪) زانیارییەکانم ڕاستن پاڵپشت بە کتێب و سەرچاوە و بەڵگەنامە، بەڵام ئەو بەرێزە باسیان ناکات، کە ئەمە بێویژدانییەکی گەورەیە و شتی دیکەی لێ دەخوێندرێتەوە؟!

**لێرەوە دەچمە سەر ناوەڕۆکی وەڵامدانەوەی ئەو بابەتە:**

**یەکەم/** نووسەر هەر لە ناونیشانی بابەتەکەیەوە بە زمانێکی زبر و بە هێرش کردن دەستپێکردووە بە ناونیشانی (نووسینی زانستی یان سەرابی

ئەکادیمی؟!)(١) دواتر لە پێشەکی بابەتەکەیدا دەڵێت: (ئەم کتێبە پێشەکی نییە)(٢). لەڕاستیدا هەر سێ بەشی کتێبەکەم دەروازە و پێشەکی تایبەتیم بۆ نووسیون، بەندە داوام لەبرای گەورە و خۆشەویستم جەنابی کاک (تۆفیق کەریم) سەرۆکی دەزگای خاڵ و سەرنووسەری گۆڤارەکە کرد، کە ئەم کتێبەم بخوێنێتەوە و، دواتر پێشەکییەکی بۆ بنووسێت، کە بۆی نووسیوە بە سوپاس و دەستخۆشییەوە.

**دووەم**/ نووسەر لە خۆیەوە لە نووسینەکەیدا دەڵێت: (ئەم کتێبە سێ باس(بەحس)ە(٣) لەوێوە هاتۆتە سەر و وێزەی بەندە و زانکۆ و زانست و مەعریفە و کتێب و بەرهەم و توێژینەوەکانم و، ڕەوایەتیدان بەخۆی بۆ گومان دروستکردن لەسەر کەسێتی زانستی و ئەکادیمی بەندە و بە کەم و سووک تەماشاکردنم لای خوێنەرانی بابەتەکە؟! لە چەندین شوێنی نووسینەکەیدا ئەم دەستەواژەیەی نووسیوە: بەخوا ئەمە وێرانە، کارەساتە(٤)؟! لەکاتێکدا ئەمە کتێبێکی ئاساییە و توێژینەوە نییە و لەسەر هەر بەشێکی و لە لیستی پێرستی کتێبەکەش بە درشتی و گەورەیی نووسیومە بەشی یەکەم، دووەم و سێیەم!

**ئەم سێ بەش و بابەتە جیاوازەی نێو کتێبەکە لە سێ قۆناغ و کاتی جیاوازدا پێشتر لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتەکان بڵاومکردووەتەوە.**

**سێیەم**/ بێ منەتم لە کاکی نووسەر لە ئەمڕۆوە بکەوێتە سەر و سۆراغی وردی کتێب و بەرهەم و توێژینەوەکانم، کە ژمارەیان (١٣) کتێبە. جگە لە چەندین توێژینەوەی ئاسایی و توێژینەوەی پێشکەوتووی زانستی (بحوث الترقية العلمية) بۆ پلەبەرزکردنەوەی زانستی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی. بابێت خۆم سەرجەم کتێب و توێژینەوەکانم لە ماڵ دەخەمە بەردەستی، ئەگەر ئەو تۆمەتەی بۆ نەسەلمێنرا ئەوا بە شاهیدی ئێوەی خوێنەر لە دادگا سکاڵای لەسەر تۆمار دەکەم و داوای هەموو قەرەبوویەکی ماددیی و مەعنەوی لێ دەکەم.

هەروەها پێویست ناکات ئەو نووسەرە خۆی بکاتە دەمڕاستی زانکۆ و مەعریفەت و زانست، بەندە بە هەوڵ و شەونخوونی و ماندوویی خۆم گەیشتوومەتە ئەو بڕوانامە و پلە زانستییەم وەرگرتووە، بە چەندین فلتەری زانستی و لیژنەی گفتوگۆی زانستی و لیژنەی هەڵێنجاندن و لیژنەی پلەبەرزکردنەوەی زانستی و...هتد دا ڕۆیشتووم.

ئینجا لە هەموو زانکۆیەک مامۆستای باش و کەم ئەزموون هەیە، ئەم گشتاندنەت کارێکی هەڵە و کوشندەیە! بەندە چەندین کتێبی زانستییم مەنهەجی یاریدەدەرە لە زانکۆ. خۆم و هەندێ لە هاوڕێکانم موحازەرەیان لەسەر دەڵێینەوە. کتێبەکانم هەندێکیان (٣-٤) جار چاپکراون و نوسخەیان لە بازاڕدا نەماوە. تەنیا ساڵی پار و پێرار لە پێشانگای نێودەوڵەتی کتێب لە شاری هەولێری پایتەخت ٨ کتێبی بەندەی لێ نمایش کرابوو! کورد وتەنی: (ماڵت لە شووشەیە، بەرد مەگرە ماڵی خەڵکی)!

دیارە... ڕەخنەی بونیادنەر و بابەتی، میتۆد و یاسا و ڕێسا و شێواز و ڕێکاری تایبەت بەخۆی هەیە. دوای دەستخۆشی بۆ نووسەری بابەتەکە. هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونی و ئاماژەدان بە خاڵە باش و بەهێزەکانی، پاشان پەنجە دەخرێتە سەر خاڵە لاواز و هەڵە و کەموکوڕییەکانی بە ئامانجی چاکردن و سوودلێوەرگرتنیان لە ئاییندەدا و لە چاپی نوێدا. لەگەڵ تێکەڵ نەکردنی بابەتیبوون و حەزی تاکەکەسی ڕەخنەگر و ڕەخنەنەگرتن لە کەسێتی نووسەرەکە، بەڵکو دەبێت ئاراستەی ڕەخنەکەت لە بەرهەم و کتێبەکە بێت نەک نووسەرەکەی؟!

هەروەها خۆدارنینی تاکەکەسی ڕەخنەگر (تجريد الذاتي للناقد) لەلایەنی سیاسیی و ململانێی

شەخسی و ئایدیۆلۆژی لەگەڵ نووسەرەکەدا یاخود هەوڵدان بۆ ڕژاندنی ڕقی تاکەکەسی و گەڕان بەدوای هەل و دەرفەت و کەلێن بۆ هێرشکردنە سەر نووسەرەکە یاخود تەسفییە حسابی ڕابردوو و خۆدوورگرتن لە گیانی شەڕەنگێزیی و تۆڵەکردنەوە یان شەڕی کەسانی ترت پێبکەن؟!

**چوارەم**/ ڕەخنەی ئەوەت گرتووە لە بەشی یەکەمدا بۆچی ژمارەی سوورەت و ئایەتەکانم نەنووسیوە؟ هەروەها تەفسیری ئایەتە پیرۆزەکانم نەکردووە(٥)؟

دیارە بابەتی ئەم بەشە ناونیشانەکەی (ڕاگەیاندن لە قورئانی پیرۆزدا)یە، لەو باسەدا پاڵپشت بە ئایەتە قورئانییەکان باسی پرۆسەی پەیوەندییکردن و ڕاگەیاندن و نموونەی چیرۆکە هەواڵە قورئانییەکانم کردووە. نزیکەی (٦٠) ئایەتی قورئانم وەک بەڵگە و تەنیا ئاماژەی قورئانی (استدلال و اشارە) هێناوەتەوە. خۆی باسەکە باسی قورئانە، بۆیە بە پێویستم نەزانی ٦٠ ئایەت لەسەریەک پەراوێزی بۆ دابنێم لەکاتێکدا خوێنەری ئیسلامی شارەزای قورئانە و دەزانێت ئەوانە ئایەتی پیرۆزی قورئانن. گرنگ ئەوەیە ئایەتەکان و بەڵگەکان هەڵەیان تێدا نییە.

**پێنجەم**/ نەیتوانیوە ڕەخنەی زانستی لە هەردوو بەشی یەکەم و، بەتایبەت هیچ ڕەخنەیەک لە بەشی دووەم بگریت، چونکە دڵ و ناوەڕۆکی گرنگ و سەرەکی کتێبەکەیە، کە تێیدا باسی جەدەلی بانگەواز و سیاسەتم لە میدیای ئیسلامیدا بە دیدێکی ڕەخنەیی کردووە. بەوردی و ئەمانەتی زانستییەوە بڕگە و وتەکانم وەک خۆی لە سەرچاوەکان گواستووەتەوە. ڕەچاوی میتۆدی زانستی و تەکنیکی نووسین و یەکێتی بابەتم کردووە. باسی قۆناغەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی میدیای ئیسلامیم لە هەرێمی کوردستان کردووە، پۆلێنی جۆرەکانیشیانم کردووە. لەکۆتاییشدا لیستی سەرچاوە و پەراوێزەکانم دیاریکردووە، کە (٣٦) سەرچاوە و پەراوێزن.

**شەشەم**/ زۆرترین ڕەخنەت لە بەشی سێیەمی کتێبەکەیە، کە بەندە زۆر ساکار و سادە و کورت نووسیومە، تەنها ئامانجم ناساندنی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە ئیسلامییانەیە بە وێنەوە بەخوێنەران، بۆیەش درێژدادڕیم نەکردووە تێیدا و لە شێوەی بیبلۆگرافیایەکی کورتدا نووسیومە، تاوەکو خوێنەران بێزار نەبن، چونکە ژمارەیان زۆرە، کورتە مێژووی (٩١) ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی ئیسلامییە. بۆیە لەو ژمارە زۆرە ئاساییە هەڵە و کەموکوڕی هەندێک لەناو و ساڵ و ژمارەدا هەبێت.

بەڕێزت سەرنجی خوێنەر و تەوەری بابەتەکەت زۆرتر ڕاکێشاوە بۆ ئەم بەشە، زۆرترین پانتایی بابەتەکەتی داگیرکردووە. بابەتیبوون و هاوسەنگی و بێلایەنیت نەپاراستووە لە بابەتەکەدا، لە هەندێ شوێندا زانیاری هەڵەت داوە بە خوێنەران، بەڵکو ڕا و حەزی شەخسی خۆت تێکەڵ بە بابەتەکە کردووە؟! کە دواتر بە وردی دەچمە سەریان. بەتایبەتی لە باسی هەردوو گۆڤاری (پەیام) و (مەشخەڵ)دا.

هەروەها بێ بەڵگە ئەوەت ئاماژەپێداوە، کە بەندە سەرلەبەری زانیارییەکانم لەسەر (ڕاپەڕین، النفیر، الصف، دەنگی باوەڕ، بانگەواز، هەڵەبجە، شوهەدا، بانگی غەریب، بانگی هەق، بانگی ڕاستی، جودی و گزنگ) لە کتێبەکەی کاک (هەژار حاتەم) وە وەرگرتووە(٦).

دواتر ڕوونیان دەکەمەوە، کە ئەمە ڕاست نییە و تۆمەتێکی بێ بنەمایە، بەڵام باشە ئەگەر زانیارییم لەسەر ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە لەو کتێبەوە وەرگرتبێت؟! ئەی ئەو ٧٥ ڕۆژنامە و گۆڤارەی ترم لە کوێ و لە کێ وەرگرتووە؟ خۆ کتێبەکەی ئەو بەڕێزە باسی ساڵانی نێوان (١٩٨٢-٢٠٠٦)دا دەکات. ئەوەی بەندە باسی ساڵانی نێوان (١٩٨٤-٢٠٠٦) دەکات!




بەندە بە ئاشکرا لە دوو شوێندا لە لیستی سەرچاوەکاندا لە کۆتایی کتێبەکە و لەناوی سەرچاوەکانی بەشی سێیەمدا نووسیومە، کە سوودم لەم کتێبەی ناوبراو وەرگرتووە.

لەکاتێکدا من لە تەلەفزیۆنی کۆمەڵی ئیسلامی/ کەناڵی سلێمانی بووم لە ساڵی (٢٠٠٢-٢٠٠٤/١٠/١٠)، کە دوای ئەو مێژووە لەسەر داوای خۆم نەقڵ بووم بۆ تەلەفزیۆنی کۆمەڵ/



کەناڵی چەمچەماڵ بە بڕیاری دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامی ژمارە (٥٨٨) لە ڕۆژی(٢٠٠٤/١٠/١٠) کەلێرەدا وێنەی ئەو نووسراوە بڵاودەکەمەوە(٧).

وێڕای کاری هەواڵسازی لەگەڵ برای بەڕێزم کاک (سەلاح عەبدولقادر) ڕۆژانە تیلیتێکستی تەلەفزیۆن و برگەی کورتەی هەواڵ، مێژووی ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامی و پاشان مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیم ئامادە دەکرد. ئێستا دەفتەرەکەم ماوە و، لێرەدا وێنەی بڵاودەکەمەوە.



دیارە بەندە و کاک هەژار حاتەم دەرچووی یەک بەش و پسپۆڕین لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی، ماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵە پێشتریش لە ڕێکخراوی (یەکبوونی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان) یەکترمان ناسیووە. من دەرچووی یەکەم وەجبەم ساڵی ٢٠٠٤ و دەورییەک پێش ئەو بووم. بەڕێزیان ساڵێک دوای من بوو. کاتێک ساڵی ٢٠٠٥ خەریکی هەنگاوەکانی ئەنجامدانی توێژینەوەکەی بوو. پەیوەندی پێوە کردم بەمەبەستی هاوکاریی و پێدانی هەندێک زانیاریی و وتووێژی زانستی، کە بەندە هەندێ سەرچاوە و زانیارییم پێدا. نامەم نووسی بۆ برای بەڕێزم کاک شەریف وەرزێر،

کە لێرەدا دەقی وەڵامی نامەکەی بەڕێزیان وەکو خۆی بلاودەکەمەوە بۆ بەندە تاوەکو بەپێدانی هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤار هاوکارمان بێت، کە لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١٠/١١ دا وەڵامی نامەکەی داومەتەوە و، ٧ ژمارەی (ڕۆژنامەی النفیر، گۆڤاری بانگەواز، الصف و کوردستان)یشی بۆ ناردووم(٨).

**لێرەوە دێمە سەر وەڵامی سەرنجەکانت لەسەر بەشی سێیەم:**




• (النفیر):

زۆربەی ژمارە ئەسڵییەکانی گۆڤاری (النفیر) لە ئەرشیفی بەندەدا هەن و پارێزراون و تەواوی زانیارییەکانی نێو کتێبەکەم لەسەری خۆم نووسیومن، کە بەوردتر لێرەدا دەیاننووسمەوە:

ژمارە (٣) ی (النفیر) کە بەشێوەی ڕۆژنامە لە مانگی جەمادی دووەم ١٤٠٩ی کۆچی و، شوباتی ١٩٨٩ دا بە زمانی عەرەبی لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە لە کوردستانی عێراق لە شاری (پیشاوەر)ی پاکستان دەرچووە، کۆپییەکم بەدیاری لەلایە. ٨ لاپەڕەیە بە قەبارەی A٣ و پێوانەی (٣٠×٤٠) سم(٩).

لەلاپەڕە یەکدا وێنە و هەواڵی هەوڵی تیرۆرکردنی شێخ عوسمان عەبدولعەزیزی ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی تێدایە لەلایەن سیخوڕێکی سەر بە موخابەراتی عێراقییەوە(١٠).

هەروەها ژمارەکانی نوسخەی ئەسڵی (٤ و ٥ و ٧و ٨ و ٩)م هەیە لە ئەرشیفی خۆمدا پارێزراون(١١).

بەبۆنەی یەکەمین ساڵیادی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەوە، لە ژمارە (٤)ی مانگی ذو الحجەی ١٤٠٩ی کۆچی بەرامبەر بە تەمموزی ١٩٨٩ی زایینی دۆسیەیەکی تایبەتی بەو کارەساتە گەورەیە بەجیا وەکو پاشکۆی گۆڤارەکە. بەهەمان قەبارە و ژمارە و مێژوو بە زمانی عەرەبی بەناوونیشانی : (فاجعة حلبجة كبرى جرائم العصر- من كيد والتدبير الى الإبادهة والتدمير) لە دوو توێی (٧٢) لاپەڕەدا لە ئامادەکردنی نەجمەدین فەرەج (فاتح کرێکار) بڵاوکردووەتەوە، نوسخەی ئەسڵی ئەم دۆسیەیەش دیسان لە ئەرشیفی تایبەتی بەندەدا پارێزراوە(١٢).




•

**• گۆڤاری ڕاپەڕین:**




پاشکۆی گۆڤاری النفیر بووە، دوو ژمارەی لێ دەرچووە. (نوسخەی ئەسڵی هەردوو ژمارەکەم لە ئەرشیفی تایبەتی خۆمدا پاراستووە). تەواوی زانیارییەکانی نێو کتێبەکەشم لەسەری هی خۆمن و، لە کەسم وەرنەگرتووە، کە بەم جۆرەن. بەوردی دووبارە لێرەدا دەیان نووسمەوە:

گۆڤارێکی مانگانەی سیاسی بووە، هەروەکو لەسەر بەرگی ناوەوەی هەردوو ژمارەکەی نووسراوە: (پاشکۆی گۆڤاری نەفیر بە زمانی کوردی دەردەچێت لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق). دواتر بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە پیشاوەر- پاکستان. ژمارە (١)ی لە مانگی موحەڕەمی ١٤١١ی کۆچی - ئابی ١٩٩٠ دا و، ژمارە (٢)ی لە مانگی شەعبانی ١٤١١ی کۆچی و ئازاری ساڵی ١٩٩١دا دەرچووە. ژمارە (١)ی بە بەرگەوە ٣٦ لاپەڕەیە و ژمارە (٢)ی بە بەرگەوە ٤٤ لاپەڕەیە. بە قەبارەی (١٧×٢٣)سم دەرچووە(١٣).

- لە ساڵی ٢٠٠٠یش مەڵبەندی ڕانیەی یەکگرتووی ئیسلامی بەهەمان ناو بڵاوکراوەیەکی سیاسیی و ڕۆشنبیری دەرکردووە(١٤).

**• گۆڤاری (الصف):**




تەنها ٢ ژمارەی لێ دەرچووە، (نوسخەی ئەسڵی هەردوو ژمارەکەم لە ئەرشیفی تایبەتی خۆمدا پاراستووە). تەواوی زانیارییەکانی کتێبەکەشم هی خۆمن و لە کەسم وەرنەگرتووە، کە بەم جۆرەن. بەوردی دووبارە لێرەدا دەیان نووسمەوە:

بڵاوکراوەیەکی ئیسلامی خولی بووە، بە زمانی عەرەبی لەلایەن هێزی شەهید (حەسەن بەننا)ی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە لە شاری (پیشاوەر) لە پاکستان دەرچووە.

سەرجەم ٢ ژمارەی لێ دەرچووە. ژمارە (١)ی لە مانگی ذوالقعدەی ١٤١٠ی کۆچی-ئایاری ١٩٩٠ی زایینی و، ژمارە (٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤١١ی کۆچی بەرامبەر بە تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ دەرچووە. قەبارەیان (١٨×٢٤)سم و ژمارەی لاپەڕەیان ژمارە (١)ی ١٤ لاپەڕە و ژمارە (٢)ی ١٦ لاپەڕەیە(١٥).

*** گۆڤاری هەڵوێست:**

سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری هەڵوێست لە نێوان ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٢)دا دەرچوون. هەروەک برای بەڕێزم کاک (هەژار حاتەم) لە

کتێبەکەیدا نووسیویێتی(١٦)، گۆڤارەکە پێش ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی (برا) دەرچووە، کەئەم پارتە ئیسلامییە نوێیە لە ڕۆژی (١٩٩٢/١١/٢٢)دا ڕاگەیەنراوە(١٧).

تاوەکو ژمارە ٣ مانگانەیەکی ئیسلامی بووە. دواتر لە ژمارە (٤)ەوە بۆتە گۆڤارێکی خولی ئیسلامیی گشتی هەروەک لەسەر بەرگەکەی نووسراوە. ژمارە (٣)ی نوسخەی ئەسڵی، کە لە ئەرشیفی بەندەدا پارێزراوە و، وێنەی بەرگەکەی لێرەدا بڵاودەکەمەوە بەم جۆرە ناسێنراوە: (مانگانەیەکی ئیسلامییە). لە لاتەنیشتی نووسراوە: ژمارە (٣) ساڵی یەکەم ڕەبیعی دووەمی ١٤١٢ک(١٨)/ تشرینی یەکەمی١٩٩١ز. ژمارە (٤)یشی لە مانگی ڕەمەزانی (١٤١٢)ی کۆچیدا دەرچووە، کە مانگی ٩ی کۆچییە. دەکاتە مانگی ئازاری ١٩٩٢ی زایینی.





• بۆ زانیاری خوێنەرانی بەڕێز لە پشتی ژمارە (٣)ی ئەم گۆڤارە لەژێر ناونیشانی (مژدە) ڕیکلام و ئاگاداری بۆ گۆڤاری غەریبان (الغرباء) کردووە! کە تاوەکو ئێستا لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکدا زانیارییم لەسەری نەبینیووە و ژمارەکانی بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام لێرەدا وێنەی بەرگەکەشی بڵاوکردۆتەوە! بەم جۆرە ناساندوویەتی: (گۆڤارێکی ئیسلامی خولییە لەلایەن گەنجانی باوەڕ بەخواوە دەردەچێت). ناونیشانی بابەتەکانی ناوەڕۆکی ژمارە (١)یشی بڵاوکردۆتەوە. درووشمی گۆڤارەکەش لە سەرەوەی ناوەکەی ئەم ئایەتە پیرۆزە نووسراوە: (انهم فتية امنوا بربهم)(١٩).

دیارە ئەم گۆڤارە لە پاڵ گۆڤاری (هەڵوێست) دا، کە بە زمانی کوردی دەرچووە، ئەم بە زمانی عەرەبی لەمانگی ڕەبیعی دووەمی (١٤١٢)ی کۆچی کە دەکاتە مانگی ١٠ی ١٩٩١ی زایینی لەلایەن بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامییەوە (خەتی دووی ئیخوان پێش خۆ ئیعلانکردنی) دەرچووە.

بەندە ماوەیەکە کەوتوومەتە سۆراغی، بۆیە هیوادارم خەمخۆرانی ئەرشیفی ئیسلامی و نووسەرانی مێژووی میدیای ئیسلامی و پارت و ڕەوتە ئیسلامییەکان، ئەگەر زانیارییەکیان لەوبارەیەوە دەستکەوت بە سوپاسەوە ئاگادارمان بکەنەوە.

**• گۆڤاری (شاعیرانی ناوسەنگەر)**



برای بەڕێزم کاک (هەژار حاتەم) لە کتێبەکەیدا لە ڕیزی بڵاوکراوە زنجیرەییە نهێنی و ئاشکراکاندا لە باسی دووەمی توێژینەوەکەیدا دایناوە لە ژمارە(٦)دا(٢٠)، بەڵام لەڕاستییدا هەروەک لە سەرەوەی بەرگەکەی نووسراوە: (بڵاوکراوەیەکی وێژەیی وەرزی یە، نووسینگەی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامی دەریدەکات)(٢١). لە خوارەوەی بەرگەکەشی نووسراوە: (ژمارە (١)، پاییزی ١٩٩١).

• هەروەها بۆ یەکەمجار وێنەی بەرگی بڵاوکراوەیەکی زنجیرەیی بڵاودەکەمەوە، کە دیسان لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکدا ناوی نەهاتووە!

بەناوی زنجیرەی تیشک ژمارە (٦) کە بەپێی زانیاریی و بەدواداچوونی بەندە و سۆراغکردنی لەلایەن (بنکەی سەربازی شەرەفخان)ی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە لە قەزای چەمچەماڵ دەرچووە و، ماوەی زیاتر لە ٢٥ ساڵە لە ئەرشیفی بەندەدا پارێزراوە!

زنجیرە (٦) بەناونیشانی (تیشکێک لەسەر نرکە و ناڵەی بەناو ئەنفالەکان)، نامیلکەیەکە بە قەبارەی ١٦ لاپەڕەی نیو A٤ (٢٢).




نووسەرەکەی ئەمیر عەبدوڵڵا ئەحمەد نازناوی (باز) بووە، هەروەک لەسەر بەرگەکەی و خوارەوەی لاپەڕەی پێشەکییەکەی بەدەستی خۆی نووسیویەتی. ڕۆژی دووشەممە، ڕەبیعی یەکەمی ١٤١٢ی کۆچی بەرامبەر بە ١٩٩١/٩/١٦ی زایینی.

-هەروەها گۆڤارێکی تری ئیسلامی هەبووە، کە ژمارەیەکیم بینیووە بەناوی (الطليعه-پێشەنگ) ڕەوەندی ئیسلامیی کوردی لە شاری (شتوتگارت) لە ئەڵمانیا لە ساڵانی نەوەدەکاندا بە زمانی عەرەبی دەریکردووە.

**•گۆڤاری دەنگی غەریب (نداء الغريب):**




زانیارییەکانم لە کتێبەکەمدا لەسەر گۆڤاری دەنگی غەریب (نداء الغريب) لە خودی سەرنووسەرەکەی برای بەڕێزم (د.عومەر عەبدولعەزیز) وەرگرتووە. هەروەها بەرگەکانی ژمارە (١ و ٤ و ٦)ی گۆڤارەکەش، کەلێرەدا وێنەیەکی بڵاودەکەمەوە. لە مانگی ١٠ی ٢٠٠٤دا سەردانی ماڵەکەیم لە شاری سلێمانی کردووە. دیدار و چاوپێکەوتنی تایبەتم لەگەڵیدا ئەنجامداوە(٢٣). نەک ئەوەی لە خۆتەوە جەنابت بەبێ بەڵگە تۆمەتبارمان دەکەی؟!

بانگی غەریب (نداء الغريب) یەکەم گۆڤاری لقی برایانی مسوڵمان ناسراو بە (ئیخوان موسلیمین)ە لە هەرێمی کوردستان عێراق. لە ئێران بە هەر ٣ زمانی (کوردی، عەرەبی و فارسی) دەرچووە، درووشمەکەی بەشێکی فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ)، کە لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێت: (طوبى للغرباء).

**• گۆڤاری هەڵەبجە:**




سەبارەت بە گۆڤاری هەڵەبجە زانیارییەکانم لە نووسینێکی مامۆستا (موحسین جوامێر) وەرگرتووە، کە لە ساڵی ٢٠١٠دا لە سایتی (کلاورۆژنە)دا لە هەندەران بەناونیشانی: (گۆڤاری هەڵەبجە چۆن لەدایکبوو؟) بڵاوی کردۆتەوە. تێیدا مێژووی دەرکردنی ئەم گۆڤارە دەگێڕێتەوە.

لە یەکەم کۆبوونەوەی تایبەت بە دەرکردنی گۆڤارەکەدا، هەروەک مامۆستای ناوبراو دەیگێڕێتەوە هەریەکە لە بەڕێزان: (موحسین عەبدوڵڵا، موحسین ئاسنگەر، فەلاح سەعید، جەلال خەیات، ئاراس رەئوف، محەمەد کەرکوکی و موحسین جوامێر) بەشداربوون.

گۆڤاری هەڵەبجە هەروەک لەسەری نووسراوە: (گۆڤارێکی ئیسلامی سەربەخۆیە. دوو مانگ جارێک لەلایەن یەکیەتی ئیسلامی کوردی لە ئەسکەندەنافیا دەردەچێت). گۆڤارەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی لە شاری (مۆنداڵ)ی سوید لە نێوان ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩٨)دا دەرچووە(٢٤).

*** هەردوو گۆڤاری بانگی راستی و مەشخەڵ:**

بەڕێزت لە نووسینەکەتدا بەبێ بەڵگە و بێ بنەما دەڵێیت: (تەواوی زانیارییەکانم لە کتێبەکەی کاک (هەژار حاتەم)ەوە وەرگرتووە)؟! بێئاگا لەوەی، کە ئەو برا بەڕێزەم لە (ل١٢١)ی کتێبەیدا نووسیویەتی: (سەبارەت بە گۆڤاری مەشخەڵ نە بەنووسین لە سەرچاوە جیاجیاکاندا، و نە ژمارەکانی گۆڤارەکە و نەزانیاری تر، لەبارەی گۆڤاری ناوبراوەوە دەستم نەکەوت، بۆیە ئەو دوو گۆڤارەش بەیەکەوە باس دەکەم، چونکە زانیاریم لەسەر هیچیان ئەوەندە نییە، تەنیا ئەو چەند دێڕە نەبێت لە کتێبەکەی ئیسماعیل تەنیا- بیبلۆگرافیای رۆژنامەگەریی کوردیدا لەسەر هەردوو گۆڤاری ناوبراوی نووسیوە)(٢٥).




بەندە بەجیا باسی هەردوو گۆڤاری مەشخەڵ و بانگی راستیم لە کتێبەکەمدا کردووە، بەڵام ئەو گۆڤاری مەشخەڵە نا، کە بەڕێزت باست کردووە و تێکەڵاوی باسەکەت کردووە؟!

سەرچاوەی زانیارییەکانم لە کتێبی رابەری رۆژنامەگەریی کوردی (ئازاری ١٩٧٥-١٩٩٣) نووسەر ئیسماعیل تەنیا وەرگرتووە و، وەکو خۆی نووسیومەتەوە، بەڵام ناوی ئەم کتێبەم لە لیستی سەرچاوەکاندا بەداخەوە بیرچووە.

هەروەک ئەم نووسەرە بەڕێزەش سوودی لە نووسینێکی بەندە وەرگرتووە (لەسەر

ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان)، کە لە ژمارە (١٠)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس) لە بەهاری ٢٠٠٧ دا بڵاومکردووەتەوە، ناوی بەندە و بابەتەکەمی لە لیستی سەرچاوەکان و چەندین پەراوێزی جیاوازدا هێناوە.

ئەم نووسەرە بەڕێزە لە دوو شوێنی جیادا لە کتێبەکەی باسی دوو گۆڤاری (مەشخەڵ)ی کردووە، کە یەکێکیان بەناونیشانی: (مەشخەڵ: هەندەران -١٩٨٧ گۆڤارێکی ئیسلامی بوو، یەکێتی ئیسلامی قوتابیان و لاوانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات لە ساڵی ١٩٨٧ دا ٢ ژمارەی دەرچووە. یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٨٧دا دەرچووە. ژمارە (٢)ی لە مانگی گوڵانی ١٩٨٧دا بە ٢٢ لاپەڕە، دەرچووە)(٢٦).

زمانی کوردی دەریکردووە)(٢٧). ڕاستییەکەی ناوی ڕێکخراوەکە (یەکیەتی ئیسلامی قوتابیان و لاوانی کوردستان) بووە. بەڕای بەندە ئەمە قۆناغی دووەمی هەمان گۆڤارە، کە لە پاش ڕاپەڕین دەرچووە. لێرەدا وێنەیەکی جیاواز لەوەی نووسەری ڕەخنەگر بڵاوی کردووەتەوە، دەخەمە ڕوو، کە وێنەی ژمارە (١)ی ئەو گۆڤارەیە لە مانگی کانوونی دووەمی ١٩٩٢ لە هەولێر دەرچووە. دیارە ئەم گۆڤارە ژمارە (٢)ی لە وەرزی بەهاری ١٩٩٢دا دەرچووە.

لەم خولەدا ٣ ژمارەی دەرچووە لە دوای ڕاپەڕین. ژمارە (سفر)ی ئەزموونی لە مانگی جەمادی یەکەمی ١٤١٢ی کۆچی بەرامبەر بە تشرینی دووەمی ١٩٩١ هەر لە هەولێر دەرچووە(٢٨).







بەڕای بەندە ئەمە قۆناغی پێش ڕاپەڕینی ئەم گۆڤارەیە. هەروەها لە شوێنێکی تری هەمان کتێبدا گۆڤارێکی تری ئیسلامی هەر بەناوی (مەشخەڵ) بەم شێوەیە باس دەکات: (٥٧٧-مەشخەڵ: هەولێر-تشرینی دووەمی ١٩٩١ گۆڤارێکی مانگانەی ئیسلامی گشتی بوو).

بەهەڵە نووسەر (ئیسماعیل تەنیا) نووسیویەتی: (یەکێتی گشتی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان بە

ئەگەر هەڵە و کەموکورییەکیش لە باسی ئەم گۆڤارەدا هەبێت لە نووسەری ناوبراو و کتێبەکەیەوە بووە، کە وەک سەرچاوە بۆ باسکردنی بەکارم هێناوە، نەک هەڵە لە بەندەوە بێت؟ عەرەب گوتەنی: (ناقل الکفر لیست بکافر)! پێویستیش بەم هەرا و هەڵایەش ناکات! دواتر ئەم ڕێکخراوە لەگەڵ ڕێکخراوی (پەیوەندی قوتابیانی مسوڵمان لە کوردستان) لە ساڵی ١٩٩٢ لەمیانەی بەستنی

کۆنگرەی یەکەمدا لە شاری هەولێری پایتەخت یەکیان گرت. رێکخراوی (پەیوەندی ئیسلامی خوێندکاران و لاوانی کوردستان)یان راگەیاند.

لە دەرەوە گۆڤاری (ئالای ئیسلام)یان بە عەرەبی و، لە هەولێریش گۆڤاری (ئالای ئیسلام) و رۆژنامەی رابوونیان بە کوردی دەردەکرد.

باسی گۆڤاری (بانگی راستی)یشم هەر لەم کتێبەوە وەرگرتووە، نەک ئەو سەرچاوەی، کە بەرێزت دەفەرمووی؟! ئەم گۆڤارە دەزگای راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی لەشکری ئیسلامی کورد لە لەندەن ساڵی ١٩٨٧ دەریکردووە، تاوەکو ساڵی ١٩٩١ بەردەوام بووە، کە یەکەم ژمارەی خولی دووەمی لە مانگی ئەیلولی ئەو ساڵەدا دەرچووە(٢٩).

- **رۆژنامەی رابوون:**


بسم الله الرحمن الرحيم
رابوون

زۆربەی ژمارە ئەسڵییەکانی رۆژنامەکە لە ئەرشیفی تایبەتی بەندەدا پارێزراون، چونکە خۆم لەو رێکخراوەدا لە نێوان ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٨) کارم کردووە و ئیشتراکی مانگانەم هەبوو. هیچ هەڵەیەک لە گێرانەوە و باسەکەی مندا نییە، بەڵێ سەرنووسەرەکانی (شاخەوان قادر) پاشان (دلۆڤان جەمیل) بووە. جا دلۆڤان جەمیل نازناوی خوازراوی کاک (ئیبراهیم مەلا زادە)ی خاوەن ئیمتیازی بێت یان نا؟ کە ئەوە پێویستی بە بەڵگە و سەلماندنە پێش هەمووشت. ئینجا وابێ یان وانەبێ؟ کورد وتەنی: (هیچ لەمەوزوعەکە ناگۆرێت)!

زانیارییەکانیش لەسەر رۆژنامەکە هی خۆت نین، بەڵکو لە دەستنووسێکی برای بەرێزم (م.کامەران بابان زادە)وە بەحازری وەرتگرتووە!، هەروەک لە ژمارە (٣)ی لیستی سەرچاوەکانی بابەتەکەتدا ئاماژەت پێکردووە. دواتر من باسی خاوەن ئیمتیازم نەکردووە و، هەڵەی تێدابێت تاوەکو تۆ رەخنە بگری؟!

بۆ زانیاری لەسەری لە کتێبەکەمدا هەیە، بۆیە پێویست بەدووبارەکردنەوە لێرەدا ناکات(٣٠).

- **گۆڤاری جودی:**




تەحەدای نووسەر دەکەم، کە باسی ئەم گۆڤارە و وێنەشی لە کتێبەکەی برای بەرێزم، کاک (هەژار حاتەم)دا هاتبێت، کە لەخۆیەوە و بێ بەڵگە و بێ بنەما نووسیویەتی لەکتێبی ئەو بەرێزەوە وەرمگرتووە؟! کە بەندە لە کتێبەکەمدا باسم کردووە(٣١).

- **گۆڤاری ئاسۆی ئیسلام:**

سەرەتا دەمەوێت ئەوە بڵێم، کە بەندە تەنیا لە بەشی سێیەمی کتێبەکەمدا باسی مێژووی ٢٢ساڵی ڕاگەیاندنی ئیسلامیم لە هەرێمی کوردستاندا کردووە. تێیدا باسی مێژووی ٩١ ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی ئیسلامیم کردووە (١٦ پێش ڕاپەڕین و ٧٥ دوای ڕاپەڕین). دیارە مێژوو نووسینەوەی ڕووداو و بابەتەکانە لە ڕابردوودا بە وردی و ئەمانەتەوە. ئاساییە هەڵە لە ناو، لە ساڵ، لە ژمارە و شوێندا هەبێت. بەتایبەتی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی لە پێش ڕاپەڕیندا دەرچوون هەموویان ژمارە و نوسخەکانیان بەردەست نین و هەندێکیان ناوی سەرنووسەر و دەستەی نووسەرانیان بەسەرەوە نییە. یەکێک لەو گۆڤارانە گۆڤاری (ئاسۆی ئیسلام)ە. هیوادارم بەڕێزت کار و بەرهەمی باشتر بنووسی و، لەمەودوا ڕەخنە بە زمانێکی نەرم و زانستی بگری و بەم شێوازە بنووسی!

جەنابتان بە ٢ ساڵ و ٢٢ ئەڵقەی سۆراغی مێژوو لە کەناڵی پەیام لە نێوان ساڵانی (٢٠١٧-٢٠١٨)دا(٣٢)، کە میوان و شایەتحاڵتان وەک ئەندام و پێشمەرگە و بەرپرسانی باڵای (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کوردستان) بانگهێشت کردووە لەگەڵ خستنەبەردەستی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری (ئاسۆی ئیسلام) لەلایەن کاک (حەمزە ئەحمەدی)یەوە(٣٣)، ئینجا توانیوتانە کتێبێک تەنیا لەسەر ئەو گۆڤارە بە هاوکاری ڕێکخراوی بوار چاپ بکەن؟! کورد گووتەنی: (وەک هێلکەی پاکراویان بۆ لێ کردووی)! کەچی هێشتا دەڵێی نازانم کێ سەرنووسەری بووە و، ژمارە (سفر)ی ئەزموونی کەی دەرچووە؟!

لە نووسینەکەتدا، کە ڕەخنەت لە بەندە گرتووە. دەڵێی: (شەهید ئازاد بەرزنجی سەرنووسەری ئەو گۆڤارە نەبووە؟ بەڵام لە کتێبەکەتدا لە لاپەڕە(٥) دا نووسیوتە: (ئەم کتێبە پێشکەش بێت بە سەرنووسەری گۆڤاری ئاسۆی ئیسلام ئازاد شێخ عەزیز بەرزنجی(٣٤))

سەبارەت بەوەی نووسیوومە ساڵی ١٩٨٧ شەهید بووە، ئەوە دیارە هەڵەی چاپە ڕاستییەکەی ساڵی ١٩٨٥ە، ئینجا ئەوە کەی کێشەیە لە دەوروبەری خورماڵ یان مەریوان شەهید بوو بێت؟ یان (٥) ژمارەی لێ دەرنەچووبێت (٦) ژمارە بێت؟

جارێ هەموو ژمارە چاپکراوەکانی شاخی، کە لە نێوان ساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا دەرچوون و (٦) ژمارەن هەموویان لەسەریان نووسراوە ساڵی دووەم نەک یەکەم؟! هیچ ژمارەیەکی ساڵی یەکەمی، تاوەکو ئێستا دیار نییە!

دواتر خۆت دانی پێدا دەنێی، کە سەروتاری ژمارە (١)ی گۆڤارەکە (شەهید ئازاد بەرزنجی) نووسیویەتی و دەستنووسی ئەو ژمارەیە لە کۆڵەپشتەکەیدا بووە کاتێک بەر بۆردومانی فڕۆکەی عێراق کەوتووە و لە شاری مەریوانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان شەهید بووە و ئامادەی چاپ بووە، واتە لەبەرئەوەی شەهید بووە ئیتر ئەو سەرنووسەری نەبووە؟!

هەر جەنابت دەڵێیت: (پێشتر پەخشنامەی نهێنی بووە لەناو شاری سلێمانی، شەوان بەدیواری مزگەوت و شوێنە گشتییەکاندا هەڵواسراوە) (٣٥)، بێ ئەوەی بتوانی و بیسەلمێنی نموونەیەکی یان وێنەی یەکێک لەو پەخشنامانە لە پاشکۆی کتێبەکەتدا بۆ خوێنەرانی کتێبەکەت بڵاوبکەیتەوە؟!

هەروەها دەڵێیت: (جارێک بە دیواری دەرگای ئەوقافی مزگەوتی گەورەی سلێمانی دا هەڵواسراوە و زۆربەی مەلاکان لێی کۆبوونەوە و بینیوویانە - بە ڕۆژی نیوەڕۆ و خوێندوویانەتەوە)(٣٦)؟!

ئەی سیخوڕەکانی دەزگای موخابەراتی ڕژێم و ئەمنی سلێمانی نەیابینی و پێیان نەزانی و نەیانخوێندەوە؟ دواتر لەسەری کەسیان دەستگیر نەکرد؟! عەجاییەب!

- **هەردوو گۆڤاری پەیام:**

هەموو زانیارییەکان ڕاستن و هەڵەیان تێدا نییە، بەڵکو جەنابت کەوتوویتە هەڵەوە و باسەکە تێکەڵ دەکەیت و بەلا ڕێدا دەبەیت، کاتێک باسی بڵاوکراوەی قەڵەم و گۆڤاری پەیامی مامۆستایانی کۆمەڵی ئیسلامی (مامۆستایانی پێشەنگ) دەهێنیتە ناو باسەکەوە؟!

دیارە لە پێش ڕاپەڕین و لە دوای ڕاپەڕین چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار بەناوی پەیامەوە دەرچوون، هەر بۆ زانیاری بەڕێزت و خوێنەرانی بەڕێز:

– گۆڤاری پام: یەکەم گۆڤاری پەیامی وێنەدار و ڕەنگاوڕەنگ لە عێراقدا بە زمانی کوردی لە بەغداد لەلایەن باڵیۆزخانەی ئەمریکاوە لە نێوان ساڵانی (١٩٥٢ ـ ١٩٥٨) دەرچووە(٣٧).

– گۆڤاری پەیام : گۆڤارێک بووە بە زمانی فارسی لە ئێران دەرچووە، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٧-١٩٩١)، لەو ماوەیەدا (٧٩) ژمارەی لێ دەرچووە(٣٨).




–

بڵاوکراوەی پەیام: زنجیرە بڵاوکراوەیەکی ئیسلامی نهێنی بووە لیژنەی ڕۆشنبیری خەتی دووی ئیخوان لە شاری سلێمانی بە زنجیرەیی دەریانکردووە لە ساڵی ١٩٨٨دا، لە ماوەی ئەو ساڵەدا ٦ ژمارەی لێ دەرچووە(٣٩).

–بڵاوکراوەی پەیام: پەخشنامەی نهێنی مانگانەی بەڕێز (م.عەلی باپیر) بووە لە ساڵی ١٩٩٥-١٩٩٦ بۆ ڕێکخستنەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی، کاتێک ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستنی ئەو حزبە بووە(٤٠).




جگە لە چەندین گۆڤاری تر بەناوی (پەیام و پەیامی ڕاستی، پەیامی ئیسلاح، پەیامی خوشکان و...هتد).

بەندە لێرەدا جارێکی تر ناو و وێنەی هەردوو گۆڤاری (پەیام) بۆ جەنابت و خوێنەرانی بابەتەکە بەوردی دەخەمەڕوو:

– گۆڤاری پەیام: گۆڤارێکی مانگانەی ئیسلامی بووە، ناوەندی ئیسلامی بۆ دیراساتی شەرعی لە هەولێر دەریکردووە. ئەم گۆڤارە سەرجەم ١٦ ژمارەی لێ دەرچووە و دواتر وەستاوە. بەشێوەیەک

ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٩٥ دەرچووە و دوا ژمارەی (١٦) لە ساڵی ١٩٩٦دا دەرچووە(٤١).

- بڵاوکراوەی پەیام:

سەبارەت بەم بڵاوکراوەیە، ڕێکخراوی پەیامی ڕۆشنبیری بەمەبەستی دڵنیایی تەواو و زانیاری لەنزیکەوە ئاگاداربوون. ڕۆژی ٢٠٢٠/٦/٣ لەپەیوەندییەکی تەلەفۆنییدا لەگەڵ هاوڕێی دێرینم بەڕێز (مامۆستا ئەحمەد کەرکوکی) سکرتێری پێشووی مامۆستایانی پێشەنگی کۆمەڵی ئیسلامی و ئەندامی ئێستای سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، جەنابیان زانیارییە بڵاوکراوەکانی بەندەیان لەسەری پشتڕاستکردەوە(٤٢).

ئەو ژمارەیەی لەبەر دەستی بەندەدایە، بریتییە لە ژمارە (٣) لە مانگی تشرینی دووەمی (٢٠٠٥) و ڕەمەزانی ١٤٢٦ی کۆچیدا دەرچووە. لێرەدا بەندە بە ئەمانەتەوە وەکو خۆی زانیارییەکانی سەر ئەو گۆڤارە دووبارە بۆ ئەو بەڕێزە و خوێنەران دەگوازمەوە:

پەیام: بڵاوکراوەیەکی پەروەردەیی ڕۆشنبیری گشتییە، ڕێکخراوی پەیامی ڕۆشنبیری دەریدەکات. خاوەنی ئیمتیاز ئەحمەد کەرکوکی، سەرنووسەر ئامانج دۆڵەیی و بەڕێوەبەری نووسین نەبەز خۆشناو(٤٣).

*** گۆڤاری ئاڵای ئیسلام:**




ئەم گۆڤارە لەماوەی ١٥ ساڵی دەرچوونیدا لە نێوان ساڵانی (١٩٨٦-٢٠٠١) نەک ٢ ڕێکخراو وەکو جەنابت دەڵێی، بەڵکو ٣ ڕێکخراوی جیاواز ئەرکی سەرپەرشتیکردنی و دەرکردنی لەئەستۆ گرتووە؟!

سەرەتا (پەیوەندی قوتابیانی مسوڵمانی کوردستان) دەریکردووە، دواتر (پەیوەندی ئیسلامی خوێندکاران و لاوانی کوردستان) و پاشان (کۆڕی ڕۆشنبیریی ئیسلامی کوردستان) لە هەندەران دامەزراوە و، ئەرکی دەرکردنەوەی گۆڤارەکەی بە زمانی عەرەبی لەئەستۆ گرتووە، هەروەکو ناو و لۆگۆی ڕێکخراوەکە لەسەر ئەم بەرگەی گۆڤارەکە نووسراوە: ساڵی پانزدەیەم ژمارە (١) مانگی ذو الحجەی ١٤١٩ی کۆچی بەرامبەر مانگی ئازاری ٢٠٠١ی زایینی(٤٤).

دواتر بەڕێزیشت زانیارییەکانت لەسەر ئەم گۆڤارە هی خۆت نین، بە ئەمانەتەوە نەقڵت نەکردوون؟! بەڵکو دووبارە لە برای بەڕێزم مامۆستا (کامەران بابان زادە)وە وەرتگرتووە.

*** ڕۆژنامەکانی کۆمەڵ و یەکگرتوو:**



جەماعەی ئیسلامی زەروورەتی ئەم قۆناغەی رابوونی ئیسلامیی کوردستانە

کۆمەڵ

پەیام و بەرچاو روونی و ئامۆژگاری بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر بە بۆنەی ئیعلان کردنی جەماعەی ئیسلامییەوە

نووسیومە بەردەوامن لەدەرچوون. بەتایبەت نووسیومە ڕۆژنامەی کۆمەڵ زیاتر لە (٤٠٠) ژمارەی لێ دەرچووە و بەردەوامە. بەڕێزم بەمەدا دەردەکەوێت، کە نووسینی ئەم بابەتەی بەندە

و کتێبەکەم کۆنە و سەرەتاکەی بۆ ساڵی ٢٠٠٧ دەگەڕێتەوە. دیارە ئەوەندەش بێ ئاگانین لەکاری ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی وەک ئەوەی لە نووسینەکەتدا کەسێتی بەندەت وێنا کردووە! کە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵیدا بووین؟!

بۆ زانیارییت بەیاننامەی دامەزراندنی کۆمەڵی ئیسلامی، کە ٢ لاپەڕەی (A٤)ە لەڕۆژی ٢٠٠١/٥/٣١ دا دەرچووە و، ژمارە (١)ی ڕۆژنامەکەشیم لە ئەرشیفی خۆمدا پاراستووە، لێرەدا وێنەیەکی بڵاوی دەکەمەوە(٤٥).

لەڕاستییدا کێشەکە کەمی کات و هەڵەچنی بووە لەم بارە نالەبارەدا، ئەگینا هەموو خوێنەر و ڕۆشنبیرێکی ئیسلامی دەزانێت، کە ئەو دوو ڕۆژنامەیە ئێستا وەستاون و دەرناچن؟!

پێش کۆتایی (٤) سەرنجی زانستی لەسەر نووسەری بابەتەکە:

١- بۆ نووسینی ئەم بابەتەت، کە ١٢ لاپەڕەیە تەنها ٢ کتێبت بەکارهێناوە، لەگەڵ کتێبێکی دەستنووس، کە ئەویش هی خۆت نییە و هی برای بەڕێزم (مامۆستا کامەران بابان زادە)یە.

٢- فێربە میتۆدی زانستی بۆ نووسینی سەرچاوە وایە، یەکەمجار ناوی نووسەر ئینجا ناوی کتێب و بەرهەمەکەی بنووسە. ئینجا تاکە کتێبی (ئاسۆی ئیسلام)ت، کە لێرەدا وەک سەرچاوە بەکارتهێناوە، لەسەر بەرگەکەی نووسیوتە ئامادەکردن و ساغکردنەوەی کتێبە و توێژینەوە نییە، لە چەند شوێنێکی ناو کتێبەکەتدا نووسیوتە چاوپێکەوتنی توێژەر، ئەگەر توێژینەوەیە کوا بەشی میتۆدنامەی؟ کوا دەرەنجامی؟ کوا لیستی سەرچاوەکانی کۆتایی؟!

٣- ئەگەر ئەمە توێژینەوە بێت؟ لای بەندە و مامۆستایانی زانکۆ لە ڕێگەوە ڕەفز و ڕەتدەکرێتەوە، چونکە ئەو مەرجە زانستیانەی تێدا نییە، کە ئاماژەم پێدا. لەکاتێکدا ڕەخنەی بەناو جەوهەریت لە بەندە ئەو هەڵەیە، کە خۆت لە کتێبەکەتدا دە بارەی دەکەیتەوە؟!

٤- لە (٤٢٤) لاپەڕەی کتێبەکەت، تەنیا ٤٠ لاپەڕەی نووسینی خۆتە ئەویش زۆربەی وتە و ژیانی خەڵکی ترە و، ئەو دوای ژمارە کۆکراوەکانی گۆڤارەکەیە، کە (حەمزە ئەحمەدی) پێی داویت بۆ چاپکردنی. پێشتر لە بەرنامەی (سۆراغی مێژوو) ی کەناڵی پەیام لە نێوان ساڵانی (٢٠١٧-٢٠١٨) بڵاوکراوەتەوە، کە پێشکەشکاری بووی! دواتر هێناوتە، بێ ئەوەی هیچ توێژینەوەیەکی زانستی لەسەر بکەیت و باسی هونەر (ژانر)ەکانی بکەی پلەی زانستی خۆت لە نووسەرەوە کردۆتە توێژەر؟!

دوا وتەم: تکایە لەمەودوا فێربە (کەس) و (کار)ی هیچ کەس بە کەم و سووک و بێنرخ مەزانە! هەروەکو خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (ولاتبخسوا الناس اشیاءهم) (٤٦). هەروەها بە زمانی نەرم و شێوازی جوان ڕەخنەبگرە هەروەک دیسان پەروەردگار دەفەرموێت: (وقولوا للناس حسنا)(٤٧).

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١. ئارام عەلی سەعید، دەربارەی میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان، نووسینی زانستی یان سەرابی ئەکادیمی، گۆڤاری خاڵ، ژمارە (٢٨)، ئایاری ٢٠٢٠، ل١٦٤.

٢. هەمان سەرچاوە، ل١٦٦.

٣. هەمان سەرچاوە، ل١٦٦.

٤. هەمان سەرچاوە، ل١٦٦.

٥. هەمان سەرچاوە، ل١٦٨.

٦. هەمان سەرچاوە، ل١٧١ و ل١٧٣.

٧. نووسراوی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامی ژمارە (٥٨٨) لە ڕۆژی(٢٠٠٤/١٠/١٠).

٨. نامەی برای کاک شەریف وەرزێر لە ڕانیەوە بۆ بەندە لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١٠/١١.

٩. ڕۆژنامەی النفیر، ژمارە ٣، شوباتی ١٩٨٩.

١٠. هەمان سەرچاوە، ل١.

١١. نوسخەی ئەسڵی ژمارەکانی گۆڤاری النفیر (٤ و ٥ و ٧و ٨ و ٩) ی نێوان ساڵانی (١٩٩٠-١٩٩١)، کە

لەئەرشیفی تایبەتی خۆمدا پارێزراون.

١٢. پاشکۆ و دۆسیەی ژمارە (٤)ی گۆڤاری النفیر بەزمانی عەرەبی بە ناونیشانی (فاجعة حلبجة كبرى جرائم العصر- من كيد والتدبير الى الإبادة والتدمير) ، نووسینی (فاتح کرێکار)، ذوالحجەی ١٤٠٩ک/ تەمموزی ١٩٨٩.

١٣. نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری ڕاپەڕین، ژمارە (١)، موحەڕەمی ١٤١١ی کۆچی / ئابی ١٩٩٠ و، ژمارە (٢) شەعبانی ١٤١١ی کۆچی و ئازاری ١٩٩١.

١٤. پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد محەمەد، دەربارەی میدیای ئیسلامی لە هەرێمی کوردستان، ب.چ، تاران، ٢٠٢٠، ل١١٢.

١٥. گۆڤاری الصف، ژمارە (١) ذو القعدەی ١٤١٠ کۆچی/ ئایاری ١٩٩٠، ژمارە (٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤١١ی کۆچی / تشرینی یەکەمی ١٩٩٠.

١٦. هەژار حاتەم، ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق(١٩٨٢-١٩٩١)، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٩٦-٩٧.

١٧. ئیدریس سیوەیلی، بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی ١٩٩٢-١٩٩٩ (توێژینەوەیەکی مێژوویی بەڵگەنامەییە)، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٧، ل٣٠.

١٨ نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری هەڵوێست، ژمارە (٣)، ساڵی یەکەم، ڕەبیعی دووەمی (١٤١٢)ی کۆچی.

١٩. هەمان سەرچاوە، بەرگی پشتەوەی.

٢٠. هەژار حاتەم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧-١٣٨.

٢١. گۆڤاری شاعیرانی ناوسەنگەر، ژمارە(١)، پاییزی ١٩٩١.

٢٢. ئەمیر عەبدوڵڵا ئەحمەد(باز)، زنجیرەکانی تیشک، ژمارە(٦)، تیشکێک لەسەر نرکە و ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، ڕۆژی دووشەممە، ڕەبیعی یەکەمی ١٤١٢ی کۆچی / ١٩٩١/٩/١٦، دەستنووس.

٢٣. چاوپێکەوتنی نووسەر لەگەڵ بەڕێز د.عومەر عەبدولعەزیز سەرنووسەری گۆڤاری بانگی غەریب (نداء الغريب)، سلێمانی، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤.

٢٤. موحسین جوامێر، گۆڤاری هەڵەبجە چۆن لەدایکبوو؟ سایتی کلاو ڕۆژنە، ٢٠١٠/٣/٢٢.

٢٥. هەژار حاتەم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

٢٦. ئیسماعیل تەنیا، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی (ئازاری ١٩٧٥-١٩٩٣)، چ١، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٣، ل٢٠١.

٢٧. هەمان سەرچاوە، ل٢٧٢.

٢٨. هەمان سەرچاوە، ل٢٧٢.

٢٩. هەمان سەرچاوە، ل١٩٩.

٣٠. پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

٣١. هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

٣٢. ئارام عەلی سەعید، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

٣٣. هەمان سەرچاوە، ل٨.

٣٤. هەمان سەرچاوە، ل٥.

٣٥. هەمان سەرچاوە، ل١٢-١٣.

٣٦. هەمان سەرچاوە، ل١٣.

٣٧. عەبدوڵڵا زەنگەنە، سەرجەم بەرهەمە ڕۆژنامەنووسییەکانی شەهید جەباری جەبار (مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی)، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠١٠، ل٩٢.

٣٨. ئیسماعیل تەنیا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٩.

٣٩. هەژار حاتەم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

٤٠. عەلی باپیر، پەیام، ژمارە ٧، هەورامان/ ئەحمەدئاوا، ١٩٩٥/٧/٢٩.

٤١. پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩.

٤٢. پەیوەندی تەلەفۆنی نووسەر لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد کەرکوکی، شەوی ٤ شەممە، ٢٠٢٠/٦/٣.

٤٣. پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥.

٤٤. گۆڤاری ئاڵای ئیسلام، ساڵی پانزدەیەم، ژمارە١، ذوالحجەی ١٤١٩ی کۆچی / ئازاری ٢٠٠١.

٤٥. ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (١)، شەممە، ١٠ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤٢٢ک/ ٢٠٠١/٦/٢.

٤٦. قورئانی پیرۆز، سوورەتی هود، ئایەتی ٨٥.

٤٧. قورئانی پیرۆز، سوورەتی ئەلبەقەرە، ئایەتی ٨٣.




# ڕۆمانی شازادە و شاعیر یان باخێك لە گوڵی ژاکاو؟

سەڵاح سالار



**سەڵاح سالار**

لەدایکبووی ١٩٧٤، گوندی دۆڵەسوور/ سەیدصادق، خاوەنی (٤) کتێبی چاپکراو و ژمارەیەکی زۆر وتار و نووسینی بڵاوکراوەیە.

شازادە و شاعیر ناوی نوێترین ڕۆمانی ئەندازیار و نووسەری دیاری گەلەکەمان خوسرەو جافە. ئەم ڕۆمانە ٤٩٥ لاپەڕەیە و وەک نووسەر خۆی ئاماژەی پێداوە چوار ساڵ پێوەی خەریک بووە. تەنانەت لە سلێمانی، یەکێتیی نووسەرانی کورد کۆڕێکیان بۆ سازدا، بەندە بەشداریی کۆڕەکەیم کرد، بەڵام ئەوکات ڕۆمانەکەم نەخوێندبوویەوە، بۆیە هیچ قسەیەکم لەسەر نەکرد.

لەوێش نووسەر ئەو بابەتەی لە پێشەکی ڕۆمانەکەدا نووسیویەتی باسی کردەوە و زۆر بە ڕاشکاویی لەسەر شیعرەکەی مەستوورە قسەی کرد و جەختی دەکردەوە کە شیعری نالی نییە و هەندێ بەڵگەی عەقڵیی دەهێنایەوە کە لەناو ڕۆمانەکەشدا باسی کردووە، لەوانە: نالی ئەو کاتە ژنی نەهێناوە، ئیتر چۆن ئەوەندە شارەزایی لە ئەندامی زاوزێی ئافرەت هەیە تا بەوشێوە وردە باسی بکات؟ دووەم: نالی ئوستادی شیعر و زمانە چۆن هەشت جار وشەی قڵیشان لەو شیعرەدا بەکاردەهێنێت.

باسێکی نووسینە کۆنەکانی تری خۆی کرد، کە کاتی خۆی بەلێشاو بەر ڕەخنە دراوە، وتی: منیش لە مەسعوود محەمەدم پرسی مامۆستا ئەوە بۆچی؟ ئەویش وتی: لەبەر چەند هۆیەکە: یەکەم: ئەوانەن کە بەخیلن و بەخیلییت پێ دەبەن. دووەم: ئەوانەن خۆیان بەتۆدا هەڵدەزنن تا دەربکەون. جا ئامۆژگارییت دەکەم وەڵامی کەسیان مەدەرەوە. گوتی: ئیتر لەوکاتەوە کردوومە بە نەریت وەڵامی هیچ کەسم نەداوەتەوە کە لەسەریان نووسیوم.

بۆیە منیش چاوەڕێی وەڵامی لێناکەم و تەنیا چاوەڕێم لە خەڵکی ترە کە سەرنجی خۆیان هەبێت و هەڵسەنگاندن بۆ ڕەخنەکانی من و ڕۆمانەکەی نووسەر بکەن.

**ناساندنی نالی:**

با کۆڕەکەی بەجێبهێڵین بچینەوە بۆ ناو کۆڵانە ڕەنگا و ڕەنگەکەی ڕۆمانەکە و سەرێک لەو باڵەخانە بەرز و زەریفە بدەین لە باخچە جوانەکەیدا گوڵەوەچنییەک بکەین.

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین ئەم ڕۆمانە کارێکی جوان و بە نرخە و وەک نووسەر خۆی دەڵێت: یەکجار زەریفە. زانیاریی باشی تێدایە و جارێکی تر (نالی)ی مەزنمان پێدەناسێنێتەوە و سەبارەت بە خاکوخۆڵیش بەرچاومان ڕوون دەکاتەوە، کە ئەوکات خاکوخۆڵ گوند نەبووە و تەنیا هەوارگەیەکی جاف بووە.

سەبارەت بە کەسوکاری نالی شتی نوێ دەبیستین، بۆ نموونە: باسی باب و باپیران و برا و خوشک و دایک و باوەژن و زۆر شتی تر.

لە پێشەکی ڕۆمانەکەدا دەڵێت: (ئەوانەی لەسەر نالییان نووسیوە لە خۆیان نەپرسیوە ئەم خاکوخۆڵە لە کوێدایە، دێیە، شارەدێیە، شارۆچکەیە؟ هیچ یەکێک لەو برادەرانە نەیانزانیوە خاکوخۆڵ تەنیا هەوارگەیەک بووە و بەس).

دواتر دەربارەی باپیرانی نالی دەڵێت: (باوکی نالی، ئەحمەدی کوڕی شاوەیسی کوڕی قەرەوەیسی کوڕی مستەفابەگ کوڕی وەیسی کوڕی عەلی بەگە. باوکی نالی ئەو دەم دوو هەزار و پێنج سەد سەر مەڕ و ماڵاتی هەبووە، جگە لە بەرزە وڵاخ و ڕەشە وڵاخ).

سەبارەت بە دایک و براکانی نالی دەڵێت: (دایکی نالی ناوی ئاڵتوون بووە، باوکی نالی ژنێکی تریشی هەبووە بەناوی مەریەم. لەو دوو ژنە ئەحمەدی شاوەیس شەش منداڵی هەبوو، چوار کوڕ و دوو کچ، بەم ناوانە: خدر، قادر، محەمەد، حسێن، لەیلا، زلێخا). ئیتر نووسەر ڕەخنە لەوانە دەگرێت کە وتوویانە نالی کوڕە هەژارێک بووە، ئەو دەڵێت: باوکی نالی دەوڵەمەند بووە و ئەو هەموو سەروەت و سامانەی هەبووە، بۆیە نالی

وەک فەقێی تر بە ڕاتبە و پارەی سەدەقە و نانی خەڵک نەژیاوە، بەڵکو باوکی شوێن بە شوێن کەسێکی لەگەڵ ناردووە و ماڵی بۆ گرتووە و پارە و خەرجیی بۆ دابینکردووە.

ئەڵبەت ئەگەر ئێمە بیر لەوە بکەینەوە کە نووسەر دەڵێت: باوکی نالی دەوڵەمەند بووە ڕاست دەکات، چونکە جاران هەرکەس مەڕ و ماڵات و دەوڵەتی زۆری هەبوو بێت، ئەوە دەوڵەمەند بووە، ئەوکاتە پارە زۆر نەبووە، دەوڵەت و کشتوکاڵ و بەروبووم زیاتر هەبووە. تەنانەت وشەی دەوڵەمەند لە بنەڕەتدا لە وشەی (دەوڵەتمەند)ەوە هاتووە، واتا ئەوەی دەوڵەتی زۆر بووە، دەوڵەتیش واتا مەڕ و ماڵات.

ئەمە ناساندێکی باشە، بەڵام جگە لەوەی باسی باوکی نالی و قادری برا بچووکی نالی دەکات بە کورتی و زۆر بە کورتتریش ڕۆڵی دایکی نالی دەبینین، ئیتر باسی خوشک و براکانی لە کوولەکەی تەڕیشدا ناکات، کە دەکرا شتێکی بۆ ئەوانیش تەرخان بکردبایە تاکو تام و چێژی زیاتر بداتە ڕۆمانەکەی.

نووسەر پاشان دەست دەکات بە ڕۆمانەکەیی و لە ٥٠ بەشدا کۆتایی پێدەهێنێت، ڕۆمانەکە بە گەڕان بەدوای دەستنووس و بەڵگەنامەکانی نالییدا لە تورکیا دەستپێدەکات و بە دۆزینەوەی بیرەوەرییەکانی نالی لە ماڵی نەوەی هاوسەری یەکەمی نالی کە تورک بووە و ناوی خانم بەهاری یەشارزادەیە، ئیتر دەروازەی ڕۆمانەکە بەگێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی نالی دەستپێدەکات.

ئەم بەشە سەرەکییەی ڕۆمانەکە سەرجەمی خەیاڵە و بە کۆمەڵێک زانیاری مێژوویی ناو هۆزی جاف و عەشیرەتی میکایەڵی و ئەمارەتی بابان و ئەردەڵان و شارەکانی سلێمانی و سنە و زۆر کەسایەتی و شوێنی تر و ڕووداوی مێژوویی ڕۆمانەکەی بە جوانیی داڕشتووە و دەوڵەمەندی کردووە.

خوسرەو جاف هەر لە پێشەکییەدا پێمان دەڵێت: (لەبیری نەکەی، من ڕۆماننووسم نەک مێژوونووس، نووسینی ڕۆمانی مێژوویی تایبەتمەندیی خۆی هەیە، ڕۆماننووس بەپێی نیازی تەکنیکییەوە دەتوانێ دەستکاری لە هەقیقەتە مێژووییەکاندا بکا و تاڕادەیەک گۆڕانکاری تیادا ئەنجام بدا).

بەڵام ئەم بیرخستنەوەیە نابێتە پاساو بۆ کۆمەڵێک هەڵەی مێژوویی کە ئاسمان و ڕێسمان جیاوازییان هەبێت. هەرکەس ڕۆمانەکانی خوسرەو جاف بخوێنێتەوە سۆزدارییەکی زۆر بۆ جاف و بەتایبەتیش بەگزادەکانی جاف دەبینێت، ئەمە مافی خۆیەتی بەو مەرجەی پێچەوانەی هەقیقەتە مێژووییەکان نەبێت. لە ڕۆمانی (پاشایان کوشت)دا کە تایبەتە بە ژیانی حەمە پاشای جاف کە باپیری خۆیەتی، جوان ڕۆمانەکەی نووسیوە و داڕشتووە.

هەر لەو ڕۆمانەدا باسی خیانەتی عوسمان بەگی بابان دەکات بەرانبەر جاف، کە شەڕی بابان و ئەردەڵان ڕوودەدات، جاف بەسەرکردایەتی کەیخوسرەو بەگی جاف، کە سەرۆکی ئێلی جاف و باوکی حەمە پاشای جاف و کەسایەتییەکی دیاری کوردە لایەنگری بابان دەکەن و سەر دەکەون، بەڵام عەبدوڵڵا بەگی کوڕی بریندار دەبێت، بە فیتی عوسمان بەگی بابان برینەکەی ژەهراوی دەکرێت و دەمرێت. لەو ڕۆمانەدا دەڵێت تەرمەکەیان لە گردی سەیوان ناشت و بە عاجزیی و نیگەرانییەوە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا نووسەر دوای دەستکەوتنی بەڵگە و گەڕانی زۆرتر بۆچوونی خۆی گۆڕی و گووتی: عەبدوڵڵا بەگ لە گردی سەیوان نەنێژراوە و هێنراوەتەوە بۆ گۆڕستانی سەیدسادق و لەوێ بەخاکسپێردراوە.

لەم ڕۆمانەدا ئەوەی ڕاستکردووەتەوە، کە دیسانەوە باسی هەمان ڕووداو دەکات، دەڵێت: (تەرمەکەیان بردەوە بۆ شارەزوور).

مەبەستمە بڵێم ئەوە بابەتی ڕۆمانی مێژووییە و

هەر خۆی ڕاستی کردەوە و دەستبەرداری ئەو هەڵە مێژووییە بووە. بۆیە دەکرێت هەڵە مێژووییەکان ڕاست بکرێنەوە و نابێت بەناوی خەیاڵ و ڕۆمانی مێژووییەوە، نەک کتێبی مێژوونووسین، ئیتر دەستبەرداریيان ببین و پەنجە نەخەینە سەر ئەو هەڵانەی کە زۆر زەق و کوشندەن.

من ڕەنگە ئیتر بابەتی سۆز و خۆشەویستی نووسەر بۆ هۆزی جاف و باب و باپیرانی زەق نەکەمەوە، چونکە مافی خۆیەتی و جافیش هۆزێکی گەورە و بەرچاوی کوردە و خزمەتێکی زۆریان کردووە و نکۆڵیی لە گەورەیی و جوانییەکانی جاف وەک نکۆڵییە لە تیشکی ئەستێرە، لەگەڵ ئەوەی ئەم هۆزەش وەک ئەوانی تر ستەم و خراپە و تاوانیشی هەیە، بەڵام من هەڵسەنگاندنی هۆزەکان ناکەم تا بچمە نێو ئەو تەفاسیلەوە، هەرچەندە لەناو ڕۆمانەکەدا دەبینیت بە زەقی ئەمارەتی بابان زەربی سفر دەکات و ئێلی جاف و کەیخوسرەو بەگ و حەمە پاشای جاف زۆر لەوان گەورەتر دەکات و ئەوان تەواو دەشکێنێت، کە ئەمە نارەوایە و هەموو کەس دەزانێت بابان ئەمارەتە و جافیش هۆزە و توانا و لێهاتوویی و درەوشانەوەی ئەم دووانە لە مێژوودا بەراورد ناکرێت و هاوشان نابنەوە، بەڵام جاف هەر سەنگ و قورسایی خۆی هەیە وەک پێشتر باسم کرد.

زمانی ڕۆمانەکە:

نووسەر تاڕادەیەکی باش ڕۆمانەکەی بە زمانی جافی نووسیوە و وشە و دەستەواژەی کۆنی خزاندووەتە ناو دێڕەکانەوە و کارەکەی بۆ خوێنەر خۆشتر و بەچێژتر کردووە. هەندێک جار وشەی جوان و نوێمان فێر دەکات کە نەوەی ئێستا زۆرینەی ڕەهای نەیبیستووە، بۆ نموونە وشەی (نەبیرە)، کە ئێمە تەنیا باب و باپیر و باپیرە گەورە دەزانین، بەڵام نەبیرە واتا چوار پشت زیاتر و بەرۆژووتر. زۆر وشەی جوانترمان بیر دەخاتەوە و فێرمان دەکات.

کەچی ئەم نووسەرە زمانپاراوە، هەڵەی زۆر زەقیش لە زمانی دایکدا دەکات، بۆ نموونە لە کوردیدا پیاو بە برای هاوسەرەکەی دەڵێت (ژنبرا)، کەچی ئەم لە زمانی نالییەوە دەڵێت: نووسینەکانم سپاردووە بە ئۆرخانەفەندی براژنم. لەکاتێکدا ئۆرخان ژنبرایەتیی و برای هاوسەرەکەیەتی.

لەشوێنێکی تردا دەڵێت: (نامەکەی عومەری کوڕی عاس)، لەکاتێک ئەو کەسایەتییە ناوی عەمری کوڕی عاسە.

## نەشارەزایی ئایینی:

لەبەرئەوەی نووسەر شارەزایی لە ئایینی ئیسلامدا نییە هەڵەی زۆر زەقی کردووە، کە ئەمانە ناچنە خانەی خەیاڵ و فەنتازییای ڕۆماننووسینەوە، بۆ نموونە نووسەر نازانێت نوێژی جەژن و هەینی وەک یەک نین.

لە سەرەتای بەشی (٩)دا باسی نوێژی هەینی مزگەوتی ئومەوی دەکات، دەڵێت: (شێخ بەرنوێژی تەواوکرد و هەڵکشایە سەر مینبەر). ئەمە لەکاتێکدا لە نوێژی هەینیدا وتاری هەینی تەواو دەکرێت ئینجا نوێژ دەخوێنرێت. کەمێک پاشتر دیسانەوە دێتەوە سەر حەماسەتی وتاری وتاربێژەکە و دەڵێت: (شێخ بەو زستانە شەلاڵی عارەق ببوو، لە مینبەرەوە یەکراست بەرەو لای من هات و لە تەنیشتمەوە چوارمشقی لێی دانیشت). ئەمەش هەر هەمان هەڵەی پێشووە و بەو حسابە بێت نوێژی هەینییان هەر نەکردووە، نووسەر وەک خۆی پابەندی ئەرکە ئایینییەکان نییە شارەزاییشی لێی نییە و هەڵەی زەق دەکات.

لە بەشی (١١)شدا دیسان دەڵێت: (شێخ عەبدولڕەحمان وەک هەمیشە قامەتی دابەست و لای بەدواوە نەکرد تا بزانێت ڕیزبەندی نوێژکەران چەندە و چۆنە، بەرنوێژی تەواوکرد و بە مینبەردا سەرکەوت، وەک هەفتەکانی پێشوو کەوتە باسی ڕێزداریی و پێگە و جێگەی خەلیفەی ئیسلام).

نەدەبوو نووسەر ئەوەندە بێ ئاگا بێت لە ئیسلام و چۆنیەتی نوێژ و وتاری هەینی و ئاوا نەزانانە شانی بداتە بەر.

ئەم جۆرە هەڵانە هەر ئەوە نییە، لە کۆتایی ڕۆمانەکەشدا کاتێک باسی ئەوە دەکات کە نالی سەردانی مەککەی کردووە و ئەمیری مەککە ڕێزی گرتووە و خانووی بۆ دابینکردووە. لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە نووسەر هیچ لە بارەی مەککە و مەدینە نازانێت.

ئینجا سەیر بکە بزانە دەڵێت چی (هەڵبەستەکەم تەواوکرد لە مزگەوتی پەیامبەری خوداوە، بانگی بەیانم هاتە گوێ).

لە بەشی (٤٥)ی ڕۆمانەکەدا دیسانەوە کە باسی مانەوەی نالی لە شاری مەککەی پیرۆز دەکات، دەڵێت: (من لە نزیکی مەزاری پەیامبەری خوادا خۆم بە غەریب نازانم). لە بەشی (٤٦)یشدا دووجار هەمان هەڵە دەکاتەوە و دەڵێت: (ئەوەتا لە بندەستی مەزاری پەیامبەریشدا ئاسوودەگیم بەدەست نەهێناوە). هەر پاش پەرەگرافێک دیسانەوە دەڵێت: (هەینی وەک هەمیشە بەندە و شێخ محەمەد و شێخ شەهابودین لە نوێژی هەینیدا لە مزگەوتی پەیامبەر بەشداریمان کرد و ئێوارەکەی لە دیوانی ئەمیردا کۆبووینەوە). وەک وتم ئەو میوانی ئەمیری مەککە بووە. لە لاپەڕە ٤٠٠ و ٤٠١ دیسانەوە دەکەوێتەوە هەمان هەڵە، دەڵێت: (ئەوە پەیامبەری خوایە وا ئێمە لە مەزارەکەیەوە نزیکین)، جارێکی تر دەڵێت: (بەرنامەیەکم بۆخۆم داڕشتبوو دەبوایە ئەنجامم بدابا، ئەویش خواحافیزی لە مەزاری پەیامبەر).

نووسەر لێرەدا هێندە نەشارەزایی خۆی دووپات دەکاتەوە کە پاساوی هیچ شتێکی تێدا نییە، ئەویش ئەوەیە بەوپێیە نالی لە مەککە بووە، چونکە چەند جارێک باسی ئەمیری مەککە و ماڵەکەی نالی لەوێ دەکات، بەڵام گۆڕی پەیامبەری ئیسلام (د.خ) لە شاری مەدینەیە و مزگەوتی پەیامبەریش هەر لە مەدینەیە، ئەوەی لە مەککەیە ڕووگەی مسوڵمانانە نەک مزگەوتی پەیامبەر و ئارامگای پەیامبەر. ئەمە لەکاتێکدا نێوانی مەککە و مەدینە زۆر دوورە و ئەگەر نالی لە سلێمانییەوە بڕۆشتبا بۆ شاری سنە و خوارتریش هێشتا ئەوە نزیکتر و ئاسانترە تا ئەوەی نووسەر نەزانێت ئەو دوو جێگەیە چەندە لە یەکەوە دورن. لە هەمووی ناخۆشتریش ئەوەیە ئەم ڕۆمانە بەناوی نالی خۆیەوە دەگێڕێتەوە و گوایە ئەمە دەفتەری بیرەوەرییەکەی نالیی مەزنە، کە لە ئەستەنبوڵ دۆزیویەتییەوە. بۆیە هەڵە قورسەکە ئەوەیە ئەیخاتە سەر شانی شاعیر و زانای گەورەی ئەم دینە نالی گەورە و بەناوبانگ.

## هەڵەی چاپ:

جگە لە هەڵەی مێژوویی و زانیاریی ناو ڕۆمانەکە، هەڵەی چاپیش گرفتێکی دیکەی ئەم ڕۆمانەیە و هەندێ جار مانای گۆڕیوە، تەنیا یەک نموونە دەهێنمەوە، لە لاپەڕە ١٢٣دا باسی سوڵتان مەحموودی دووەم دەکات و، دەڵێت: (سوڵتان مەحموودی دووهەم، سێهەم سوڵتانی عوسمانی). لەکاتێک ئەو سیهەم سوڵتانی عوسمانییە نەک سێهەم، ئەمەیان دیارە هەڵەی چاپە و سی کردووە بە سێ. هەڵەی چاپ لە ڕۆمانەکەدا زۆرە و ئەمە تەنیا یەک نموونەیە.

## هەڵەی مێژوویی:

لەم ڕۆمانەدا هەڵەی مێژوویی زۆر سەیر هەن، کە نەدەبوو خوسرەو جاف بەو هەموو خوێندەوارییە و نووسین و ئاستی هۆشیارییەی بەسەر مێژووی کورد و هۆزەکاندا هەیەتی بکەوێتە هەڵەی ئاوا گەورە و بێ پاساو.

ڕەنگە تۆی خوێنەر سەبارەت بە هەڵەکانی پێشتری نووسەر سەبارەت بە ئیسلام و هەڵە ئاینییەکانی پاساوێکی لەرزۆکی بۆ بێنیتەوە و بڵێیت: ئەو هیچ تێکەڵییەکی بە دینەوە نییە و ئەگونجێ هەڵەی وای کردبێت، کە من ئەو پاساوەش

قبوڵ ناکەم بۆ نووسەر و کاری نووسین وەک پێشتریش باسم کردووە.

بەڵام سەبارەت بەم هەڵە زەقانەی تر کە هی مێژووی کوردن چی دەڵێیت؟

نووسەر لە ڕۆمانەکەیدا باسی فەقێکانی هاوڕێی نالی دەکات، یەکێک لەوانە ناوی فەقێ (جەمیل)ـە، وردە وردە پێمان دەناسێنێت کە فەقێ جەمیل و دواتریش مەلا جەمیل کێیە، دیارە مەبەستی (جەمیل سدقی زەهاوی) شاعیرە، وەنەبێ ئەمەش هەڵەی چاپ بێت، چونکە لە چەند شوێنی جیاجیا و بەشی جیاجیا ناوی دەهێنێت و باسی شیعرەکانی خۆیی و ئەویش دەکات. لە بەشی ٢٠ی ڕۆمانەکەدا زۆر بە زاڵییەوە دەڵێت: بە فەقێ جەمیلم وت: کوڕی مام سدقی... هتد.

تەنانەت لە کۆتایی بەشی ٢١دا لە زمانی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانییەوە کە مامۆستای نالی و محەمەد فەیزی زەهاوییە ـ نەک جەمیل سدقی زەهاوی ـ دەڵێت: ئەم فەقێ جەمیلە خەڵکی ناوچەی زەهاوە، یەک مانگی ماوە ببێتە مەلا، ناوی باوکی سدیقە، جا داواکارم لە ئێستاوە پێی بڵێن مەلا جەمیل سدقی زەهاوی.

ئەمە هەڵەیەکی زل و زەقە، چونکە ڕۆمانەکە لەسەر زمانی بیرەوەرییەکانی نالییەوە دەگێڕێتەوە و لەسەر زمانی مامۆستاکەی نالیشەوە ئەم قسە بێ بنەمایە دەخاتە ڕوو.

لەکاتێکدا جەمیل سدقی زەهاوی هاوتەمەنی نالی نییە و ساڵی ١٨٦٣ لەدایکبووە و ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە. لەوەش خۆشتر ئەوەیە جەمیل کوڕی مام سدقی و سدیق نییە، بەڵکو کوڕی محەمەد فەیزی زەهاوییە و سدقی نازناوی شیعرییەتی. تەنانەت ئەگەر وردەکاری زیاتریش بکەین ئەوا خانەوادەی موفتی زەهاویی و جەمیل سدقی بە بنەچە بابانن، باوکی جەمیل سدقی خەڵکی سلێمانییە و لە سلێمانی لەدایکبووە و فەقێ و هاوڕێی سەردەمی نالی بووە و دواتر لە بەغداش نیشتەجێ بوون و جەمیل سدقی هەر لەوێش لەدایکبووە و مردووە، زەهاوی نازناوی بنەماڵەکەیانە.

ئیتر نازانم خوسرەو جاف ئەم هەموو هەڵەی لەکوێ هێناوە؟ ئەوەی کە فەقێ و هاوڕێی نالی بووە موفتی زەهاوی بووە نەک جەمیل سدقی زەهاوی. جەمیل سدقی نالی بەچاویش نەدیووە و تەنیا وەک من و تۆ ناوی بیستووە.

لە شوێنێکی تر دەڵێت: وەڵەد بەگی جاف هاتووە و داوای ئەسپە شێی قادری برای نالی دەکات بۆ سلێمان بەگی بابان. دەڵێت: (وەڵەد بەگ وتی: سلێمان بەگ زاوامە و مێردی پەریزادی خوشکمە). لە پەڕەی دواتر باسی جێگرەوەی مەحمود پاشای بابان دەکات و دەڵێت: (دوو کەس دەتوانن ببنە جێگرەوەی مەحمود پاشا، کە سلێمان بەگ و حەسەن بەگن، حەسەن بەگ دایکی جافە و خوشکی وەڵەد بەگە). ئەمە نازانم چۆن ڕێککەوتێکە ئەم دووبرایە یەکێکیان کوڕی خوشکی وەڵەد بەگ و ئەوی تریش مێردی خوشکی وەڵەد بەگە؟!

## نالی و مەستوورە:

ئەسڵی ڕۆمانەکە بەناوی ئەم دوو کەسایەتییە گەورەوەیە، نووسەر هاتووە نالی کردووە بە مامۆستای مەستوورەی کوردستانی، ئەمە بۆ فەنتازیا و بابەتی دارشتن و خەیاڵی ناو ڕۆمان دەگونجێت و تارادەیەکی کەم ئاساییە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم دوو کەسە حەقیقەتن و شاعیری دیار و کەسایەتیی هەڵکەوتوون ناڕاستی لەناو چیرۆکەکەدا خراپە و سەر لە خوێنەری داهاتوو دەشێوێنێت.

هەمووومان دەزانین نالی لە سنە قوتابیی بووە و دەرسی خوێندووە و مامۆستا نەبووە، سەبارەت بە شیعرەکەی نالی بۆ مەستوورە خانم، خوسرەو جاف هاتووە خەیاڵێکی زۆری دارشتووە و بۆچوونی بێ بنەما دەکاتە پێوەر و پیاوێکی لە خەیاڵ دروستکردووە تا بیسەلمێنێت ئەم شیعرە

هی نالی نییە و هی ئەو مەلا مەقسوودەیە.

ئەو دەیەوێت بەڵگەی ئەوە بخاتە ڕوو کە شیعرەکە لە مستەوای نالیدا نییە و چۆن ئەم شاعیرە گەورەیە هەشت جار وشەی قڵیشان لە یەک شیعردا بەکاردەهێنێت؟ یان نالی کە ژنی نەبووە و پیاوێکی خواناس و پاکیزە بووە ئەم هەموو شارەزاییەی لە ئەندامی زاوزێی ژن لەکوێ بووە و چۆنی زانیوە؟

دەبێت نووسەر ئەوە بزانێت لەناو زاناکانی پێشوودا بابەتی هۆشیاری سێکسی وەک کتێب و کوڕاسە هەبووە و لەناو فەقێ و مەلاکانیشدا ئاسایی باسی ئەو بابەتانە کراوە و زانیاریی و هۆشیاریی زۆریشیان لێی هەبووە، بەتایبەت ئەوەی زۆر خوێندەوار بووبێت شتی زیاتری دیوە و زانیوە و خوێندووەتەوە. پاشان ئەم شیعرە وەک نەوشیروان مستەفا دەڵێت: نالی شیعرێکی ٤٩ بەیتی هۆنیوەتەوە، بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی وەستاییەکی یەکجار زۆری تێدا بە خەرج داوە، کێش و قافیەی هەر ٩٨ دێڕەکەی وەک یەک دارشتووە. ئەوەی ئەم شیعرە بخوێنێتەوە بڕوای زۆری هەیە کە هی نالییە، چونکە لە ئاستێکی زۆر بەرزی شیعریدا نووسراوە، کەم شاعیر هەبووە بتوانێت وەک نالی شیعر بنووسێت و شیعرەکەی لە هی نالی بچێت، ئەگەر ئەو مەلا مەقسوودە ئەوەندە شاعیر بووە و توانیویەتی لاسایی نالی بکاتەوە، بۆچی کەس باسی ناکات و بۆ بەرهەمی نالی ئاسای نییە؟ بۆیە ئەم خەیاڵە لە قسەیەکی پووچ زیاتر نییە.

**سالم و کوردی:**

لەم ڕۆمانەدا سالم وەک هاوڕێی نالی ناوی هاتووە، تەنانەت نووسەر سالم دەباتە شام و نالی دەبینێتەوە و ژن بۆ سالم دەهێنێت و تێر و پڕیش پێکەوە سوکایەتی بە میرانی بابان دەکەن، کە ئەمانە لەوان بەدوور بووە، سالم هەر بە سەڵتی سەری نایەوە و خۆشەویستی زۆریشی بۆ ئەمارەتی بابان هەبووە، با لە میرێک نزیک و لە میرێک زویر بووبێت. سالم یەک دوو جار ناوی هاتووە، بەڵام کوردی کە ئامۆزای سالم و بە هەرسێکیان دەوترێت سێکوچکەی بابان لە کوولەکەی تەڕیشدا ناوی نەهاتووە، وەک ئەوەی نالی و کوردی خەڵکی یەک شار و یەک سەردەم و هاوڕێی نزیکی یەکتر نەبن. تەنانەت حەبیبەش زۆر بە کەمی ناوی هاتووە و تەنیا لە پەراوێزی ژیان و خەیاڵدانێکی نالیدا تارماییەکی هەیە و ئەو ناوە نییە، کە خۆشەویستی نمرە یەکی نالی بووبێت.

لەکۆتاییدا دەڵێم، ئەم ڕۆمانە کاری جوانی زۆر تێدایە و زمانی نووسینەکەی خۆش و بێ گرێ و گۆڵە، نالی زۆر دەبات و دەهێنێت و تا ئەزهەر و شیراز و شوێنانی تر دەبات و گەورەیی نالی پیشان دەدات، دیمەنی شارستانی سلێمانی و سنە و ئەستەنبوڵ و شام و شارانی تر دەخاتەوە بەرچاومان.

بەڵام لەگەڵ شارەزایی زۆری نووسەر لە ژیانی کۆن و نوێی کورد و ناوچەکانی بابان و ئەردەڵان و جاف و گۆران، کەچی ئەو هەڵە زەق و گەورانەی بەسەردا ڕۆیشتووە و ماوەی چوار ساڵ کە کاری لەم ڕۆمانەدا کردووە بەردەوام بووە لەسەر دارشتن لەسەر هەڵەی کوشندە. بۆ نووسەرێکی وەک ئەندازیار خوسرەو جاف کە هەم نووسەرێکی دیار و هەم کوڕی ناو بەگزادەی جاف و تەمەنی نزیکە لە پیاوە گەورە و شارەزاکانی ناو هۆزی جاف مایەی سەرج و ڕامانە.

ـ هیوادارم نووسەر وەک جافی سینە ساف لە نووسینەکەم بڕوانێت و ڕەخنەکانیش بە دیاری گوڵ وەربگرێت.



# شێوازی خوێندنی پێشینەی کورد

## لە کوردستان، کوردستانی عێراق وەك نموونە

نوسینی: مەلا لەتیفی بامۆکی
داڕشتنەوە و ڕێکخستنی: عادل صدیق

ڕۆژێکی مانگی ئازاری ٢٠٠٨ خزمێکی نزیکمان بەناوی جەبار ئەحمەد(مەلا بەرزان) لە ماڵەوە سەردانی کردم، دوای بەخێرهێنانی دەستی کرد بە باخەڵیدا و چەند پەڕەیەکی دەرهێنا، پرسیم ئەمە چییە؟ وتی مامۆستا مەلا لەتیفی بامۆک دۆست و ئاشنامە، ماوەیەک پێش ئێستا سەردانم کردووە و داوام لێکردووە کە پوختەیەکی ژیاننامەی خۆیم بۆ بنووسێت، ئەویش پرسیویەتی تۆ ژیاننامەی منت بۆچییە؟ منیش وتوومە ئێوە پیاوێکی گەورەن، حەیفە بە مردنتان ناوتان ون ببێ، حەز ئەکەم ئێوە ئەو ئەزیەتەم بۆ بکێشن، لەوانەیە لە داهاتوودا لە یەکێک لە گۆڤارەکاندا بڵاوی بکەمەوە، دوای چەند ڕۆژێک ئەو چەند لاپەڕەی کە ئێستا ئێوە دەیخوێننەوە بە دەست و پەنجەی خۆی ئەنووسێت و تەسلیمی جەبار ئەحمەدی ئەکات (٢٠٠٨/٣/١٢)، بەڵام لەبەرئەوەی نوسینەکەی مامۆستا وەک پێویست بۆ جەبار ئەحمەد نەخوێنرابوویەوە، هێنابووی بۆ من کە جارێکی دیکە بۆی بنووسمەوە، منیش دوای ئەوەی بەدەستی خۆم تەواوی بابەتەکەم بۆ نوسیوەیەوە تەسلیمم کردەوە، بەڵام قەدەر شتێکی دیکە بوو، جەبار ئەحمەد چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بە نەخۆشییەکی کوشندە کۆچی دوایی کرد، مامۆستا مەلا لەتیفیش ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٣/١٤ گەڕایەوە بەر دلۆڤانی خودا، منیش هەر دوای کۆچی دوایی مامۆستا پەیوەندیم کرد بە کاک هوشیاری کوڕی بەرزان ئەحمەدەوە بۆئەوەی سۆراغێکی ئەو چەند لاپەڕەیەم لەنێو ئەرشیفەکانی باوکیدا بۆ بکات، چونکە ئەمزانی هەموو کتێب و نوسینەکانی باوکی کەوتووەتە لای ئەو، بەسوپاسەوە ئەویش دوای ئەوەی کە بابەتەکەی دۆزیبوویەوە، زەحمەتی کێشاو وێنەیەکی دەستنووسەکەی خۆمی بۆ ناردمەوە، منیش لێرەدا بە ئەمانەتەوە وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە.

شێوازی خوێندن لە ڕابردوودا لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بەناوی فەقێیەتی ناسراوە، سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی خوێندن بە ئەڵقە، لە سەرەتادا زانایان و فەقیهەکان وەک پێشەوا ئیمامی مالیک لە مەدینەی منەوەرەوە کە زیاتر لە (٤٠٠) فەقێی هەبوو هەموو جارێک فەرموودەکانی بە سەنەدەوە دەخوێندەوە، دەیفەرموو ئەم فەرموودە لە فلانی کوڕی فلان لە خاوەنی ئەم گۆڕە دەگێڕنەوە(گۆڕی پێغەمبەر د.خ).

ئەم جۆرە خوێندنە پەرەی سەند و لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوویەوە، هاوکات ئەم جۆرە خوێندن و دیراسەیە لە کوردستانیشدا جێگیر بوو و پەرەی سەند. زانایان لە پاڵ مزگەوتەکاندا جۆرێک لە حوجرەیان دامەزراند، لە سەرەتاکانیدا هەر پلەیەکی خوێندن ناوێکیان بۆ دانا. بەگشتی خوێندن سەرەتا لەلای دایک و باوک و لە گوندی لەدایکبوون و لەم سێ وشەوە (یاالله توفیقم بدە، یافتاح فەتحم بدەی، یا رزاق رزقم بدەی، ئەلف، بێ، تێ... بەدەنگ أ، ب، ت) بە ڕەنگ دەستپێ دەکرا، پاش ناسینی وێنەی پیتەکان و لەبەرکردنی هەر (٢٨) پیتەکە دواتر لە پارچە کاغەزێکدا تۆمار دەکرا، بەم شێوەیە عەرەبی فێردەکرا، پاش فێربوونی دانانی حەرەکە لەسەر پیت لە دەستەواژە و ڕستەکانی(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بە حونجە و سایە بەشێوەی(ئەلف سەر ئە، عەین واو عو، ذ ال بوور ذو= أعوذ... هتد). ئەوکات قوتابی بەم شێوازە فێری خوێندن دەبوو، پاش ڕاهێنان لەسەر ئەم شێوازە لەسەر کاغەز فێری نوسین دەکرا، قوتابی لە ماوەیەکی دیاریکراودا فێری نوسین و خوێندنەوە و زمانی عەرەبی دەبوو.

دیارە لەو سەردەمەدا خوێندن بە زمانی عەرەبی بووە و کەمتر کوردی بەکاردەهات، واتە پیتەکانی(ە، و، ی، ێ، ڕ، ۆ، ڵ...هتد) بەم شێوەیە بەکارنەدەهات، بەڵکوو فارسی و تورکی و عەرەبی بەهەمان شێوەی (حەرف و حەرەکەی) ئەلف و بێ فێردەبوون، بۆ خەت خۆشیش تۆماری نامەی پیاوە

گەورەکان قوتابی مەشقی لەسەر دەکرد هەتا فێری خوێندن و نوسین دەبوو بۆ ئەم پلەیە، کە ئەمەش نزیکەی یەک ساڵی دەخایاند، هەندێک جار لەوەش زیاتر، لە پاشاندا نازناوی قوتابی بۆ دیاری دەکرا، کە وشەیەکی عەرەبییە و کوردێنراوە، وشەکە لە (کتاب)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، واتە شوێنی فێربوونی نوسینی مەکتەب، بەمانای نوسینگە و کتابی ـ واتە فێرخواز(کتاتیب)دا.

پاش ئەم پلەیە و خەتمکردنی قورئانی پیرۆز کە بە ئاهەنگ و زیافەت لەسەر ئەرکی باوکی قوتابی و بە بانگهێشتی مامۆستای قوتابی و هاوەڵەکانی ئەنجام دەدرا، لە پلەی دووەمدا دەبوو بە سوختە، واتە دەچووە ناو فەقێکان و ئەرکی چا لێنان و گسکدان و ڕاتبەی نان چنینەوەی پێ دەسپێردرا و کتێبی فارسی(أی شده مخلوق، اسماعیل نامە، نامگان ونصاب الجیهان) و گەلێک کتێبی تر فێردەکراو ئەساسی سەعادەت و ئیقبالنامە و ئیمان و ئیسلام و ئاسمان و زەمین هەندێک کتێبی کوردی لەوانە کتێبی(ئەحمەدی) کە عەرەبی و کوردییە فێر دەبوو، ئەو پلەیە یەک دوو ساڵی دەخایاند و هەر لەژێر ئەم ناوەدا دەست دەکرا بە خوێندنی زانستی (نحو صرف)، لە ـ عوامیل ـ ی جورجانی و هدایە و تصریفی زەنجانییەوە دەستی پێ دەکرد، ئەم کتێبە زانستییە عەرەبییانەی دەخوێند(انموذج، اظهار، صراج تصریف ملا علی، حمدیة، وصح استعارة ملا أبوبکرمصنف). خوێندکار لەم پلەیەدا تەمەنی بەرەو هەرزەکاری هەڵدەکشا و لەم قوتابخانە بۆ ئەو قوتابخانە و لەم گوند بۆ ئەو گوند و لەم ناوچە بۆ ئەو ناوچە کەپری دەگواستەوە و پێی دەنایە پلەی موستەعید، لەگەڵ خوێندنی خۆی دەرس و دەوری بە خواری خۆشی دەگووتەوە، واتە لە یەک کاتدا هەم مامۆستا بوو هەم فێرخواز، لە مانگی ڕەمەزان و لە جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزاندا مەلایەتی گوندی دەکرد و زەکات و سەرفیترەی وەردەگرت بۆ کتێب و بەرگ و مەسرەف.

زۆرجار لە کاتی خوێندن لەبەر نەبوونی چاپی ئەو کتێبانەی کە دەیخوێند دەرسەکانی بەدەستی خۆی دەنووسییەوە بۆ خۆی یان بۆ خەڵکی تر، لەگەڵ خوێندنی زانستەکانی ئاییندا (فتح القریب) و فەرمووەدەکانی دەخوێند، کەم کەم فێری شەرع دەبوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری هاوزمانەکانی لەناو گوندنشینان و دێهاتەکاندا.

ئەم جۆرە خوێندنە کە بە نان و مەسرەفی خەڵکی ڕەش و ڕووت تەواو دەکراو بەبێ مووچەی دەوڵەت لە گوندەکان بە ئەرکی ئایینی و کۆمەڵایەتیی و چارەسەری کێشە خێزانییەکان هەمیشە مەلا و فەقێ لە جێگای پزیشکی دەروونناس و مامۆستای ئایینی و چاوساغی کۆمەڵایەتی ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا و ڕۆڵەی هەژار و جوتیارەکانی فێری خوێندن و نوسین و ئەرکی ئایینی دەکرد.

فێرخواز پاش تەواوکردنی پلەکانی خوێندن ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرت و لە یەکێک لە گوندەکان دەبوو بە مەلا، ئەویش بە هەمان شێوە فەقێی ڕادەگرت و درێژەی بە بەرنامەکە دەدا، هەندێک دیاردە و تایبەتمەندی ئەم جۆرە خوێندنە لە کوردستاندا هەبوو، لەوانە:

یەکەم/ ئەگەر توانا و زیرەکی هەبوایە جۆرێک ئەزموونی مەلایەتی هەبوو ئەنجامی دەدا، کە بریتی بوو لە تاقیکردنەوەی دەرباز لە خزمەتی سەربازی کە دوازدە پۆل بوو لە ماوەی کاری فەقێیەتییدا بەسەرپەرشتی (مودەڕیس)ەکانی قوتابخانەی ئایینی و لەژێر چاودێری(دائرة تجنید) دا ساڵانە تاقیکردنەوەی دەدا و دەبوو بە مەلای دوانزە عیلم، ئەم بڕوانامەیە هاوتابوو بە بڕوانامەی پێنجی ئامادەیی کە ئەوکات پۆلی شەش نەبوو، خوێندکار لە پاش پۆلی پێنجەم ڕاستەوخۆ دەچوو بۆ زانکۆ(جامعە)، زانستی بۆ زانستی و ئەدەبی بۆ ئەدەبی و ئاینیش بۆ شەریعە.

دووەم/ مووچەی لە دەوڵەت نەبوو، بەڵکو لەلایەن خەڵکەوە مەسروفاتی بۆ دەکرا، بەڵام

زەوی پێ دەدرا بۆئەوەی کە کاسپی و فەلاحەتی خۆی بکات.

زۆربەی مەلای گوندەکان سەربەرزانە دەژیان، قسەی خۆمان بێت(ئاغا و دەرەبەگ و کولاک) زۆر دژی مەلاکان بوون، لە بەرمبەردا ئەوانیش خوا هەڵناگرێت کەمتەرخەم نەبوون لە دژایەتیکردنی چینی دەرەبەگدا، چونکە زۆربەی بیروباوەڕەکان دژی چینایەتی و چەوساندنەوە لە رێگەی مەلاکانەوە بڵاودەکرایەوە و پاڵپشتی لێ دەکرا، بە چاوساغی هەندێک مەلای باش ئەو جۆرە بیروبۆچوونانە لەناو جوتیارەکاندا رۆژ بە رۆژ لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدا بوو.

سێیەم/ کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانی وەک ژن مارەبرین و تەڵاق و دابەشکردنی میرات و چارەسەری کیشە کۆمەڵایەتییەکان و سوڵحی عەشایەریی و دوعا نوسین و بەرێکردنی مردووی گوندەکە تا دەگاتە نامە خوێندنەوە و نامە نوسین تەنها لە رێگەی مەلا و فەقێکانەوە ئەنجام دەدرا، بۆ کاروبارەکانی وەک پرسە و شایی و شیوەن مەلاکان چاوساغ و رابەربوون لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا، ئەوەش بە حوکمی ئەوەی ئەوان چینی نوخبە و خویندەواری ناو کۆمەڵگەی کوردی بوون لەو سەردەمەی کە ئێمە باسی دەکەین.

چوارەم/ لەرووی هەستی نەتەوایەتیی و نیشتماپەروەرییەوە ئەم توێژە هەمیشە رابەر و رێنیشاندەربوون، دەتوانین بڵێین تارادەیەکی زۆر مانەوەی کورد وەک نەتەوە دەگەرێتەوە بۆئەوەی کاروباری ئایینی و ئیسلامی لە دەستی هاوزمانی کورد خۆیدا بووە، خۆ ئەگەر کاروباری ئایینی لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا لە دەستی مەلا و زانایانی نەتەوە سەردەستەکانی(داگیرکەرانی کوردستان)دا بووایە، کورد وەک نەتەوە دەتوایەوە و وەک خاوەن زمان و مێژوو و خاک نەدەمایەوە، کە ئەوەش خراپترین چارەنووس بوو بۆ ئێمەی میللەتی کورد، پێموایە ئەم برگەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستییانەی زیاتر هەیە، کە لێرەدا جێگەی باسکردنی نابێتەوە.

پێنجەم/ بۆ پاراستنی زمان و ئەدەب و مێژووی کەلەپووری ئەم میللەتە هەمیشە ئەم توێژەی(مەلا و فەقێ) ناو کۆمەڵگەی کوردی رابەر و پێشەوا بوون و لەو مەیدانەدا رۆڵی ئێجگار گرنگ و کاریگەریان گێراوە، هەتا چەرخی هوشیاری جڵەوی ئەدەب و وێژەی کوردی لە دەستی مەلا و فەقێدا بووە، بەڵگەشمان بوونی ئەو هەموو کەڵەشاعیر و وێژەوان و نوسەرانەیە لە مێژووی گەلی کورددا.

شەشەم/ مەلا و فەقێ هەمیشە لەگەڵ رێزە رەسەنەکانی تەریقەتدا بوون و هەمیشە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی شێخانی تەریقەت پڕبووە لە مەلای باش هەتا ئەم تەریقە بۆ خوا بووایە، بەڵام ئەم تەریقە ئەم دێڕە شیعرەی بکردایە بە دروشم(بدلو طريقة الگيلاني ـ بالكشك والأقط والادهان) ئەوکاتە مەلا دوژمنی سەرسەختی تەریقە دەبوو، دژایەتی مەلا و فەقێ لەلایەن شێخزادەکانەوە بە رِوونی و ئاشکرا دەکرا، تۆمەتی بێدینی و کۆمۆنیستی دەدرایە پاڵ مەلا، بەڵام مەخابن و ئەوەی جێگەی داخە خەڵکی رەش و رووت کەوتبوونە ژێر کاریگەری پروپاگەندەی شێخەکان و لەو مەلایانە دووردەکەوتنەوە کە دژایەتی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی شێخەکانیان دەکرد.

حەوتەم/ مەلای کورد هەمیشە لە خەمی دەوڵەتی نەتەوەدا بووە و بروای بە سنووری دەستکرد نەبووە، سنوورە دەستکردەکانی نێوان پارچەکانی کوردستان هیچ کات رێگر نەبووە لە بەردەم خوێندنی فەقێیەتی بەتایبەتی مەلا و زانایانی ئایینی کورد: لە هەڵەبجە، بیارە، خورماڵ، سلێمانی، هەولێر، کۆیە، کەرکوک، خانەقین، مەریوان، موکرییان، ئامەد....هتد. مەڵبەندی زانست و زانیارییە جۆربەجۆرەکانی زمانی عەرەبی و شەرع و حیکمەت و مەنتیق و زانستی کەلام بوون.

مەلای کورد هەمیشە پاڵپشتی میری کورد بووە

و سەربەخۆیی کورد و کوردستان ئامانجیان بووە، دژی پشتبەستن بوون بە فەرمانڕەوایانی فارس و تورک و عەرەب، هەمیشە دژی ناکۆکی و شەڕی مەزهەبی بوون، ئەوەی جێگای داخە زۆرجار عوسمانیی و سەفەوی شەڕە مەزهەبییەکانی خۆیان لەسەر خاکی کوردستان یەکلایی کردووەتەوە، بەمانایەکی دیکە شەڕی دەسەڵاتیان لەسەر خاکی ئێمە ئەنجامداوە.

زانایانی ئایینی لە کوردستاندا هەوڵیاندا لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی شارەزابن، زۆرجار مەلاکانی کورد ئەوەندە شارەزابوون لە زمانی ئەو میللەتانە بەشێوەیەک لە خۆیان زیاتر شارەزای زمانەکەیان بوون، تاوایلێهاتووە ئەو زانا و مەلایانەی کوردیان بەبێ ئینصافانە بە ڕۆڵەی خۆیان و خاکی خۆیان داناوە، لەم بوارەدا نمونەمان زۆرە لە مێژووی کورددا. خۆ ئەگەر ناوەکەی ئیسلامی بووایە ئەوا ناسینەوەی زۆر زەحمەت تر دەبوو.

هەشتەم/ مەلا و فەقێی کورد هەمیشە لەگەڵ ئەوەبوون کە ئابووری کوردستان وابەستە نەبێ بە ئابووری داگیرکەرانی کوردستانەوە.

هەتا ئێرە شێوازی خوێندن و کاری فەقێیایەتی بووە لە کوردستاندا بەگشتی، بەڵام وەک نمونەی کەسایەتی و خوێندنی فەقێیەتی نوسەری ئەم بابەتە(مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی) بەم شێوەیە بووە:

صۆفی مەولودی باوکی لە سەرەتای چلەکاندا دەڕوات بۆ سەردانی شێخ عەلی حوسامەدین لە گوندی باخەکۆنی ناوچەی هەورامان، دەپرسێت لە صۆفی مەولود شێخ چەند منالت هەیە، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: قوربان سێ خزمەتکاری تۆم هەیە بەناوەکانی(عەلی، لەتیف، سەعید)، شێخ حوسامەدین دەڵێت: ناوەڕاستیان بخەرە بەر خوێندن. کاتێک صۆفی مەولود دەگەڕێتەوە بۆ گوندی بامۆک دەستی لەتیفی کوڕی دەگرێت کە ئەوکات منالێکی ناشیرینی پیس و پۆخڵ و دەم و لوت چڵمن و ڕەش و ڕووت و پێخاوس بووە، دەیباتە لای مامۆستا مەلا محەمەد ڕەشید و دەڵیت: مامۆستا، شێخ حوسامەدین فەرموویەتی لەتیف بخەمە بەر خوێندن، مەلاڕەشید لە بنەماڵەی مەلایانی بامۆک و مەلازادە بووە و حەوت برای تری هەبووە و هەموویان کوڕی مەلای گەورەی بامۆکن، مەلاڕەشید زۆر بەلایەوە ئەستەم بووە کە ئەو منالە فێری خوێندن ببێت، بۆئەوەی صۆفی مەولود پەشیمان بکاتەوە ڕاستەخۆ ناڵێت ئەم منالە بە کەڵکی خوێندن نایەت و بێکەڵکە، بەڵکو دەڵێ صۆفی مەولود ئەگەر گا ڕەشم بدەیتێ خەرجی ئەمەی پێ تەواو ئەکەم، صۆفی مەولود دەستبەجێ گا ڕەشی بۆ ئەهێنێت.

بەم شێوەیە لەتیف لەناو مندالەکانی تری گوندی بامۆکدا دەست دەکات بە خوێندن، واڕێکدەکەوێت کوڕی گەورەی مەرحومی مامۆستا مەلا ڕەشید لای باوکی قوتابی دەبێ هەتاوەکو دەگاتە سورەتی (والشمس)، پاش یەک مانگ ئەم قوتابییە ناشیرینە(لەتیف) نزیک دەبێتەوە لەو سورەتەی کە بەر لە مانگێک لەوەو پێش محەمەدی کوڕی مامۆستای تێدا بووە، فەقێ لەتیف دەڵێت: مامۆستا خۆم ئەوەم ڕەوانە، مامۆستاش بەسەرسوڕمانێکەوە لێی دەپرسێت، چۆن، فەقێ لەتیف دەڵێت: مامۆستا گوێم لێبگرە، کاتێک فەقێ لەتیف بە حونجە و سایە ئەو سورەتەی بۆ مامۆستا خوێندەوە، مامۆستا دەڵێت: سبحان الله، باوکم ئەم کوڕە سێ ساڵ شوانی ئێمە بووە بەنانە سکی بۆئەوەی فێری نوێژ ببێ، کوڕی وەک ئەم هەتیوەی هەیە و ئێمەش چوار پشتمان مەلابوون هەرچی ئەکەم گوێناداتە خوێندەواری.

دواتر جزمی عەممەی پێ تەواو دەکات و دەریدەکات، باوکی، لەتیف ڕەوانەی لای مەلا مەولودی بامۆکی دەکات، ئەویش چەند مانگێک دەرسی پێ ئەڵێ و دەریدەکات، پاشان مەلا

لەتیف دەچێتە لای مەلا سەعیدی حافز لە بامۆک، هەتا جزمی (تبارک) تەواو دەکات، دواتر باوکی دەینێرێتە لای مەلا مستەفای کۆکۆیی لە تەکیەی سەید نەسروڵڵا لە هەڵەبجە، فەقێ لەتیف یەک دوو مانگێک هەموو رۆژێک لە بامۆکەوە بە سەرمای زستان و بەناو قوڕ و چڵپاودا بۆ خوێندن دێتە هەڵەبجە، ئەو رۆژانە فەقێ لەتیف منداڵ دەبێ، لە مزگەوتی تەکیە چوار پێنج موستەعیدی لێ دەبێ، لەناویاندا مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوا و مامۆستا مەلا یوسفی گڵێجاڵی بوون، هەموو هەینییەک مەرحومی مامۆستا مەلا عەزیزی پریسی لە گوندی پریسی ژوورووەوە بۆ نویژی هەینی دەهات بۆ هەڵەبجە، لەهەمانکاتدا کتێبی (تاريخ معجم)ی بە مامۆستا مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوا دەگووتەوە.

لەو رۆژانەدا مامۆستا مەلا مستەفا لەسەربان کەوتە خوارەوە و گیانی سپارد بە پەروەردگار، هەر لەبەر ئەوەش بوو حوجرەکەی لە دوای خۆی داخرا، لەبەرئەوە جارێکی دیکە فەقێ لەتیف بێ مامۆستا دەمێنێتەوە، باوکی پەنا دەباتە بەر مەلا محەمەد کە ئەوکاتماڵیان لە نزیک باخی میر بوو، مەلا محەمەد بڕیار دەدا کە دەرس بە فەقێ لەتیف بڵێت بەومەرجەی رۆژانە کە لە بامۆکەوە دێت بۆ خوێندن مەشکەیەک دۆ لەگەڵ خۆیدا بهێنێت بۆ ماڵی مامۆستا، کاتێک کە پایز دێتە پێشەوە و دۆ نامێنێت مامۆستا مەلا محەمەد فەقێ لەتیف جواب دەکات و پێی رادەگەیەنێت کە ئیدی دەرسی لەلای ئەو نەماوە و قورئانی خەتم کردووە، لەهەمانکاتدا داوای لێکرد کە لەوە بەدوا بڕوات لە حوجرەی فەقێیان درێژە بە خوێندن بدات. فەقێ لەتیف زۆر بەترسەوە دەڕوات بۆ گوندی عەنەب کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجە بە دووری (٢-٣کم)، مامۆستای ئەو گوندە ئەوکات مامۆستا مەلا قادری مەلا عەبدوڵڵای شێخ قادری عەبابەیلێ دەبێت. لەوێ دەستدەکات بە خوێندنی کتێبەکانی (ئیسماعیل نامە) و (ئیقبال نامە)، دوای ماوەیەک ئەو گوندە بەجێدەهێڵێت و ڕوودەکاتە گوندی عەبابەیلێ، لەوکاتەدا مامۆستای پایەبەرز مەلاحەسەن مودەڕڕیس بوو لەو گوندە، موستەعیدەکانیش ئەمانە بوون: مەلا ئەحمەدی موفتی زادە، مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ عومەری قەرەداغی، مامۆستا شێخ خالیدی موفتی، مەلا رەسوڵی باوەجانی، سوختەکانیش بریتی بوون لە: مەلا لەتیفی بامۆکی، فەقێ محەمەدی مەلا رەشیدی بامۆکی، فەقێ حسەینی عەنەبی، فەقێ عەلی کۆکۆیی، فەقێ عومەری ڕێشاویی و فەقێ عەلی عێل بەگی.

فەقێ لەتیف دەستدەکات بە خوێندنی (عواملی جورجانی)، هەر لەو گوندە (عەواملی اظهار) تەواو دەکات، دواتر دەستدەکات بە خوێندنی (انموذج)، پاشان ڕوودەکاتە گوندی چنار بۆ لای مامۆستا مەلا شەفیقی کۆکۆیی، لە موستەعیدەکانی: مامۆستا شێخ خالیدی موفتی، مامۆستا سەید عەلی تاوگۆزی، مەلا یوسفی تینی و مەلا ساڵحی زەردۆیی بوون. فەقێ لەتیف لەگەڵ مەلا حامیدی کۆکۆیی لەلای مامۆستا مەلا شەفیق (اظهار) تەواو دەکات.

پاشان فەقێ لەتیف گوندی چنار بەرەو گوندی بیارەی ناوچەی هەورامان بەجێدەهێڵێت، کە ئەوکات (دارالعلم) بوو، هەر لەوکاتەدا بوو مامۆستا شێخ محەمەدی بالیسانی لە هەولێرەوە هاتبوو بۆ مەدرەسەی بیارە، ئەو رۆژانە لە خانەقای بیارەدا نزیکەی (٧٠) فەقێ و، لە مەدرەسەکەدا (٢٠) فەقێ و فەقێی تاڵش دوو سێ کەسی لێ بوو، فەقێ لەتیف بۆماوەیەکی زۆر لە بیارە مایەوە هەتا کتێبی (سیوطی) تەواوکرد.

دواتر دەگەڕێتەوە بۆ لای مامۆستا مەلا جەمیلی موفتی لە مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە و درێژە بە خوێندن دەدات، پاشان دەڕوات بۆ لای مەلا ساڵحی گەورە لە مزگەوتی کانی عاشقان،

لە موستەعیدەکانی ئەو مزگەوتە: مامۆستا مەلا محەمەدی شەمێرانی، مامۆستا شێخ خالیدی موفتی و مامۆستا سەید ئەحمەدی تاوگۆزیی بوون. پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی(بامۆک) و ماوەیەک لەلای مامۆستا مەلا ساڵحی گەورە درێژە بە خوێندن دەدات، پاش ئەوە هەڵەبجە بەجێدەهێڵێت و ڕوودەکاتە شاری سلێمانی لە مزگەوتی (سەید حەسەن) درێژە بە خوێندن دەدات، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە و ڕوودەکاتە مزگەوتی خانم لەلای مامۆستا شێخ محەمەدی شێخ ڕەسوڵ درێژە بە خوێندن دەدات، دواتر ئەویش بەجێدەهێڵێت و ڕوودەکاتە لای مامۆستا مەلا سەعیدی زمناکۆ لە گوندی کانی کەوەی ناوچەی شەمێران، لە پاشاندا ڕوودەکاتە ناوچەی هۆرێن و دەچێتە لای مەلا حەسەن کە زاوای مامۆستا مەلا قادری صۆفی بوو.

لەوێشەوە ڕوودەکاتە خانەقین و دەچێتە لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی فائیزی مەلا ڕەسوڵی دێلێژە، لە دوای ئەمانە جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە و ڕوودەکاتە لای مامۆستا مەلا عوسمان لە گوندی پریسی ژووروو، دواتر لەگەڵ مەلا مستەفای پێنجوینی و مەلا عومەری ڕێشاویی و مەلا عەلی کۆکویی دەگەڕێنەوە بۆ مزگەوتی کانی عاشقان، ماوەیەک بەکاری دەرس خوێندنەوە لەلای مەلا ساڵحی گەورە بەسەر دەبەن. دواتر فەقێ لەتیف ڕوودەکاتە بایتگان لای مەلا فەتاح و لەوێشەوە دەچێتە لای مەلا مەجیدی وەڵەدبەگی لە دەوڵەتئاباد، پاش ئەوە دەڕواتە پاوە بۆ لای مامۆستا مەلا حەمەزاهید، لەوێشەوە سەردانی شاری مەریوان دەکات، ماوەیەک لەلای مامۆستا مەلا باڵکی دەمێنێتەوە، دواتر ئەویش بەجێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای مامۆستا مەلا عارفی بانەیی لە شاری پێنجوێن.

لە دوای گەڕانی ئەم هەموو قوتابخانە و مەڵبەندە ئایینییە بۆ کۆتا جار دەگەڕێتەوە بۆ شاری هەڵەبجە، لە گوندی عەبابەیلێ لەسەر دەستی مامۆستا مەلا عوسمانی پریسی ئیجازەی زانستی مەلایەتی وەردەگرێت، بەڵام مەلا لەتیف کاری مەلایەتی ناکات، بەڵکوو تاقیکردنەوەیەکی لێهاتوویی ئەنجام دەدات و دەبێت بە مامۆستای سەرەتایی، مەلا لەتیف لەبەر لێهاتوویی لە قوتابخانەکانی ناوەندی و دواناوەندی و پەیمانگا ئیسلامییەکەی شاری هەڵەبجە دەستدەکات بەکاری وانەوتنەوە.

لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلولدا تێکەڵ بە خەباتی چەکداری دەبێت و دەچێتە نیو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە. لە پاش ڕاپەرینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ دەبێتە بەڕێوەبەری ئەوقافی سلێمانی، پاش ئەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شاری هەولێر و دەکرێت بە سەرپەرشتیاری قوتابخانە ناوەندیی و دواناوەندیی و پەیمانگای پێگەیاندنی وتارخوێن و پێشنوێژەکان لەو شارە، لە ئێستادا خانەنشینە و لە ماڵەوەیە، تەمەنی بەدەستی خوای مەزنە.

# عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی



**کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)**

لەدایکبووی ١٩٨٦ کەلار، بەکالۆریۆس لە زمان و ئەدەبیاتی فارسی، زانکۆی تاران، ٢٠١٩، خوێندکاری ماستەر لە هەمان زانکۆ. خاوەنی ژمارەیەکی زۆر کتێبی لە چاپدراو و ژمارەیەک لێکۆڵینەوەی بڵاوکراوەیە لە گۆڤارەکاندا.

ئەم شاعیرەش هەروەكو هەندێك لە شاعیران و نووسەران و ئەدیبانی كۆنی كورد، ژیان و بەرهەمی نەزانراوە و تێكەڵی و ئاڵۆزی لە ژیان و ناو و بەرهەمیدا هەیە، ژیانی ئەمیش لەناو ژیانی كاروانی ئەو شاعیرانەدایە كە ناتوانرێت بە ئاسانی و بێگومان قسە لە سەر ژیان و بەرهەمی بكرێت.

هەندێك لەو سەرچاوانەی بەردەستی ئێمە تەنها شیعریان بڵاوكردووەتەوە و هەندێكی تریشیان كورتەیەك لە ژیان و بەرهەمی... بەداخەوە ئەم شاعیرە تەنها چەند پارچە شیعرێكی ماوە، ئەوانەشی كە ماون لەگەڵ شیعری شاعیرێكی تریدا تێكەڵن. لە مێژووی ئەدەبی كوردیدا عەبدوڵڵا ناوی شاعیرمان زۆرە، بەڵام كام عەبدوڵڵا؟! لێرەدا بە كورتی تیشك دەخەینە سەر ژیانی ئەم شاعیرە و كورتە لێكۆڵینەوەیەك لە بابەت ژیانی ئەم شاعیرەوە ئەنجام دەدەین.

هەندێ بڕوایان وایە عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی و عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ یەك كەسن، هەر بۆیە لەم تێڕوانینەوە ئێمە تەواوی ئەو سەرچاوانەی باسی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی و عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ دەكەن، دەخەینە ڕوو.

### ژیاننامە:

مامۆستا نەجمەدین مەلا لە دوو كەشكۆڵی خۆیدا، سۆزی نیشتمان و نووسراوی پەرێشاندا شیعری ئەم شاعیرە دەهێنێت، لە نووسراوی پەرێشاندا تەنها پارچە هۆنراوەیەكی دەهێنێت و لە سۆزی نیشتمانیشدا دەڵێت:«عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ، خەڵكی سولێمانییە، لە نەوەی بابانە لە دەورەی حكومەتی عوسمانیدا قائیمقامی وڵاتی شارەزوورد گوڵعومەر[گوڵعەنبەر] بووە (٥٠) پەنجا [ساڵ] لەمەوپێش بووە، دوینایێ ئەشعاری هەیە و لە چاپ نەدراوە». (كەشكۆڵی نووسراوی پەرێشانی: ١٩٣٩، مامۆستا نەجمەدین مەلا، ٢٧ی ربیعولئاخری ساڵی ١٣٥٨ی هیجری، ڕێكەوتی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٣٩). مامۆستا قەرەداغیش لە كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردی، ب١، لاپەڕە (١١٩)دا دەڵێت: «ئەم شیعرانەش لە (نووسراوی پەرێشان) وەرگیراون. دەربارەی ئەم شاعیرە هیچم دەست نەكەوت. شاعیرێكی دیكەمان بەناوی (عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی) هەیە، نازانم لەگەڵ ئەم عەبدوڵڵا بەگەدا یەكێكن یان جیاوازن». مامۆستا قەرەداغی لە بەرگی سێیەمی كەشكۆڵەكەی، لاپەڕە (٢٦١)دا دەڵێت: «... ئەم پارچە لە پارچەكەی عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ دەچێت كە لە ل: ١١٩ و ١٢٠ی بەرگی یەكەمی كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردیدا بڵاوكراوەتەوە. لەمەشەوە دەردەكەوێت كە هەردوو عەبدوڵڵا یەكێكن. واتە ئەو شیعرانەی ئەوێش شیعری عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانین...». محەمەد عەلی سوڵتانیش دەڵێت: «عەبدوڵڵا بەگ كوڕی خوالێخۆشبوو سۆفی بەگی شەرەفبەیانیی سەرۆكی ناوبراوە (شەرەفبەیانی)یە، برای یووسف بەگی ناسراوە، كەسایەتییەكی دلێر و ئەدیب و ئەدەبدۆست و شاعیر بووە، زیاتر كەسێكی ئەهلی زانست بووە و قەدری زانست و زانیاری گرتووە و هاوڕێ و هاوعەسری مەلا عەبدولڕەحیمی تاوگۆزیی بووە (١٢٢١-١٣٠٠). (حدیقە سلطانی: ١٣٦٩، ب٢، ١٢٨) لە باسی یووسف بەگی برای ئەم شاعیرەدا دەڵێت: «یووسف بەگ كوڕی یەعقووب بەگ و برای عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی یەكەمە، باوكی و براكەشی لە هۆی شەرەفبەیانین... خۆی و براكەی (عەبدوڵڵا بەگ) ئارەزوویان لە ئەدەب و شیعر هەبووە...» (حدیقە سلطانی، ١٣٨٦: ب٤، ٢٠٩) جارێكی تر و لە كتێبێكی تریدا، سوڵتانی دەڵێت: «عەبدوڵڵا بەگی یەكەم، سێ كوڕی هەبووە بەناوەكانی: ڕۆستەم بەگ، عەزیز بەگی میرپەنج، عەبدوڵڵا بەگی دووەم».

عەبدوڵڵا بەگی یەكەم، كوڕی یەعقووب بەگی كوڕی حەسەن بەگی كوڕی یووسف بەگی كوڕی

ئیبراهیمی ئێناخە.». (جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل: ١٣٨١، چ٢ و ٣، ٢٩٢)

وەکو دەبینین لە باسی ژیاننامەی ئەم شاعیرەدا چی دەگوزەرێت و چی بەسەر ژیانی ئەم شاعیرەدا هێنراوە، مامۆستا سوڵتانی جارێک ئەم شاعیرە بە کوڕی یەعقووب بەگی شەرەفبەیانی دەزانێت و جارێکیش بە نەوەی سۆفی بەگ... مامۆستا قەرەداغیش جارێک نازانێت هەردوو عەبدوڵڵا بەگەکە یەک کەسن و جارێکیش بەپێی ئەو چەند شیعرەی بەردەستی کە بەڵگەیەکی ڕوونیان بە دەستەوە نەداوە، یەک کەسن، مامۆستا نەجمەدین مەلاش دەڵێت: عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ خەڵکی سولەیمانییە... بە گشتی ئەگەر عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی برای یووسف بەگی شەرەفبەیانی بێت، ئەوا بەپێی ئەو تۆرەمەی مامۆستا سوڵتانی بڵاوی کردووەتەوە، کوڕی یەعقووب بەگی کوڕی حەسەن بەگی کوڕی یووسف بەگی کوڕی ئیبراهیمی ئێناخە.

سەبارەت بەوەی ئایا عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی و عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ یەک کەسن، ئەوا دەبێ بەڵگەی باوەڕپێکراو بۆ ئەوە بهێنینەوە و بیسەلمێنین. ئەگەر وا دانێین کە ئەو دوو ناوە یەک کەسن، بۆچی جارێک عەبدوڵڵا بەگ برای یووسف بەگ بێت و کوڕی یەعقووب بەگی شەرەفبەیانی بێت؟ دووەم: بۆچی جارێکیش کوڕی ئیسماعیل بەگ بێت و جارێکی تریش کوڕی سۆفی بەگ بێت؟!

لەناو ئەو چەند پارچە شیعرەی بەردەستماندا تەنها لە یەک هۆنراوەدا نازناوی شاعیر (عەبدوڵڵا) ی تێدا هاتووە، ئەمەش نابێتە بەڵگەی ئەوەی ئەم شیعرە هی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی بێت، ئەوەش لەکاتێکدا ئەتوانین بە هی ئەو شاعیرەی بزانین کە لە سەرەوە نووسرابێت: عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی و لە کۆتاییی شیعرەکەشدا نووسرابێت (عەبدوڵڵا).

لێرەدا ئەتوانین ئەو سێ پارچە شیعرە بە هی عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی بزانین کە ناوی شاعیری لە سەر نووسراوە. واتە هۆنراوەکانی: میرزام نەمامێ، شیرین جام جەم، میرزام سوب سەحەر، دوان لەم هۆنراوانەش لە بەرگی دووەمی حەدیقەی سوڵتانی مامۆستا محەمەد عەلی سوڵتانیدا بڵاوبووتەوە و بە هی ئەوی لەقەڵەم داون. ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی مامۆستا قەرەداغی دەڵێت: لەسەر ئەم هۆنراوانە بە ڕوونی نووسراوە عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی.

سەبارەت بەوەی هەردوو ناوەکە یەکن یا نا، من ناتوانم بڵێم یەک کەسن، چونکە بەڵگەم لە بەردەستدا نییە، هەروەها لە کەشکۆڵی مەحموود پاشای جافدا ئەو شیعرەی کە بەناوی (گوڵاب شۆران کەرد)ە، لەسەری نووسراوە عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ و ناوی شەرەفبەیانی نەهێناوە، ئەم کەشکۆڵەش کەشکۆڵێکی باوەڕ پێکراوە و مەحموود پاشا لەو دەورەدا نووسیویەتی و خۆی سەرپەرشتی کردووە و جاف بووە و کەسایەتییەکی زۆر گەورەی جاف بووە، جێگەی گومانە کەسایەتییەکی وەکو مەحموود پاشای جاف شاعیرێکی وەکو عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی لە هۆزی جاف و بەوشێوەی کە باس دەکرێت ناسراو بووە؛ نەناسێت.

## هۆنراوەکان و بەراوردکردنی دەقەکان

## ١

### گوڵاب شۆران کەرد[1]

گوڵاب شۆران کەرد، گوڵاب شۆران کەرد
لەیل تەدارەک، گوڵاب شۆران کەرد
تافتەی قرمزی، ڕەنگ هیندی زەرد
پۆشا وە باڵای عەرعەری بێگەرد
کڵاوچە سورمەی کشمیری سەدڕەنگ
مەنقووش خامەی بەهزاد ئەوڕەنگ
قەراردا وە بان گۆی وەنەوشەی دێز
خاستەر لە شیرین نادیرەی پەروێز

شەدەی سێ زەرعی، مشکی دا نە دەور
چین وەستەن ئەو چین چوون زەنجیرەی هەور
وێنەی شاهێنان، چەم بە نیگاوە
گا مخەرامیا، گا پەس مدیاوە
یا چوون شوعلەی خۆی سەحەر نە تەمدا
یا چوون عەکس ماە نە مەوج خەمدا
ئازیز بەو ڕێزەی شەککەر بێزەوە
تەک دا بەو چەشمەی کەوسەر بێزەوە
دەس بەرد کڵاوچەی زەردۆز سیم بەرق
کێشا وە پەنجەی حەنایی نە فەرق
جەو دما کێشا پیراهەن نە فەرق
جێب کەرد ئەو مەغریب دامان کەرد ئەو شەرق
هانا هامسەران، دەروون سۆزشەن
ئارەزووی وە گەرم مەیل دۆسشەن
شەرارەی کوورەی تەوەن تاوشەن
مەیلش وە دیدەن، چەم سیاوشەن
هەوای سەیر کەردەن، زوڵف خاوشەن
جۆیای ئیشارەی دووری چاوشەن
ئارەزووی وە سەیر باڵای تووڵشەن
تەمەننای خاڵان سەرو لوولشەن
موشتاقیش وە دین لێو لاڵشەن
ئینتیزار پەی سەیر دوو بەی کاڵشەن
نەزارەی گەردەن بلوور بێزشەن
مونتەزیر وە نوتق شەککەر ڕێزشەن
مەعلووم تا مەحشەر هەر تۆ یادشەن
تۆ ویرد زەبان، تۆ ئەورادشەن

* ئەمەش دەقی وەرگێڕانەکەیە کە لە دوو سەرچاوەدا هاتووە و هەردوو سەرچاوەکەش بەراورد کراوە.

### خود نمایی کەرد(٢)

خود نمایی(٣) کەرد، خود نمایی کەرد
لەیلێ(٤) ئارەزووی خود نمایی کەرد
تافتەی قرمزی، تاقەی هیندی زەرد
پۆشا وە(٥) باڵای عەرعەری بێگەرد
خاڵی(٦) گۆنای وەک وەنەوشەی شەودێز
شیرینتەر لە خاڵ شیرین(٧) پەروێز
کڵاوچەی تورمەی کشمیری سەدڕەنگ
نموونەی خامەی بەهزادی ئەرژەنگ
شەدەی سێگەزی، مشکی دا لە دەور
چین لە بان(٨) چین، وەک زنجیرەی هەور
دەسماڵ(٩) کەتان، عەنکەبووتی ڕەنگ
ئەلوانیی خاس، نیگارخانەی فەڕەنگ(١٠)
کردی بە پەچە وەک مانگ لە هەورا
ڕیشەی دڵانی پێچا وە(١١) دەورا
هەڵساو بە هەڵسان مەحشەری هەڵسان
ڕۆی قیامەتی بە قامەت نواند(١٢)
بە وێنەی غەزاڵ چاو بە نیگاوە
نەختێ ئەڕۆیی و ئەگریا دەواوە(١٣)
تەکانی ئەدا و نە ئەبزووت لەجێ
تومەز ڕیشەی دڵ ئالاوەی هاپێ(١٤)
کڵاوچەی تورمەی کەمێ لار دانا
ڕەونەقێکی دا بە حوسن و ئانا(١٥)
چینی ئەگریجەی وەک شامی دەیجوور
پۆشایە سەر ڕووی نووری عەلا نوور(١٦)
من هاوارم کرد: هەی ڕۆ! مانگ گیرا
ئیستەیش ئەناڵم لە قەعری بیرا(١٧)

## ٢

### میرزام نەمامێ(١٨)

میرزام نەمامێ، میرزام نەمامێ
ئارۆ دیم وە چەم تووڵە نەمامێ(١٩)
باڵا چوون عەرعەر، سپی ئەندامێ
سینە سەدەف ڕێز، سافتەر نە جامێ
دەستەی زوڵف دێز، خەیاتەی بێگەرد
ئاوێزان کەردەن، چوون بەڕەزای هەرد
جەمینش چوون قورس خورشید مەدرۆشا
پەی دین یاران، عیشق(٢٠) مەفرۆشا
ئەبرۆ چوون هیلال، سانیع کەشیدە

قەترانی کەردەن نە دەور دیدە
خالانش وە هوون یاران ڕشتەوی
چوون شیرین وە ناز فەرهاد کوشتەوی
ئەریَ تەماشای ئەو نازار چین
کەردم، وەک(٢١) (سەنعان) هۆرگێلام نە(٢٢) دین
ئای بۆ تەبیبێ عیلاج کا دەردم!
جە داوای هێجران، کەی(٢٣) وای من مەردم
سا تەبیب ئاسا بدەر ئامانم(٢٤)
مەڵهەمێ وەردەر(٢٥) نە ڕووی زامانم

## ٣

### شیرین جام جەم(٢٦)

شیرین جام جەم، شیرین جام جەم
توخودا وەس بدەر جە لای جام جەم
وە بالای نەمام بێ عەیبت قەسەم!
شەوقت نە شوعلەی خورشید نیەن کەم
چوون خورشید نە بورج چەرخ چوارین(٢٧)
شەوقت دا نە ڕووی سەما و سەرزەمین
هەر وەقت جەمینت مەدەری جە لا
مەویت وە باعیس هوون کەلوەلا
وە نیم نیگای ناز، ئیشارەی عەینەین
دنیات(٢٨) کەرد وە ڕۆی کەلوەلای حسەین(٢٩)
موژەت چوون پەیکان موهەییای شەستەن
کەمەرت پەی هوون عاشقان بەستەن
وەی زوڵف سیای سەهمناکەوە
چوون ماران وە دۆش شای زوحاکەوە
کێت خەڵتان نەکەرد وە ڕووی خاکەوە؟!
جەرگ کێت نەدا وە ناواکەوە؟
وەی شێوە و تەرتیب نازەنینەوە
وەی کەچی گۆشەی عەرەقچینەوە
بەو وێڵ و ئاداب(٣٠) بەو تەمکینەوە
بەهرامت وێڵ کەرد وە ڕای چینەوە
شەرارەی عیشقت فیتنە وە(٣١) پا کەرد
ناحەق یووسفت(٣٢) دووستاخ چا کەرد
وە سەیف ئەبرۆت چوون هیلال نەو
شینت وەست ئەو تاق جایر سەر(٣٣) خوسرەو
شێرۆت کەرد وە پەند گشت شەهەنشایێ
ڕیسواییش ماچان جە گردین لایێ
قەیست کەرد وە شێت دێر و(٣٤) دێوانە
بی وە سەرزەنش خوێش و بێگانە
دیدەت وە سورمەی سوبحانی ڕشتەن(٣٥)
نەوفەڵت وە زەهر هەلاهیل کوشتەن(٣٦)
چوون تەرسا بەچەی قەوم نەسرانی
زەرەر دایە دین(٣٧) شێخ سەنعانی
چەند شێخ ئیرشاد، ساحێب جەزبە و حاڵ
لە داخی تۆوە گشت بین وە عەبداڵ(٣٨)
مەدحت جە مەجلێس شاهان مەکەردەن
شاهان گشت نە(٣٩) تەخت شاهی ویەردەن
فیدای شێوەت بام، شۆخ شیرین خاڵ
شیرینیت شۆرەت(٤٠) شیرین کەرد بەتاڵ
شەوقت نە شوعلەی(٤١) خورشید کەم نیەن
لازم وە جە لای جام جەم نیەن
ڕشتەی خاڵقان(٤٢) نە کارخانەی وێش
کافییەن قوربان، جە لا مەدەر پێش
(عەبدوڵڵا) چوون قەیس دەور جەفاکێش
گلاراوشەن چەنی ئێش نێش(٤٣)

## ٤

### میرزام سوب سەحەر(٤٤)

میرزام سوب سەحەر، میرزام سوب سەحەر
ئارۆ قیبلەم دیم وەقت سوب سەحەر
وە زات قەییووم فەرد بان سەر
سەد شێوە دارۆ جە شیرین خاستەر
چەند دێبای ڕەنگین قرمزی و ئەخزەر
سۆسەنی و بەنەفش، ئەسوەدی و ئەحمەر
یەک یەک وە ئەنداز پۆشاوی نەوەر
بی وە زەمزەمەی ڕۆی (یوم المحشر)
دەست بەرد بەرقەی شەرم هەوادا نەسەر
ئیزهار کەرد شوعلەی خورشید خاوەر
دەستەی کلافان پەروەردەی عەنبەر

بۆ مەدا نە تەرح شەوبۆی وەرکەمەر
گێسوو چوون ماران (بول!) وەردەی هەژدەر
پێچیان وە توول باڵای نەی شەکەر
سوپای ئەگریجەی سان دا بەرابەر
وێنەی دوو لەشکەر ڕەزم جادووگەر
ئەبرۆی خەمیدەن، چوون سەیف (حەیدەر)
پەی قەتڵ یەهوود غەزای ڕۆی خەیبەر
تەخت پێشانیش چوون شەمس و قەمەر
شەماڵەی شەوقی دنیای گرت نەوەر
دەهان غونچە گوڵ، شگوفتەی سەحەر
کەیلەن نە دانەی یاقووت ئەحمەر
موژەی چوون پەیکان نە دڵ کەرد گوزەر
عەزابم مەدۆ چوون نێش نەشتەر
فیدای شێوەت بام، لەیل نازپەروەر
نەمکەی وە عەوداڵ وێڵ و دەربەدەر
یاخۆ چوون فەرهاد ئەبڵەی پەڕ هونەر
چەنی و دێوانە، سەودای عیشق نەسەر
نە عیشق شیرین ڕەعنای دڵ پەیکەر
مناڵا وە نێش زامان خەتەر
(عەبدوڵڵا) پەی دین دیدار دڵبەر
کەوتەن ئەو دەریای گێج (ئەسکەندەر)

## ٥
## **لەیل مەیل پەی...**(٤٥)

لەیل مەیل پەی سەیر سەر سەراوان کەرد
ئارەزووی دیدەن سۆسەن گوڵان کەرد
چین ئەگریجان، سەرئاوێزش کەرد
پشتان وە باڵای عەرعەر بێزش کەرد
عەینەین وێنەی چەرخ باز شکاری
یامخۆ وێنەی چەم ئاهووی تەتاری
پەڕ کەرد نە سورمە، بە میل ئەحمەڕ
مەبێزا دیدەی ئاهووان بەڕ
کۆرپەی حەیتاران، پەروەردەی عەمبەر
قەراردا نە پای لفکەی شەددەی زەڕ
ئاوێزانش کەرد دەستە بە دەستە
سەرازێر وە بان ئەبرۆی پەیوەستە
جام جەمینش گوڵاو شۆران کەرد
[چوون مای چواردەی سەیر ئێواران کەرد!]
لەبان بە وێنەی لەعل بەدەخشان
بە خاڵ فەیرووز کەردش زەڕئەفشان
خاڵێ هەم نە پای گەردەن دا قەرار
فەتوا دا وە قەتڵ بەندەی هێجران بار
ئەمجار فەرمان دا زوڵفان ئەشەد بۆ
ئاوەردەن [ڕەخوەت!] زەڕتان زەڕپۆ
موختەسەر ئەو شۆخ نازار نگین
تەرتیب وێش دا جە سەر تا پایین
ئەتڵەس و مەخمەڵ، خارا و خەتایی
تافتەی هیندی کار، لۆنگ بەغدایی
نیم تەنەی تورمەی سورخ گوڵناری
حاشیە، سورمە، مرواری کاری
پۆشا وە بەدەن، نادیرەی دەوران
شیوەن وست نە دڵ، جەرگەی غەمباران
جەو دما فەرما شۆخ لەیل دەستوور
ئەسباب تەڵا، کڵاوچەی سموور
یەکایەک تەمام ئاوەردەن پەرێش
باهووبەند لاڵ کەمبەرە دڵکێش
ئەوەڵ قەراردا ئەو نە فەوق فەرق
کڵاوچەی سمۆر نە ئەشرەفیی غەرق
بەرسەرەی تەڵای جەواهێر نیشان
نەپای کەللەی سەر، کەردش پەرێشان
گۆشوارەی گەوهەر کەرد نە دوو گۆشش
فامداران پەرێش بەرمەشی هۆشش
گلوبەند دوڕڕ بەستش نەگەردەن
سەد چوون ئەرەستۆ [موەرد بێ مردن!]
کەردش نە گەردەن تەزوێی مرواری
ئاوێزان جە بەین سێب خوانساری
قۆڵ وانان، قۆڵ زوبەرجەد دانە
ساختەی ئوستادان دەور زەمانە
بە سەد نازەوە کێشا نە باڵش

شوعلە وست، ئەو بان دوو لیمۆی کاڵش
هەر کەس کە بدیاش ئەو قۆڵوانە و قۆڵ
مەبی بە مەجنوون لۆنگ خەم نەکۆڵ
باز هەم فەرماندا نیگار دڵبەر
ئاوەردەن قەدبەند کەمەرەی کەمەر
کەمەرەی ئەڵماس بەستش نە کەمەر
مەدرەوشا جە تەرح، شەو شوعلەی قەمەر
بەعد فەرما: باران سێ ئەنگوشتەری
فەیرۆزە و گەوهەر، لاڵ ئەحمەری
کەردش نە ئەنگوشت شمشادی بێگەرد
شەوق مەدا وە بان پشت پەنجەی زەرد
جەو دما دەسبەند بازنان باڵ
کەردش نە مەچەک شۆخ نەونەهاڵ
هەرکەس کە بدیا ئەو بازوانە
شێت و شەیدا بی، دەیری دێوانە
چارشێو هیندی، کار ئەستەمووڵ
کێشا وە باڵای بێعەیب مەفتووڵ
بەوتەور و تەرکیب دیدەی ڕەندەوە
بەو سیا زوڵفان چوون کەمەندەوە
بەو باڵای نەی عەرعەر بەندەوە
بەو چەم مەرج جە چەم جەیران سەندەوە
بەو باهووبەندان لاڵ و پاڵەوە
بەو عەتر وەش بۆی لیمۆی کاڵەوە
بەو سیاخاڵان سەر بەلوولەوە
نە ڕووی سەفحەی گوڵ بە مەلوولەوە
بەو شێوەی شیرین کەس نەدارەوە
بەوتەور و تەرکیب لەنجە و لارەوە
نە باڵای تەلا سەوڵ سفید گوڵ
(چوون ئافتاب نە بورج شەرح دوورمەنزڵ!)
ئاما وە پایین ڕوو وە سەحراوە
خاوخاو وە ڕووی ناز، لوا وە ڕاوە
ئەگریجەی تەیار سۆسەنی خاڵان
تەشریف بەرد وە ناو جەرگەی گوڵاڵان
گوڵاڵان دیشان ئاما لەیل وە ناز
سەر دان نە سوجدەی حەی بێ نیاز

جە شەوق ئامان لەیل نازپەروەر
مەست و مەدهۆش بین جە پا تا وە سەر
هەڵاڵە مەبی قوربان گۆناش
ڕێحان سەرگەردان، زوڵفان تاتاش
نەرگس وێش مەکەرد وە فیدای دوو دیدەش
نیلۆفەر باڵای خودا ڕەژیدەش
گوڵغونچە حەیران لەعل لەبانش
داغداران بە دین دورج دەهانش
شەقایق سادار زنج بلووریش
وەنەوشە داغدار خاڵ فەغفووریش
ئەرغەوان سەرگەرد قەدەمگای ڕاهش
یەک یەک حەسرەتمەند خەستەی سیماهش
وەلحاسڵ ئەو ڕەند ئەگریجەی تەیار
مەکەرد ئاهەنگ تا وادەی ئێوار
ئێوارە وە شاد خاڵ فلفڵ دانە
موراجەعەت کەرد پەی دەوڵەت خانە
شی نە تۆی جامرێز لوا وە پێوار
وێنەی خۆرەزەرد نە وادەی ئێوار
بە تۆم سپەردەن کارساز کاران
لەیلێ لەیل دەستوور شای دیدە قەتران
جە حەرف ڕەقیب، نە قەوڵ ئەغیار
جە دیدەی بەدان شووم شەرمەسار
نیگەهداریش کەی بە کەریمی وێت
بە زات بێ عەیب زولجەلالی وێت

## ٦

## قیبلەم مەیل سەردی(٤٦)

قیبلەم مەیل سەردی، قیبلەم مەیل سەردی
توخودا یە پەی چێش بەیتەور مەیل سەردی؟
ئەرێ سەرکردەی ڕەم تەتاران!
ئەرێ هەی لەیلێ، شای چەم خوماران!
ئەرێ هەی سەرئێڵ سوپای نازداران!
ڕەوێڵەی ڕەمکێش، جەرگەی تەتاران
ئەرێ هەی لەیلێ نازار باوان!
ئەرێ هەی سەرخێڵ، گشت چەم سیاوان!

ئەرێ هەی شیرین، شەهزادەی ئێران!
موژەی چەم نە تەرح سەرنێش خاران
ئەرێ سنەوبەر کشمیری وەتەن!
ئەرێ قەمەرباز، مەحبووبەی خوتەن!
ئەرێ هەی نەوتووڵ ساوای چەمەندان!
ئەرێ هەی باشقەی سیاکەمەندان!
سەوگەندت وە زوڵف سیای تاتارت!
بەو دیدەی بێ عەیب، بێ مەی خومارت!
بە ئەو ئەگریجان ئالای ڕێحانیت!
بە شەوق پرشەی تەخت پێشانیت!
بە هیلالەی ماە برۆی کەمەندت!
بە دیدەی مەخموور بێ عەیب و ڕەندت!
بە چەم پەرچەم موژەی چەمیدەت!
بە قورس قەمەر خودا ڕەژیدەت!
بە دوو پەڕەی گوڵ لەبان لاڵت!
بە زەردی زنجت، بە لیمۆی کاڵت!
بە نەرمی سینەی سفیدی سافت!
بە حەڵقەی گێسووت، بە حوجرەی نافت!
قەسەم سەختم بە شۆخی باڵات!
بە دانەی زومەڕ خاڵان ئاڵات!
ڕاست واچە ئازیز تەقسیرم چێشەن؟
جە چی ڕەنجایی خاترت ڕێشەن؟
من هیچ تەقسیرێ..............
ئەڵبەت بەدکاران بەدکاریم کەردەن
پەوکە ئازیزیچ وەی تەور مەیل سەردەن
یا حەرف ڕەقیب قەوڵ ئەغیارەن
یا بەدگۆیی خەڵق ڕووی ڕۆزگارەن
یا بێوەفایی عادەت لەیلەن
مینای خاترش وە بێگەرد کەیلەن
یا گۆش دان بە دەنگ حەرف بەدکاران
یا کەوتەن نە شوێن واتەی ئەغیاران
یا هەوای شکار مەیل تۆش کەردەن
قەیس سیابەخت فەرامۆش کەردەن
توخودا تەقسیر لێم بیەن سادر؟
قەسەمت مەدەم وە زات قادر
زوڵفت تەنافەن، باڵات سێدارە
وە ئەمر دیدەت دۆم نە قەنارە
حەڵقە حەڵقەی زوڵفت مینا کەمەندان
وزەم نەگەردەن، شای دیدە ڕەندان!
ئاوێزانم کەر وە شێدارەدا
بەو سەوڵ باڵای عەرعەروارەدا
وە نێش موژەی سەرمەودای دیدەت
وە خەم ئەبرۆی کەمان کەشیدەت
دود خەم ئەبرۆت کێشیان بە تاو
موژەت چوون خەدەنگ تیژ تازەساو
یە دار، یە تەناف، یە تیر، یە کەمان
یە بەندەی حازر بە دیدە و بە گیان
وە ئیشارەی تیر شۆخ دیدەمەست
وە تاب کەمان حەڵقە حەڵقەی شەست
تەنافم بدەر، تیروارانم کەر
چوون تۆم ڕەنجنان نازار دڵبەر
من کە شۆخێ چوون تۆم ڕەنجابۆ
مەبۆ تا دەوران دنیا، دنیا بۆ
تەناف نەگەردەن ....... بۆ
جەرگم وە نەشتەر دڵ [دوجاران!] بۆ

## پەراوێزەکان

١ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب٣، چ١، دار الحرية للطباعة- بەغدا- ١٩٨٦، ل٢٥٩. هەروەها لە کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف، ل١٢٣ دا دیسانەوە ئەم شیعرە هاتووە، لەسەری نووسراوە: (عەبدوڵڵا بەگ ئیسماعیل بەگ). مامۆستا قەرەداغی لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا دەڵێت: «ئەم پارچەش لە دەسخەتی محەمەد مرادی جوانرۆیی وەرگیراوە...

ئەم پارچە لە پارچەکەی عەبدوڵڵا بەگی ئیسماعیل بەگ دەچێت کە لە ل ١١٩ و ١٢٠ی بەرگی یەکەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیدا بڵاوکراوەتەوە. لەمەشەوە دەردەکەوێت کە هەردوو عەبدوڵڵا یەکێکن. واتە ئەو شیعرانەی ئەوێش شیعری عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانین. دوای بەراورد دەردەکەوێت ئەم دوو پارچە گەلێک جیاوازییان لە نێواندا هەیە و لەوێ شێوەی هەورامییەکەشی گەلێک دەستکاریی کراوە، بۆیە لێرەدا ئەم پارچە بەتەواویی وەک خۆی بڵاودەکەمەوە.

هەروەها لە کەشکۆڵێکی تریدا کە لە لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغییە و بەڕێزیان نوسخەیەکی وێنەگیراوی فۆتۆییان پێشکەش کردووم، لەو نوسخەیەدا لە سەرەتای ئەم پارچە شیعرەوە نووسراوە (عەبدوڵڵا بەگی شەرەفبەیانی) و دەستنووسەکەش لە ساڵی ١٣٤١کۆچیدادا نووسراوەتەوە، نووسەرەوەی دەستنووس لە کۆتایی هەر شیعرێکدا ساڵی نووسینەوەی شیعرەکەی نووسیوە.

٢ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب١، چ١، چاپخانەی الحوادث- بەغدا- ١٩٨٠، ل١١٩. هەروەها لە کێتبی سروود بادییەی مامۆستا مەلا محێددین ساڵحیی لە لاپەڕە (٢٧٩)دا هاتووە، هەندێ جیاوازی لە نێوان دەقەکاندا هەیە و لێرەدا جیاوازییەکان بەراورد کراون.

٣ مامۆستا قەرەداغی نووسیویەتی (نومایی)، هەڵەیە و دەبێ (نمایی) بێت.

٤ لەلای مامۆستا قەرەداغی بە (لەیل) هاتووە.

٥ مامۆستا نووسیویەتی (پۆشای بە).

٦ خاڵی.

٧ شیرین.

٨ بان.

٩ دەسماڵی.

١٠ ئەلوانی خاسەی کارخانەی فەڕەنگ.

١١ وە.

١٢ ئەم بەیتە لەلای مامۆستا قەرەداغی هەیە و لە نوسخەی سروود بادییەدا نەهاتووە، جگە لەوەش سەرەوای نیوە بەیتەکەش لەنگە.

١٣ بە بەیتی ژمارە (٩) هاتووە. ئەم نیوەبەیتە لەلای مامۆستا قەرەداغی بەم شێوە هاتووە: (نەختێ ئەڕۆیی و ئەگەڕایەوە).

١٤ بە بەیتی ژمارە (١٠) هاتووە. ئەم بەیتە لەلای مامۆستا قەرەداغی بەم شێوە هاتووە: (تەکانی ئەدا و نەبزووت لەجێی... تومەز ڕیشەی دڵ ئالایەوە پێی).

١٥ بە بەیتی ژمارە (١١) هاتووە. نیوەبەیتی یەکەمی ئەم بەیتە بەم شێوە هاتووە: (کڵاوچەی زەردی کەمێ لار دانا).

١٦ ئەم بەیتە لە نوسخەی مامۆستا قەرەداغیدا هەیە و لە سروود بادییەدا نەهاتووە.

١٧ هەروەها ئەم بەیتەیش لە نوسخەی مامۆستا قەرەداغیدا هەیە و لە سروود بادییەدا نەهاتووە.

١٨ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب١، چ١، ل ١٢١. مامۆستا قەرەداغی دەڵێت: ئەم سێ پارچە شیعرەم «واتە: میرزام نەمامی، شیرین جام جەم، میرزام سوب سەحەر» لە کەشکۆڵی مەلا عەزیزی ڕێشاوی وەرگرتووە و بە ئاشکرا لەسەری نووسراوە: (عەبدوڵڵا بەگی شەرەف بەیانی). ئەم هۆنراوە لە بەرگی دووەمی حەدیقەی سوڵتانی مامۆستا محەمەد عەلی سوڵتانیدا بڵاوبووەتەوە، ل١٢٩، هەندێ جیاوازی لە نێوان هەردوو دەقەکەدا هەبوو، لێرەدا بەراوردمان کردووە.

١٩ ئاوەردیم وە چەم، نەوبەر نەمامێ.

٢٠ عیشوە.

٢١ چوون.

٢٢ جە.

٢٣ ئەی.

٢٤ بکەر دەرمانم.

٢٥ بدەر.

٢٦ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب١، چ١، ل١١٩. ئەم هۆنراوە لە بەرگی دووەمی حەدیقەی سوڵتانی مامۆستا محەمەد عەلی سوڵتانیدا بڵاوبووتەوە، ل١٢٩، هەندێ جیاوازی لە نێوان هەردوو دەقەکەدا هەبوو، لێرەدا بەراوردمان کردووە.

٢٧ چارەمین.

٢٨ دنیا.

٢٩ حوسەین.

٣٠ ئەدا و.

٣١ بەر.

٣٢ بەو حەقت.

٣٣ جامرێز.

٣٤ دێری.

٣٥ ڕەشتی.

٣٦ کوشتی.

٣٧ دای وە دین.

٣٨ ئەبداڵ.

٣٩ جە.

٤٠ شیرینی تۆ شۆڕ.

٤١ ڕوتبەت نە شوعلە و.

٤٢ خاڵقەن.

٤٣ ئێش و نێش.

٤٤ کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی الحوادث- بەغدا- ١٩٨٠، لاپەڕە (١٢٤).

٤٥ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب٣، چ١، ل٢٦٢. مامۆستا قەرەداغی لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا دەڵێت: «ئەم پارچە شیعرە لە دەسخەتی جوانڕۆیی وەرگیراوە و، نازانم شیعری کێیە، چونکە هیچی لەسەر نەنووسراوە، ئەوەندە هەیە لە دوای پارچەکەی عەبدوڵڵا بەگی شەرەف بەیانییەوەیە و، ڕەنگە ئەمیش شیعری ئەوبێ، ئەگەر ئەوە بچێتە سەر ئەوا ئەم پارچەی تریش کە لە دوای ئەمەوە ئەینووسین هەر هی ئەوە، چونکە لەسەر ئەمەی دوایی نووسراوە (ولە)- واتە هەر هی ئەوە-.

ئەم پارچە شیعرە بابەتێکی ناوی خشڵ و جلوبەرگ و شت و مەکی ئافرەتانە و، لە بواری خۆیدا سوودی باشی لێوەردەگیرێت، بەڵام بەداخەوە ئەمیش تەڕبووە و زۆری کوژراوەتەوە و دوایی بە قەڵەمێکی دیکە بەسەریدا چوونەتەوە و گومانیان لە هەندێ شوێنیدا دروست کردووە و، بە گەلێ ئەرک و ماندووبوون ئەم ئەندازەیەم ڕاست کردەوە.

٤٦ محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب٣، چ١، ل٢٦٨.

**سەرچاوەکان**


١- حەدیقەی سلطانی: محمد علی سلطانی- جلد دوم، چاپ اول، انتشارات صلاح الدین ایوبی- ارومیە، بهار ١٣٦٩.

٢- جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان «ایلات و طوایفات کرمانشاهان»: محمد علی سلطانی، جلد دوم- جلد سوم، چاپ دوم، نشر سها، تهران- ١٣٨١.

٣- محەمەد عەلی قەرەداغ: دیوانی مەولەوی «مەلا عەبدوڕەحیمی تاوگۆزی»، ب١، چ١، ٢٠١٥.

٤- سرود بادیە- در احوال وآپار شعرای کرد و لک و **لُر**- تألیف: استاد مەلا محی الدین صالحی- چاپخانەی رستمخانی، مرکز پخش: سنندج- ١٣٨٠.

٥- محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب١، چ١، چاپخانەی الحوادث- بەغدا- ١٩٨٠.

٦- محەمەد عەلی قەرەداغی: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، ب٣، چ١، دار الحریة للطباعة- بەغدا- ١٩٨٦.

٧- کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف: د. حەسەن جاف، ب١، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، بەیرووت- ٢٠١٤.

٨- کەشکۆڵی سۆزی نیشتمانی مامۆستا نەجمەدین مەلا، ٢١ی ئەیلوولی ١٩٤٢ی میلادی.

٩- کەشکۆڵی نووسراوی پەرێشانی مامۆستا نەجمەدین مەلا، ٢٧ی ربیعولئاخری ساڵی ١٣٥٨ی هیجری، ڕێکەوتی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٣٩.

١٠- کەشکۆڵێکی لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لە ساڵی ١٣٤١ی کۆچیدا نووسراوەتەوە

# بڵاوكراوەی نوێی گۆڤاری خاڵ

